جۆرج ئۆروێل

# ١٩٨٤

وەرگێڕانی

حەکیم کاکەوەیس





# جۆرج ئۆروێل

# ١٩٨٤

## حەکیم کاکەوەیس

لە سویدییەوە کردوویەتی بە کوردی



ناوی کتێب: ١٩٨٤
نووسینی: جۆرج ئۆروێل
وەرگێڕانی لە سویدییەوە: حەکیم کاکەوەیس
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٣٤٧
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: دڵشاد مستەفا
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٥
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٧٦)ی ساڵی ٢٠٠٥ی دراوەتێ

# بەشی یەکەم

١

ڕۆژێکی خۆرەتاوی ساردوسڕی مانگی نیسان بوو. کاتژمێرەکان زەنگی سێزدەیان لێ دەدا. وینستۆن سمیت، کە سەرما چەنەگەی پێ بردبووە ناو یەخەکەیەوە و ملی پێ کرژ کردبۆوە، بە پەلە بە دەروازە شووشەبەندەکەی (ئەپارتمانی سەرکەوتن)[1] دا وەژوور کەوت و خێراییەکەی بایی ئەوە نەبوو تەپوتۆزی دەرێ لەگەڵ خۆیدا وەژوور نەخات.

هۆڵەکە، بۆنی کەلەمی کوڵاو و ڕایەخەکۆنی لێ دەهات. لە لایەکەوە، پۆستەرێکی ڕەنگاوڕەنگ، کە بە گوێرەی دیوارەکە زۆر گەورە بوو، هەڵواسرابوو. نیگاری زەبەلاحی دێوئاسای پیاوێک بوو. پانایی پۆستەرەکە مەترێک پتر دەبوو و تەمەنی پیاوەکە ٤٥ ساڵ دەبوو. چرچ و لۆچی ڕوخساری و سمێڵە ڕەشە زلەکەی، سیمایان پیاوانە دەردەخست. وینستۆن، بەرەو قالدرمەکان چوو. پێی نەدەویست ئاسانسۆرەکە[2] تاقی کاتەوە چونکە ئەوپەڕی جاروبارێ دەگەڕا. ئەوحەفتەیەش کە (حەفتەی ڕق) بوو، بە ڕۆژەوە کارەبا بۆ پاشەکەوتکردن دەبڕا. شوقەکەی وینستۆنیش لە نهۆمی حەوتەمدا بوو. پیاوێکی سیی و نۆ ساڵەی وەک ئەمیش کە برینێکی پیسکردووی بە قولەقاپی پێی ڕاستەوە بوو، دەبوو بە کاوەخۆ بەسەرکەوێ و زوو زوو پشووی بۆ بدات. لە هەر نهۆمێکدا کە دەیگەیشتێ، وێنە زلەکەی لە بەرانبەر دەرگای ئاسانسۆرەکەدا دەدی کە تەماشای بنیادەمی دەکرد. وێنەکە، لەو جۆرە وێنانە بوو کە وێنەگرەکەی هێند لە پیشەکەیدا مەعلان بووە، بۆ هەرلا دەچوویت پێت وابوو لە تۆ ڕادەمێنێت. لە خوارەوەی نوسرابوو: ڕێبەری گەورە[3] سەرنجت دەدا.

لە ناو شوقەکەوە دەنگێکی گڕ دەهات و ڕادەی بەرهەمهێنانی ئاسنی ڕادەگەیاند. دەنگەکە، لە میتالێکی درێژۆکەوە دەهات کە بە ئاوێنەی تەڵخ دەچوو و (تەلەسکرین)[4]یان پێ دەگوت. ئەمەش، بە دیوارەکەی لای ڕاستەوە هەڵواسرابوو. وینستۆن، دوگمەیەکی بادا و کزی کرد، بەڵام هێشتا هەر دەبیسترا. ئەو ئامێرە، کز دەکرا

1- Victori Mousion

(٢) Lift (مصعد)

(٣) ڕێبەری گەورە: Big brother

(4) Telescreen



بەڵام قەت کوژانەوەی بۆ نەبوو. بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشت. جەستەی، گچکەلە و لاواز بوو. ئەو بەدلە شینە حیزبییەی کە پۆشیبووی، کەمێ جەستە لاوازەکەی دەشاردەوە. قژی ماشوبرنج و پێستی ڕوخساری سورخن بوو و بە هۆی سەرماوسۆڵەی زستانی تازە بەسەرچوو و سابوون و گوێزانەوە زبر ببوو.

لە پەنجەرە داخراوەکەوە، دەرەوە سارد خۆی دەنواند. با، کوتە قاقەز و تەپوتۆزی سەر شەقامەکانی لوول دەدان. هەرچەندە خۆرەتاو بوو و عاسمان ساف و شین بوو بەڵام هەموو شتێ بێ ڕەنگ دیار بوو. هەر ئەو وێنانە ڕەنگاوڕەنگ بوون کە لە گشت جێیەک هەڵواسرابوون. وێنەی پیاوە سمێڵ ڕەشەکە، لە هەموو گۆشەیەکەوە سەرنجی خەڵکی دەدا. یەکێ لەو وێنانە بە ئەپارتمانەکەی ئەوبەرەوە – ڕێک بەرانبەر ئەم هەڵواسرابوو: "ڕێبەری گەورە سەرنجت دەدا". چاوە ڕەشەکانیشی ڕێک لە چاوی وینستۆن بڕیبوون. کەمێ لە خوارترەوە، وێنەیەکی لێواردڕاوی دی کە بە دەم بایەکەوە حەلوەلای بوو و (سۆسینگ)[5]ی لێ نووسرابوو، جارێ دەردەکەوت و جارێ بزر دەبوو. لە دوورەوە، کۆپتەرێک دیار بوو کە تا عاستی سەربانەکان نەویی ببۆوە و تاو نا تاوێ وەک (چوکڵ بەقونێ) لە جێی خۆیدا دەخولایەوە. پاشان بە خێرایی وەرچەرخا و دوور کەوتەوە. مەفرەزەی گەڕۆکی پۆلیس بوو و لە پەنجەرەوە تەماشای ناو ماڵی خەڵکیان دەکرد. پۆلیسی گەڕۆک هێندە بە هێند نەدەگیرا، گرنگ پۆلیسی خەیاڵ[6] بوو کە حسێبی بۆ بکرێ. تەلەسکرینەکە، لە پشت وینستۆنەوە هەر بلەمەبلەمی دەهات. باسی بەرهەمهێنان و پەرەپێدانی پارچە ئاسنی، لە ماوەی پلانی سێ ساڵەی داهاتوودا دەکرد. تەلەسکرینەکە، دووسەرە کاری دەکرد. هەم دەنگی هەبوو هەم دەنگیشی وەردەگرت. بچووکترین دەنگی وینستۆنی دەقۆستەوە ئەگەر چپەیەکیش با. هەر ئەوە نەبوو گوێ لە وینستۆن بگیرێ و ببڕێتەوە، بەڵکو دەشبیندرا. دیارە کەس نەیدەزانی چ ساتێ سەیر دەکرێ. نەیدەزانی چەند جار و بە پێی چ سستەمێ پۆلیسی خەیاڵ کەمیرای لێ دەخەنە کار و تەماشای دەکەن. دەبوو پیاو هەر لەخۆڕا هەڵیبینێ. نەدەکرا هەموو دەمێ چاودێری هەموو کەسێ بکەن، بەڵام کەی بیانویستبا سەیری هەرکەسێ بکەن، پێیان دەکرا و دەیانتوانی سەرنجی هەموو تایبەتکارییەکی خەڵکی بدەن. دەبوو وا بژیی. دەبوو هەموو دەمێ بەتەما بیت گوێت لێ بگیرێ و لە ناو تاریکیشدا سەرنجت بدرێت.

٥ – سۆسیالیزمی ئینگلیزی

(6) Thought police

وینستۆن هەر بە پێوە بوو و پشتی لە تەلەسکرینەکە کردبوو. هەرچەندە دەیزانی کە لە پشتیشەوە خەڵک دەناسنەوە بەڵام پێی چاک بوو وا بوەستێ. کیلۆمەترێ لەولاوە ئەپارتمانی (وەزارەتی ڕاستی) بڵند ببۆوە. بیناکە، گەورە و سپییەکی درەوشەدار بوو و لە ناو دیمەنی بەر خۆرەتاوی شاردا جوان دیار بوو. لە بەر خۆیەوە گوتی: ئەمە لەندەنە. پایتەختی فرۆکەخانەی ژمارە یەک و سێیەم شاری گەورەی ئۆقیانووسیایە. هەوڵی دەدا بیرەوەری منداڵی بەسەر بکاتەوە تا بزانێ لەندەن هەر وا بووە یا نە. دەبێ خانووبەرەی لەم چەشنەی سەدەی نۆزدە بووبن کە لە گەلێ جێوە ڕماون و پەنجەرەیان بە موقەبا داپۆشراوە و چینکۆیان بە سەرەوەیە و دیواری باخچەیان ڕماون؟. جێی بۆردمانی خۆڵاوی، کە لێرە و لەوێی بن خشتەکانەوە پنچک ڕوابوون؟. وێرانە و کەلاوەی گەورەتری بۆمباران، کە لەملا و ئەولایانەوە کەپرۆکەی باریکی وەک کولانە هەڵچندراون؟. فایدەی نەبوو. وەبیری نەدەهاتەوە. جگە لە ڕیزێ تابلۆی زیندووی ڕوون کە ئەوانەش پشتەوەیان دیار نەبوو هیچی تری وەبیر نەهاتەوە.

وەزارەتی ڕاستی کە بە (گوتەی نوێ)[٧]، (وەزاڕاست)[٨]ی پێ دەگوترا، لە ناو دیمەنەکاندا سەرنجیان ڕادەکێشا. بینایەکی هەرەمیی سپی بوو و تا سێ سەد مەتر، نهۆم لە سەر نهۆم بەرز ببۆوە. لەو جێیەوە کە وینستۆن لێی ڕاوێستابوو، بە جوانی هەر سێ دروشمەکەی حیزب، کە بە خەتێکی جوان، بە قەد بینا سپیەکەوە نووسرابوون دەخوێندرانەوە:

شەڕ ئاشتییە

کۆیلایەتی ئازادییە

نەزانیی هێزە

دەگوترا کە یەکەم نهۆمی وەزارەتی ڕاستی سێ هەزار ژووری تێدان. بنخانەکەشی هەر وا. تەنها سێ بینای لەو چەشنە و بەو گەورەییە، لێرە و لەوێی لەندەن هەبوون. ئەو سێیانە، بە جۆرێ بە سەر بیناکانی دەوری خۆیاندا بڵند ببوونەوە، هەرسێکیان لە ئەپارتمانی سەرکەوتنەوە دیار بوون. جێی چوار وەزارەت بوون کە هەموو کاروبارێکی دەوڵەت لەوانەوە جێ بەجێ دەکرا: (وەزاڕاستی)، کاروباری هەواڵ و سەرگەرمی و پەروەردە و هونەرە جوانەکانی بەڕێوە دەبرد. (وەزارەتی ڕێکەوتن)، خەریکی مەسەلەی

(7) New speek

(8) Mini true



جەنگ بوو. (وەزارەتی ئەوین)، یاساو ڕێکوپێکی لە سەر بوو. (وەزارەتی فراوانی)ش کاروباری ئابووری ڕادەپەڕاند. ناوی ئەو وەزارەتانە لە گوتەی نوێدا وا بوون: "وەزاڕاستی"، "وەزاڕێکە"[٩]، "وەزائەوین"[١٠] و "وەزافرا"[١١].

لە ڕاستیدا، وەزارەتی ئەوین کە کاروباری ڕێکوپێکی لە ئەستۆدا بوو، ترسناکترین وەزارەت بوو. پەنجەرەی پێوە نەبوو. قەت وینستۆن ڕێی نەکەوتبوە ئەوێ و نیو کیلۆمەتریش لێی نزیک نەببۆوە. بۆ کاروباری ئیداری نەبوایە کەس نەدەچووە ئەوێ، ئەوەش هەر هێندە بوو کە لە تەلە دڕکاویەکانەوە ڕەت بێ. دوای ئەوە، دەرگای پۆڵایین و زنجیری کیف تێگیراو بوو. تەنانەت سەر شەقامەکەی نزیکیشی بەربەستی لێ دروست کرابوون و چاودێری وەک گۆریللا، بە قاتی ڕەشەوە و پڕچەک، دەهاتن و دەچوون.

وینستۆن بە پەلە وەرچەرخایەوە. سیمای هێمن و خۆشیی بە ڕوخساری خۆی دا. دەبوو بەرانبەر تەلەسکرینەکە قیافەی وا بێ. بە ژوورەکەدا ڕەت بوو و چووە چێشتخانە گچکەکەوە. لە بەر ئەوەی ئەو ڕۆژە، زوو لە وەزارەت دەرکەوتبوو، نیوەڕۆژەی ڕێستورانی لە دەست چوو بوو. دەشیزانی مەتبەخەکەی خۆی جگە لە کەرتە نانێکی ڕەش هەڵگەڕاو کە دەبێ بۆ سبەی بەیانی هەڵیگرێ هیچی دی نییە. شووشەیەکی بێ ڕەنگی لە ڕەفتەکە داگرت. لێی نووسرابوو: ("جن"ی سەرکەوتن). بۆنێکی ناخۆشی چەوری وەک عارەقی لە برنج دروستکراوی چینی لێ هەستا. وینستۆن، فینجانێکی لێ پڕ کرد و وەک دەرمان خواردییەوە. یەکسەر ڕوخساری سوور هەڵگەڕا و ئاوی بە چاواندا داچۆڕا. (جن)ی سەرکەوتن ترشەی ناتریکی بیر خستەوە. بە خواردنەوەی، پێی وا بوو کوتەکێکی بەر پشتە سەر دەکەوێ. زۆری نەبرد سووتانەوەی ناو زگی نەما و دنیای بۆ هێمن و تەخت بوو. لە پاکەتە قوپاوەکەی (جگەرەی سەرکەوتن) جگەرەیەکی دەرهێنا. بە بێ موبالاتی، جگەرەکەی سەرەوخوار گرت. تووتنەکەی هەڵڕژایە سەر زەوی. جگەرەی دووەم وای لێ نەهات. چووە ژووری دانیشتن و لە سەر مێزێکی گچکە، کە بەلای چەپی تەلەسکرینەکەوە بوو دانیشت. لە چەکمەجەی مێزەکەیەوە، پەندانێک و شووشە مەرەکەبێک و کتێبێکی زلی دەرهێنان. کتێبەکە بە موقەبای سوور و پشتی مەڕمەڕی جزوبەند کرابوو. ئەو کتێبە، لاپەڕەی نەنووسراوی تێدابوون.

(9) Mini pax

(10) Mini luv

(11) Mini plenty

لە بەر هەر هۆیەک بووبێ، جێی تەلەسکرینەکە ناسروشتی بوو. لە بری ئەوەی وەک عادەتیی بە دیوارەکەی دواوە بێ و هەموو جێیەکی ژوورەکەی لێوە دیار بێ، بەرەو ڕووی پەنجەرەکە، بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو. ئەوسەری ژوورەکە سەکۆیەک بوو و جێی سەری مەجلیس بوو. وینستۆن لەوێ دانیشتبوو. پێ دەچوو لە کاتی دروستکردنی شوقەکەدا جێی ڕەفتیان ڕەچاو کردبێ. وینستۆن، لەوێوە دەیتوانی خۆی لە چاوی تەلەسکرینەکە بدزێتەوە. بەڵام لەوێشەوە دەنگی هەر دەبیسترا. شێوەی ژوورەکە، کەم یا زۆر وای لێ کردبوو بیر لەوە بکاتەوە کە ئێستا ئەنجامی دەدا. ئەو کتێبەش کە دەریهێنابوو، وەک ئەو، لە بیرکردنەوەدا بوو. کتێبێکی بێ نیگاری جوان بوو. پەڕەکانی، ڕۆژگار زەردی کردبوون. بێ منەت چل ساڵ دەبوو قاقەزی وا دروست نەکرابوو. لە بەر ئەوە، وا پێدەچوو ئەو کتێبە زۆر لەو چل ساڵەش کۆنتر بێ. لە سەر پەنجەرەی دوکانێکی کۆنی تەڕەشوعاوی، کاتی خۆی (بیری نەمابوو لە چ شوێنێ) دیتبووی و دەزبەجێ حەزی تێ چوو بوو. ئەندامی حیزب مافی ئەوەیان نەبوو بچنە بازاڕی ئاساییەوە (ناوی مەعمەلەی بازاڕی ئازادی لێ نرابوو) بەڵام یاساکەش زۆر بە ڕەقی نەگیرابوو چونکە هێندێ پێداویستی وەک قەیتانی پێڵاو و گوێزان لە هەموو جێیەک چنگ نەدەکەوتن. بە پەلە تەماشای ئەمسەر و ئەوسەری شەقامەکەی کردبوو و خۆی پێدا کردبوو و ئەو کتێبەی بە دوو دۆلار و نیو کڕیبوو. ئەو کاتەی کە کڕیبووی نەیدەزانی بۆ چ مەبەستێکی بەکار دەهێنێ. خستبوویە جانتاوە و لە گەڵ هەستکردن بە خەتاباری، هێنابوویەوە ماڵێ. هەرچەندە هیچیشی تێدا نەبوو بەڵام هەر سازشکاریی بوو.

ئەوەی ئێستا خەریکی بوو، نووسینەوەی یاداشتەکانی خۆی بوو. ئەمەش، کارێکی ناقانوونی نەبوو چونکە(هیچ شتێ ناقانوونی نەبوو و ئیدی چ یاسا لە ئارادا نەمابوو) بەڵام ئاشکرابوونی کاری لەو بابەتە و سزای مەرگ پێکەوە دەبوون. هەر هیچ نەبێ، دەبێ ماوەی ۲۵ ساڵێک لە ئۆردوگای بێگاریدا ڕایکێشێ. وینستۆن، سەرەقەڵەمی بە قەڵەمەکەوە نا. بۆ ئەوەی چەوری پێوە نەمێنێ کەمێکی مژی. قەڵەمەکە کۆن بوو و بۆ ئیمزاکردنیش دەستی نەدەدا. بە دزییەوە و زۆر بە زەحمەت دەستی کەوتبوو. هەر بۆوەشی بوو کە پێی حەیف بوو بەقەڵەمی خەڵوز ئەو قاقەزە جوانە بڕووشێ. لە ڕاستیدا، ڕاشنەهاتبوو بە دەست بنووسێ. ئەو بە عادەت ڕستەی کورت کورتی بە ئامێری(بێژە و بنووسە)[12] بوو. ئەوەش بۆ ئەم مەبەستەی دەستی نەدەدا. قەڵەمەکەی خستە

(12) Speak - write



مەرەکەبەکەوە و بە دوودڵییەوە، کەمێ ڕاما. لەرزێک لە هەناوی پەیدا بوو. نووسین مەسەلەیەکی چارەنووسساز بوو. بە پیتی خواروخێچ نووسی: چواری نیسان - ١٩٨٤

ڕێک دانیشتەوە. هەستی بێدەسەڵاتی بە سەریدا زاڵ بوو. لە ڕاستیدا نەیدەزانی چ ساڵێکە. دەیزانی ساڵ لە دەوروبەری (١٩٨٤)دایە چونکە دڵنیا بوو لەوەی کە تەمەنی خۆی ٣٩ ساڵە و یا لە ساڵی ١٩٤٤ لە دایک بووە یا ١٩٤٥ بەڵام لەو ڕۆژگارەدا مەحاڵ بوو بە بێ کەم و زیادکردن، کات دیاری بکرێ.

لە ناکاو بیری لەوە کردەوە کە دەبێ یاداشتی بۆ کێ بێ. بۆ پاشەڕۆژ، بۆ دروستنەبووان. هۆشی، دەربارەی مێژووی گومانلێکراو، بە دیار پەڕە قاقەزەکەوە پرتەپرتی بوو. پاشان (باوەڕی دووفاقانە)[13] کە گوتەی (گوتەی نوێ) بوو، لە لای چەسپا. بۆ یەکەم جار هەستی بە قورسایی سەر شانی خۆی دەکرد. دەبێ چۆن چۆنی پەیوەندی بە داهاتووەوە بکەی؟. ئەو کارە، خۆی لە خۆیدا نەکردەیە و پێ دەچێ پاشەڕۆژ وەک ئێستا بێ و لەو حاڵەتەشدا گوێ لەم ناگیرێ. لەوانەشە وەک ئێستا نەبێ، لەو حاڵەتەشدا باری ئێستای خۆی بێ واتا دەبێ.

ماوەیەک دانیشت و حۆل حۆل لە لاپەڕەکەی دەڕوانی. بەرنامەی تەلەسکرینەکە گۆڕا و مۆسیقای مارشی سەربازی لێ دەدا. سەیر و سەمەرە لەوەدا بوو کە نەک هەر توانای نووسینی نەمابوو، بەڵکو بیریشی چوو بوو چی دەویست بینووسێ. ماوەی چەند حەوتوویەک بوو خۆی بۆ ئەم ساتە ئامادە دەکرد و قەتیش وەبیریدا نەدەهات جگە لە کەمێ نەترسان هیچی تری بوێ. خودی نووسین هاسان بوو. هێندەی بەس بوو ئەو بیرکردنەوە و دایەلۆگەی ساڵەهای ساڵە بە مێشکیدا دێن و دەچن بیانخاتە سەر قاقەز. بەڵام ئێستا سەرچاوەی بیرکردنەوە و مۆنۆلۆگی چکی کردووە. جگە لەوە، زامی جمگەشی وەخەروو کەوتبوو. نەیدەوێرا بیخورێنێ نەبادا لێی پیس بکات. چرکەکان دەڕۆیشتن و جگە لە خرووی پێی و سپێتی قاقەزەکە و جینگەجینگی مۆسیقا و سەرخۆشییەکی سووکی (جن)ەکە، ئاگای لە هیچی دی نەبوو.

کتوپڕ دەستی بە نووسین کرد. بە تەواوی نەیدەزانی چی دەنووسێ. دەسختە منداڵانەکەی، لە سەر پەڕەکە، بەرز و نزم دەبۆوە و چەندی زیاتر دەنووسی زیاتر پیتی درشتی فەرامۆش دەکردن... دوایی نوختەشی دانەدەنان:

(13) Double think

چواری نیسان /١٩٨٤ دوێشەو چوومە سینەما. گشتی فلیمی شەڕ بوو. یەکێکیان گەلێ چاک بوو. یەک کەشتی پڕ پڕ بوو لە پەناهەندەی ناوچەیەکی دەریای ناوەڕاست و بۆمباران دەکرا. دیمەنی پیاوێکی قەڵەو کە دەیویست بەمەلە خۆی لە دەست کۆپتەرێک دەرباز بکا بۆ بینەران مایەی خۆشی بوو. لە پێشا وەک بەرازی دەریایی لە ناو ئاوەکە بەرز دەبوو و نزم دەبوو پاشان لە دوربینی نیشانچی کۆپتەرەکەوە دەبیندرا. گشت لەشی کونکون ببوو و ئاوەکەی دەوروبەری پەمەیی دیار بوو. دوایی دەتگوت لە کونەکانی لەشیەوە ئاوی تێ چووە، لە پڕێکدا نقوم بوو. کە نقوومیش بوو بینەران لە خۆشییاندا قاقایان لێ دەدا دوای ئەوە بەلەمێکی ڕزگارکەری پێشان دا کە پڕ بوو لە منداڵ کۆپتەرەکەش بە دیاریانەوە فڕکە فڕکی بوو ژنێکی تەمەن مامناوەندی لە پێشەوە دانیشتبوو منداڵێکی دوو یا سێ ساڵانی بە باوەشەوە بوو ڕەنگە ژنەکە جوولەکە بووبێ منداڵەکە دەیزیڕاند و سەری خۆی توند بە سینگی ژنەکەوە دەنووساند پێ دەچوو بیەوێ ڕاست بچێتە ناو ژنەکەوە ئەویش باسکی لە دەوری هاڵاندبوو و هەوڵی ژێرکردنەوەی دەدا هەرچەندە بەخۆشی هەترەشی چووبوو چەندی پێ دەکرا دەیشاردەوە دەتگوت وا دەزانێ باسکی پێش فیشەکی پێ دەگیرێ کۆپتەرەکە بیست کیلۆ بۆمبای خستە ناویانەوە بڵاچەیەک هەستا ئیدی هەر پارچەی ورد وردی بەلەمەکە مایەوە دوایی باسکی منداڵێک بیندرا کە بەرز بەرز ڕاست بە حەوادا بەرز دەبوەوە دیار بوو دووربینی کۆپتەرەکەی بە دواوە بوو و پێشانی دەدا لە جێی ئەندامانی حیزبەوە بوو بە چەپڵەڕێزان لە لای خوارەوەی هۆڵەکەشەوە ژنێ دەیزریکاند و دەیگوت ڕاست نییە دیمەنی وا پێشانی منداڵ بدرێ نابێ نا ڕاست نییە نەیبڕییەوە تا پۆلیس قرەبڕی کرد بەڵام باوەڕ ناکەم هیچی لێ بێ چونکە گوێ نادەنە بۆچوون و نارەزایی ڕەشەخەڵکەکە قەت...

وینستۆن، بە هۆی ئازاری ماسولکەوە دەستی لە نووسین هەڵگەرت. نەیدەزانی چ هێزێک بۆ نووسینی ئەو ڕیزە قسە قۆڕانە پاڵی پێوە نا. بەڵام گرینگ ئەوە بوو کە بە هۆی ئەو نووسینەوە بۆچوونی تری بۆ هات. ئەمەش توانای داڕشتنی زیاد کردبوو. بیری کەوتەوە کە ڕووداوێکی دی بەرەو ماڵەوەی هێنایەوە و هەر ئەو ڕووداوەش وای لێ کردبوو کە ئەو ڕۆژە، دەست بە نووسینەوەی یاداشتەکانی خۆی بکات.

ئەو بەیانییە شتێ لە وەزارەت ڕووی دابوو، دیارە ئەگەر بکرێ ڕووداوی وا ئاڵۆز ئیمکانی ڕوودانی هەبێ. سەعات نزیکەی یازدە، لە بەشی ئەرشیف کە جێی کاری وینستۆن بوو، کورسییەکانیان لە ژوورەکانەوە بردنە دەرێ و دوایی ڕێک لە ناوەڕاستی



هۆڵە گەورەکەدا، بەرانبەر تەلەسکرینێکی گەورە، بۆ ئاهەنگی (دوو دەقیقە ڕق) ڕیزیان کردن. وینستۆن، لەسەر کورسیەکی ڕیزەکانی ناوەڕاست ڕۆنیشت. لە پڕ، دوو کەس خۆیان بە هۆڵەکەدا کرد. وینستۆن دەیناسین بەڵام قەتی قسە لەگەڵدا نەکردبون. یەکێکیان، کیژێ بوو کە گەلێ جار لە کۆریدۆرەکەدا دیتبووی. وینستۆن ناوەکەی نەدەزانی بەڵام دەیزانی کە لە بەشی هەڵبەستن کاری دەکرد. هێندێ جار بە دەستی چەور و دەست بە سپانەوە دەیدی بۆیە پێی وا بوو کە لە سەر ئامێری هەڵبەستنووس کار دەکا. کیژێکی بەرچاوی، قژ ڕەش و پڕی بیست و حەوت ساڵی بوو، گورجوگۆڵ و وریا بوو. پشتێنێکی سووری باریک (نیشانەی لاوانی دژی سێکس)، چەند قەدێ بە توندی لە ناوقەدی ئاڵا بوو و سمتی دەرپەڕاندبوو. هەر لە یەکەم دیدارەوە، وینستۆن خۆشی پێدا نەهات و هۆیەکەشی دەزانی. ئەو کیژە، بۆن و بەرام و ئاوهەوای گۆڕەپانی (شەقێنی سەر سەهۆڵبەندان) و گەرماوی سارد و مەشق و یادگار و بیری هاوبەشی لەگەڵ خۆدا دەهێنا. وینستۆن قینی لە ژنان بوو، بە تایبەتی عازەب و جوانەکانیان. هەموو دەمێ ژنی جوان هەواداری سەرسەختی حیزب بوون. ئەوان دروشمیان هەڵدەبژارد و ئەوان ئارەزووی خەفێتی بەلاشیان دەکرد و لووتتێوەژەنیان لە بنی عەرد دەردەهێنا. بەڵام ئەو کیژەی بەلاوە لە هەمووان ترسناکتر بوو. جارێکیان لە کۆریدۆرەکەیدا دیت کە بە تیلەی چاو تێی ڕامابوو و هەر ئەوەش وەک تیغ هەناوی سمی. تا ماوەیەک ترسی نەڕەوییەوە. تەنانەت بیری لەوەش دەکردەوە کە ئەو کیژە پۆلیسی خەیاڵ بێ. مەرجیش نەبوو وا بێ بەڵام کە لووتی بە لووتیدا دەتەقی، هەستێکی سەیر دەیوروژاند و ترسێکی گەورەی لێ دەنیشت.

ئەوەی کە لەگەڵیدا وەژوور کەوت ناوی (ئۆبراین)[14] بوو، و ئەندامی ناوەندی حیزبیش بوو. پلەوپایەیەکی هێند گرنگی هەبوو کە وینستۆن شتێکی سەرەتایی و نارەوان و کەمی لێ دەزانی. بە دیتنی بەدلەی ڕەشی ئەندامی ناوەندی حیزب، دانیشتوان، ماوەیەک کڕ بوون. ئۆبراین پیاوێکی زل و بەخۆ بوو. ملی ئەستوور و ڕوخساری مۆن و پێکەنینهێنەر بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە سامی لێ دەکرا، شتێکی تێدا بوو دڵی ڕادەکێشا. کە چاویلکەکەی لە سەر لووتی بۆ ڕێک دانانەوەی لادەبرد، دەتگوت چەک کراوە. بە شێوەیەکیش ماکی شارستانی پێوە دیار بوو لە باسکردن نەدەهات. ئەتواری نەجیبزادەکانی سەدەی هەژدەی وەبیر دەهێنایەوە کە کیسە تووتنیان لە هاونشینانیان دەبردە پێش. ڕەنگە وینستۆن لە ماوەی دە دوانزە ساڵدا، هەر دە دوانزە جارێ ئۆبراینی

(14) O` Brien

ديبێ. هەستی دەکرد هێزێک بەرەو ئەوی دەبا. ئەوەش هەر بە هۆی ئەو ناکۆکی و نەگونجانەوە نەبوو کە لە نێوان ڕەفتاری هێمن و جەستەی زل و ڕژدیدا بوون. مەسەلە لەوە گەورەتر بوو. بۆچوونێکی نهێنی هەبوو– لەوانەیە بۆچوون نەبووبێ بەڵکو هومێدێ بووبێ – ئەوەش ئەوە بوو کە سیاسەتەکەی ئەویش وەک ئەم دەشەلی. شتێک لە ڕوخساریدا ئەوەی دەدرکاند. خۆ ڕەنگە ناهەماهەنگی ڕوخساریشی نەبووبێ بەڵکو بەوپەڕی ساکاریبیەوە، قۆز بووبێ. هەرچۆنێ بێ وا وێ دەچوو لەو پیاوانە بێ کە پیاو بتوانێ دوو بە دوو قسەی لەگەڵدا بکا، بە مەرجێ چاوی تەلەسکرینی لێوە دیار نەبێ، یا فریوی بدات. پێ دەچوو وا بێ. وینستۆن،چ بەڵگەی بۆ ئەو بۆچوونەی نەبوو و چ ڕێگەیەکیش بۆ دۆزینەوەی بەڵگەی ڕاستی نەبوو. لەو کاتەدا ئۆبراین تەماشای سەعاتەکەی مەچەکی کرد. وێ دەچوو پێشوتر بیری لەوە کردبێتەوە تا برانەوەی (دوو دەقیقە ڕق) لە بەشی ئەرشیف بمێنێتەوە.

لە ڕیزەکەی وینستۆن، یەک دوو کورسییەک لەولاترەوە دانیشت. ژنێکی بچکۆلەی قژکاڵ، کە لە ژوورەکەی ئەولای ژووری وینستۆنەوە کاری دەکرد، کەوتە نێوانیانەوە. کچە قژرەشەکەش ڕێک لە پشتیەوە بوو.

ساتێ دواتر، دەنگێکی گەورەی ترسناک کە بە دەنگی مەکینەی چەورنەکراو دەچوو لە تەلەسکرینەکەوە، لەوسەری هۆڵەکەوە هەستا. لەو جۆرە دەنگانە بوو کە ددانی پیاو ئاڵ دەکەن و مووی جەستە ڕەپ دەکەن. ئاهەنگی ڕق دەستی پێ کرد.

وەک هەموو جارێ ڕوخساری عەمانوئێل گۆڵدستەین[15]، دوژمنی میللەت لە سەرشاشەکە دەرکەوت. چپەچپی ترسئامێزی قژکاڵەکە دەبیسترا. گۆڵدستەین خایەن و پەیمانشکێن بوو، کە زەمانێ (کەس لە بیری نەمابوو چ زەمانێ) یەکێ بوو لە سەرانی حیزب. دەتوانی بڵێی کە هاوشانی خودی (ڕێبەری گەورە) بوو. پاشان، جموجۆڵی دژ بە شۆرشی لێ ئاشکرا ببوو، ئیدی بڕیاری مەرگی بە سەردا درابوو. ئەویش، قووچاندبووی و خۆی ون کردبوو. بەرنامەی دوو دەقیقە ڕق، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەگۆڕا بەڵام هیچ بەرنامەیەک نەبوو ڕوخساری گۆڵدستەین بابەتی سەرەکی نەبێ. ئەو، خایەنی سەرەکی و گەورە بوو و ئەو حیزب پیسکەرە بوو. گشت سەرپێچییەکی ناو حیزب لە دوای ئەو، هەموو خیانەتکاریەک، هەموو خراپەیەک، هەموو هەڵگەڕانەوە و دابڕان و دووبەرەکیەک، گشت لە گشتی، ڕاستەوخۆ لەوەوە داکەوتبوون. هێشتا هەر بە زیندویی لە پەنایەکی

(15) Emmanuel Goldstein



دنیادا مابوو. ڕەنگە لەودیو دەریا، لە سایەی ئاغاکانیدا بووبێ. لە وانەشە – وەک دەنگ هەبوو – لە ئۆقیانووسیا، خۆی مەڵاس دابێ.

وینستۆن دڵی دەگوشرا. قەت نەیدەتوانی بێ ئەوەی هەستی تێکەڵ بە ئازاری هەبێ ڕوخساری گۆڵدستەین ببینێ. سیمای درێژ و جوولەکانە بوو. قژێکی سپی و ڕدێنێکی بچوکی بزنانەشی هەبوو. ڕوخساری، زیرەکیی پێوە دەبیندرا. لە هەمان کاتیشدا، بە جۆرێکی نالەبار پیری و خلەفاوی، بە هۆی لووتە درێژەکەیەوە کە چاویلکەی بە سەرەوە بوو، پێوە دیار بوو. ڕوخساری، سەرە مەڕی وەبیر دەهێنایەوە. تەنانەت دەنگیشی مەڕانە بوو. گۆڵدستەین، باوەڕی ژەهراوی خۆی بە ناو حیزبدا پەرت دەکرد. پلانەکانی هێند زەق و ئاشکرا دیار بوون مندالێیش پەی پێ دەبردن. هێندەش بە ناسکی و لەسەر خۆ هەڵیدەڕشتن، پیاو ترسی لێ دەنیشت کە خەڵکی کاڵفامی بە داوەوە بن. بە خراپە باسی (ڕێبەری گەورە)ی دەکرد و دیکتاتۆریەتی حیزبی مەحکووم دەکرد. پێکهاتنی دەزبەجێی ئاشتیانەی لە گەڵ ئەوروئاسیادا دەویست. خواستیاری ئازادی ئاخاوتن و چاپەمەنی و کۆبوونەوە و بیرکردنەوە بوو. دەیقیژاند و دەیگوت خیانەت لە شۆڕش کراوە. ئەو هەمووەشی بە ڕستەی درێژ و بە پەلە دەگوت کە پێچەوانەی ئاخاوتنی لە سەرخۆی باوی ناو حیزب بوو و پتر وشەکانی (گوتەی نوێ)ی دەهاویشتنە ناو قسەکانی. لە هەموو بارێکدا، بۆ ڕەواندنەوەی گومان و دوودڵی لە گوتە و ڕستە فریودەرەکانی گۆڵدستەین، ڕیزە سوپای بێ کۆتایی ئەوروئاسیا، لە پشتی سەریەوە پێشان دەدرا. دەڕۆیشتن و زەلامی بەهێز لە پێشیانەوە بوون و بە خۆ و ڕوخساری ئاسیاوی سادەیانەوە ڕێیان دەکرد. شاشەکە، یەکە یەکە ئەو ڕوخسارانەی دەهێنایە پێشێ. ئەمیان لادەچوو ئەویان دەردەکەوت و هەموشیان وێک دەچوون. دەنگی بەئاوازی پۆستاڵی سەربازەکان لەگەڵ دەنگ و بارەباڕی گۆڵدستەیندا هاوئاواز دەبوون. هێشتا سیی چرکە لە ئاهەنگەکە تێنەپەڕیبوو، دانیشتوانی هۆڵەکە هاواریان لێ هەستا. ڕوخساری لە خۆڕازی و مەڕانەی سەر شاشەکە و توانای بێ سنووری سوپاکەی پشتی، لە وزە بەدەر بوون. جگە لەوەش، هەر بینینی گۆڵدستەین یا تەنانەت بیرلێکردنەوەشی، خۆی لە خۆیدا ترس وتوورەیی پێک دەهێنا. ئەو لە ئەوروئاسیا و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا زیاتر جێی قین بوو چونکە ئۆقیانوسیەکان ئەگەر لەگەڵ یەکەمدا لە شەڕدا بووبن ئەوا لەگەڵ دووەمدا لە ئاشتیدا بوون. ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو ئەوە بوو کە هەرچەندە گۆڵدستەین ناپەسندبوو و خەڵکەکەی لێ وەڕس بوون، هەرچەندە هەموو ڕۆژێک و ڕۆژی هەزار جار لە تەلەسکرین وگۆڤار و ڕۆژنامەدا

بۆچوونەکانی پووچ دەکرانەوە و بە درۆ دەخرانەوە و سووک پێشان دەدران و لە بەر چاوی خەڵک دەخران و بە تووڕەهات دەژمێردران، لە گەڵ هەموو ئەوانەشدا کاریگەرێتی بۆچوونەکانی کەم نەدەبوو. هەموو دەمێ نەفام و کورتبین هەبوون بخەڵەتێن. ڕۆژ نەبوو پۆلیسی خەیاڵ، لەو جاسووس و خراپەکارانە نەگرێ کە لە ژێر کاریگەرێتی ئەودا بوون. ئەو، فەرماندەی نهێنی گەورە بوو کە دەیانویست بە ڕێکخستنی نهێنی دەوڵەت وەرگێڕن. ناوی ڕێکخستنەکە (برایەتی)بوو. مقۆمقۆی بوونی کتێبێکی ترسناکیش لە ئارادا بوو کە گوایە هەموو تیۆرییە ڕافزیانەکانی گۆڵدستەینی تێدان و بە دزییەوە دەستاودەست دەکات. کتێبەکە ناوی نەبوو. خەڵک بە ناوی (کتێبەکە) ناویان دەبرد. بەڵام شتی وا هەر لە ڕێگەی پڕوپاگەندەی ئالۆزەوە باس دەکرا. نە (برایەتی) بۆ ئەندامی ڕاستەقینەی حیزب مایەی باسکردن بوو نە (کتێبەکە).

مەراسیمی ڕق لە دەقیقەی دووەمیدا تا ڕادەی شێتبوون هەڵچوو. بینەران لە جێی خۆیانەوە هەڵدەستان و دادەنیشتنەوە. بۆ کپکردنی ئەو بارە بارە عەقڵ تێکدەرە دەیانقیژاند. ژنە قژ کاڵەکە ڕەنگی لەڕوودا نەمابوو، وەک ماسییەک کەوتبێتە سەر زەوی، هەر دەمی دەکردەوە و دایدەخستەوە. تەنانەت (ئۆبراین) یش ڕەنگی گۆڕابوو. بە سەر کورسییە شەقوشڕەکەیەوە، سینگی هەڵبەز و دابەزی دەکرد. دەتگوت سینگی خۆی کردۆتە سوپەر و بەرانبەر هێرشی دەستدرێژکەرانی پێ گرتووە. کچە قژڕەشەکەی پشت وینستۆن هاواری (بەراز... بەراز... بەراز...)ی لێ هەستا ولە پڕ فەرهەنگی گەورەی (گوتەی نوێ) کە بە دەستییەوە بوو، بۆ تەلەسکرینەکەی هاویشت. بەر لووتی گۆڵدستەین کەوت و بەربووەوە زەوی. دەنگ و هەرا بەردەوام و بێ ئامان بوو. لە ساتێکی گەرمبووندا، وینستۆن هێندەی بە خۆ زانی، ئەویش گەرم بووە. هاوار دەکات و پاژنەی بە بنی کورسییەکەی ژێریدا دەکێشێ. ناخۆشی لە بەشداربوونی ئەو (دوو دەقیقە ڕق)ەدا نەبوو، بەڵکو لەوەدا بوو کە نەدەکرا بەشداری هەمووان نەکەیت. لە سیی چرکەی یەکەمدا، پێویستی نەدەکرد هەوڵی خۆ هێمنکردن بدەی. دوای ئەوە سەرمەستی دێوئاسا کە بە هۆی ترس و تۆڵە و ئارەزووی کوشتار و ئازاردان و سەروسەکوت شکاندن بە چەکوش، وەک وزەی کارەبا بە خەڵکەدا دەگەڕا و هەر یەکەیان بێ ئەوەی لە دەسەڵاتی خۆیدا بێ دەبووە شێتێکی عەبووس و هەڵەوەڕ. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، ئەو ڕق و کینەیەی کە هەستی پێ دەکرا، بەرەو ڕووی شتێکی تایبەتی نەبوو. وەک لامپای دەست ڕووی لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی دی دەگۆڕدرا. بەو پێیە، بۆ ساتێکی کەم وینستۆن ڕقی خۆی ئاراستەی



گۆڵدستەین نەکردبوو بەڵکو ڕووی لە (ڕێبەری گەورە) و (حیزب) و (پۆلیسی خەیاڵ) کردبوو. لە ساتی وادا، کۆتری دڵی بەرەو ئەو ڕافزییە تاک و تەنها و باریکەلەیەی سەر شاشەکە، ئەو چاودێرە تاقانەیە، ئەو عەقڵەی ناو دنیای درۆ و دەلەسە دەفڕی. ساتی واش هەبوو لەگەڵ یەکێ لە هاونشینەکانیدا یەکی دەگرتەوە و هەرچی دەربارەی گۆڵدستەین دەگوترا، پێی ڕاست دەبوو. لە کاتی وادا، قینی شاردراوەی بەرانبەر (ڕێبەری گەوەرە) دەبوو بە پێزانین و ڕێبەری گەورەی وا لە لا بەرز دەبوو، وا ئازا و بوێر دەبوو، وەک بەردێکی ڕەقی لێ دەهات کە پێشی بە میللەتانی ئەوروئاسیا گرتبێ. هەرچەندە گۆڵدستەین تەنها و بێ دەسەڵات بوو و ئەو هەموو قال و قیلەی بە دواوە بوون بەڵام وەک جادوگەرێکی لێ دەهات کە بە هۆی دەنگی خۆیەوە توانای هەڵگێڕانەوەی شارستانیەت و کلتووری هەبێ.

لە ساتی وادا، تەنانەت ئەوەش دەکرا ڕووی ئەو قینە وەرچەرخێ و ئاراستەی لایەکی دی بکرێ. وەک ئەوە بوو کە پیاو سەری خۆی لە سەر سەرینەکەی وەرچەرخێنێ بۆ ئەوەی خەونی ناخۆشی لە کۆڵ بێتەوە. وینستۆن توانی قینی خۆی، لە شاشەکەوە بۆ ژنەکەی پشتیەوە ڕاگوێزێ. هێندێ خەیاڵی جوان بە هۆشیدا وەک بروسکە گوزەریان کرد. حەزی دەکرد بیگرێ و بە سۆندە هێندەی لێ بدا، هەر بیتۆپێنێ. دەیویست بە ڕووت و قووتی بە سنگێکەوەی ببەستێتەوە و وەک (سێباستیان)ی پیرۆز تیربارانی بکا. حەزی دەکرد زۆرگێی بکات و لە کاتی ڕەحەتبووندا سەریبڕێ. ڕقی لێی بوو چونکە جوان و گەنج بوو و حەزی لە پەیوەندی نێر و مێیی نەدەکرد. لە بەر ئەوە قینی لێی بوو، چونکە حەزی دەکرد لە گەڵیداجووت بێ و نەدەکرا. ڕقی لێی بوو چونکە ناوقەدی باریک بوو و ئامێزی دەویست بەڵام قایشێکی سوور کە نیشانەی ڕق بوو پێشگر بوو.

ئاهەنگی ڕق لەوپەڕی گەرمبوندا بوو. گۆڵدستەین بارەباڕی بوو. ماوەی ساتێک ڕوخساری بوو بە ڕوخساری مەڕ. ڕوخسارە مەڕییەکە گۆڕا و بوو بە هی سەربازێکی ئەوروئاسیایی کە وەک دێو ترسناک بوو و بەرەبەرە دەهاتە پێشێ. ڕەشاشەکەی هاڕەی دەهات و پێ دەچوو لە شاشەکەوە دەرکەوێ. هێندێ لە دانیشتوانی ڕیزی پێشەوە خۆیان بە پشتدا شکاندەوە. دوایی، هەمووان هەناسەی ئاسوودەییان هەڵمژی. ڕوخسارە دوژمنانەکە گۆڕا و بوو بە (ڕێبەری گەورە). بە خۆ و بە قژە ڕەشەکەیەوە، بە سمێڵە ڕەشەکەیەوە، بە سیمایەکی تەلیسماوی هێمنەوە دەرکەوت و گشت شاشەکەی گرتەوە. کەس گوێی لە گوتەکانی (ڕێبەری گەورە) نەبوو. تەنها چەند وشەیەکی هاندەرانە، لەو

بابەتانەی کە لە سەردەمی جەنگدا دەگوترێن و لێک جودا ناکرێنەوە. دیسان سیمای (ڕێبەری گەورە) لاکەوت. ئەوجا سێ دروشمەکەی حیزب دەرکەوتن:

شەڕ ئاشتییە

کۆیلایەتی ئازادییە

نەزانیی هێزە

پێ دەچوو تاچەند چرکەیەک سیمای (ڕێبەری گەورە) هەر لە سەر شاشەکە بێ. دەتگوت لە ناو چاوی بینەراندا بەزیندویی هەڵکەندراوە و وا بە زوویی ناسڕدرێتەوە. ژنە قژکاڵەکە خۆی بە سەر کورسیەکەی بەردەمیدا دا و هەردوو دەستی بەرەو شاشەکە درێژ کرد و قیژاندی:" نەجاتدەرەکەم!". ئەوجا ڕووی خۆی خستە نێوان هەردوو لەپی و کەوتە چپەچپ. وێ دەچوو دوعایان بکا. لەو ساتەدا گشت بینەران، وەک شەپۆل ڕاپەڕین و بە ڕێکی و دەنگی بلند هاواریان دەکرد:"ڕ – گ!...ڕ – گ!...ڕ – گ!..." بەیەک دەنگ و بە ڕێکوپێکی ئەوەیان چەند بارە کردەوە. پشوویەکی درێژیشیان لە نێوان (ڕ)کە و (گ)ەکەدا پێک دێنا. ئاوازێکی سەنگین و سەرنجڕاکێش پێک دەهات کە وەک ئەوە بوو پێی خاوس بە زەویدا بدرێ و دەنگی تەپڵ بێ. ئەو کارەیان، ڕەنگە سیی چرکەی خایاندبێ. زیاترلە کاتی هەڵچووندا وا دەکرا. جۆرە سروودێکی ستایشکارانەی گەورەیی و دانایی بوو بۆ (ڕێبەری گەورە)، بەڵام لە پلەی یەکەمدا هەوڵی خۆسڕکردن بوو. بە هاواری ئاوازئامێز، هەوڵی خنکاندنی ویژدان دەدرا. وینستۆن هەستی بە ساردییەک دەکرد کە بە هەناویدا دەگەڕا. لە ماوەی (دوو دەقیقەی ڕق)دا، شێتبوونی دەستەجەمعی نەبێ هیچی تر نەدەکرا. بەڵام ئەو سروودە کێوییە (ڕ – گ... ڕ – گ...) لێواولێوی دەکرد لە ترس. خۆ دیارە ئەویش لەگەڵ هەمەواندا ئاوازەکەی دەگوت. هیچی دیکە نەدەکرا. شاردنەوەی هەست، سیما گونجاندن و دوپات کردنەوەی کرداری ئەوانی دی کارگەلێکی غەریزی بوون. بەڵام لە ناو ئەوانەدا، بۆ ماوەی چەند چرکەیەک، دوور نەبوو چاوی خەیانەتی لێ بکەن. ڕێک لەو کاتەدا، ڕووداوێکی گرنگ پێش هات ئەگەر بکرێ ناوی ڕووداوی لێ بنرێ. لە چرکەیەکدا چاوی بە چاوی ئۆبراینەوە تەقی. ئۆبراین بە پێوە بوو. چاویلکەی وەلا نابوو و لە سەر لووتی ڕێکی دەخست. لە ماوەی یەک چرکە کەمتردا، چاویان بە چاوی یەکتردا تەقینەوە. هەر لەو ماوە کورتەدا وینستۆن زانی کە (ئۆبراین)یش، وەک ئەم بیر لە هەمان مەبەست دەکاتەوە. پەیامی نهێنی لە نێوانیاندا گۆڕدرایەوە. دەتگوت دەرگای هۆشیان بۆ یەک خستۆتە سەر پشت و لە ڕێی چاوەوە بەرەو



ناو هۆشی یەک دەکشێن. پێ دەچوو ئۆبراین پێی بڵێ: "لە گەڵتدام. ڕێک و بە وردی دەزانم لە چ بیرکردنەوەیەکدای. ئاگام لە ڕق و کینە و خەمت هەیە. دڵنیابە لایەنگرتم!" ئیدی بروسکەی بۆچوونەکە کوژایەوە و سیمای ئۆبراین وەک هەموو ئەوانی دی تێکنرا.

هەر ئەوەندە بوو. لە ڕاستیدا، دڵنییا نەبوو ڕووی دابێ. ڕووداوی وا هیچی بە دوودا نەدەهات. بەرهەمی ڕووداوی وا ئەوە بوو کە پێی وابێ، یا هومێدی ئەوەی هەبێ کە خەڵکی تری وەک ئەو هەن کە دوژمنی (حیزب) بن. لەوانە بوو ئەو پروپاگەندانە ڕاست بن کە دەربارەی خەباتی ژێر زەمینی بڵاو دەبوونەوە. لەوانە بوو مەسەلەی (برایەتی)لە دەرەوە وەک بوون هەبووبێ. هەرچەندە خەڵک دەگیران و لە دار دەدران و دان بە تاواندا دەندرا، بەڵام مەحاڵ بوو سەیری (برایەتی) وەک دیاردەیەکی خەیاڵی نەکرێ. هێندێ ڕۆژ باوەڕی پێ دەهێنا و هێندێ جاریش پێی وانەبوو ڕاست بێ. بروسکە ئاسا، لە پڕێکدا دەبیسترا. لەوانە بوو واتایەکی بووبێ، لەوانەش بوو نەیبووبێ. یەکێ لەوانەی کە دەبیسترا، لە نووسینی قەد دیواری ئاودەستەوە بوو. دوو کەسی نائاشنا بە یەکتر، تووشی یەک دەبوون و بە بزواندنی دەست دیاردییان بۆ یەک دەکرد. ئەمانە گشتی گومان بوون. وەک ئەوە بوو لە جیهانی خەیاڵدا ڕوویان دابێ.

بێ ئەوەی سەیری ئۆبراین بکاتەوە گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی. بە بیرکردنەوە لەو چرکە چاوپێکداچڕژانە ناخی ئازاری هەبوو. ئەگەر بیزانیبا چۆن ئەو کارە ئەنجام دەدرێ، لە ڕادە بەدەر سامناک دەبوو. یەک دوو چرکەیەک سەرنجیان چۆتە سەر یەک و بڕایەوە. تەنانەت ئەوەش ڕووداوێک بوو کە مرۆی بە ژیانەوە دەبەستەوە و لە تەنیاییدا بیری لێ دەکردەوە.

وینستۆن ڕێک دانیشتەوە. پەڵە دووکەڵێکی بە بادا دا. (جن)ەکە بڵقی لە ناو زگیدا دروست کردبوو. تەماشای پەڕەقاقەزەکەی بەردەمی کرد. بۆی دەرکەوت کە بە دەم خەیاڵەوە، هەر لە خۆڕا نووسیویەتی. چی دی خەتە چەوت و چێڵەکەی پێشان نەبوو. قەڵەمەکە، بە کەیفی خۆی بە سەر لاپەڕە نەرمەکەدا کشا بوو و بە پیتی درشت و جوان نووسیبووی:

مەرگ بۆ ڕێبەری گەورە

مەرگ بۆ ڕێبەری گەورە

مەرگ بۆ ڕێبەری گەورە

مەرگ بۆ ڕێبەری گەورە

مەرگ بۆ ڕێبەری گەورە

و نیوەی لاپەڕەکەی هەر بەوە پڕ کردبۆوە. ترسی بە جەستەدا گەڕا. نەیدەتوانی بە سەر ترسەکەیدا زاڵ بێ کە جمکی ئازاریش بوو. ئەو ترسەی بێ واتا بوو چونکە نووسینەکە، لە کردنەوەی لاپەڕە بۆ نووسینی یاداشت پتری مەترسی نەبوو. ساتێ لەوە دوودڵ بوو قاقەزەکان بدڕێنێ و بە جارێ لە پرۆژەکەی پاشگەز بێتەوە. وای نەکرد چونکە دەیزانی بێ سوودە. هەرچۆنێ بێ، ئەگەر بنووسی مەرگ بۆ ڕێبەری گەورە یا دەستی لێ هەڵگریت جیاوازی نییە. بەردەوامبوون و بەردەوامنەبوون لە سەر نووسینی یاداشت وەک یەکن. لە هەردوو حاڵەتدا، پۆلیسی خەیاڵ دەیگرن. ئەو تاوانێکی کردبوو پڕ بوو لە تاوانی دیکە. ئەگەر قەڵەمیشی بە قاقەزدا نەهێنابا، تاوانەکەی هەر کردبوو. ئەمە ناوی (تاوانی خەیاڵ) بوو. تاوانی خەیاڵ، هەتا هەتا بە پەنهانی نەدەما. با ماوەیەک، تەنانەت چەند ساڵێکیش نهێنی بوایە، ئاخرێکەی پیاو گرفتار دەبوو.

گشت کاتێ بە شەوان بوو. گرتن هەر بە شەوان بوو. لە خەو ڕاپەڕاندنی کتوپڕ، دەستێکی زبر شانت ڕادەوەشێنێ، ڕووناکییەک بەر چاوت دەکەوێ و ڕیزێ ڕوخساری گرژ و مۆن لە دەوری قەرەوێڵەکەتن. لە گەلێ باردا نە دادگا هەبوو نە لێکۆڵینەوە. خەڵک لە پڕ ون دەبوون. ئەوەش هەر بە شەو. ناوت لە جێیە ڕەسمییەکاندا نەدەما. پێشتر هەرچیت کردبێ لادەبرا. بوونت ئینکار دەکرا و دواییش لە بیر دەچووی. ناوت لە ناو ناواندا نەدەما... نەدەمای: باشترین وشە، (بە هەڵم بوون)ە.

کەمێ لە دەست هیستیریاکەی ڕەها بوو. بە چەوتوچێڵی و بە پەلە دەستی بە نووسین کرد:

تیربارانم دەکەن، با بیکەن. فیشەکێ بە پشتەملمەوە دەنێن، با بینێن مەرگ بۆ ڕێبەری گەورە دایم فیشەک بە پشتی ملەوە دەنێن مەرگ بۆ ڕێبەری گەورە.

خۆی لە سەر کورسییەکە بە پشتدا شکاندەوە و قەڵەمەکەی وەلا نا. لە پڕ ڕاپەڕی. لە دەرگاکەی درا!.

هەروا زوو! بەو هیوایەی هەر کەسێکە ڕێی خۆی بگرێت و بڕوات، وەک مشک لە جێی خۆی وشک بوو. بەڵام نا... دەرگاکوتان بەردەوام بوو. خراپترین شت دواکەوتن بوو. دڵی وەک دەهۆڵ لێی دەدا، بەڵام ڕوخساری، بە هۆی خۆڕاهێنانی دوور و درێژەوە دەقی خۆی گرتبوو. هەستا و بە گرانی و لە سەرخۆ، بەرەو دەرگاکە چوو.



## ٢

کە دەستی خستە سەر دەسکی دەرگاکە، بیری کەوتەوە کە دەفتەرەکەی بە کراوەیی لە سەر مێزەکە جێ هێشتووە: "مەرگ بۆ ڕێبەری گەورە"، هێند بە درشتی نووسرابوو، لەوسەری ژوورەکەوەڕا دەخوێندرایەوە. کاری وا کەرانە هەر نەکراوە. بەڵام دەیزانی ئەگەر بە دەم ترس و لەرزەوە کتێبەکە دابخا کە هێشتا مەرەکەبەکەی وشک نەببۆوە، ئەو پەڕە جوانانە عەدم دەبن. هەناسەی لە بەر خۆی بڕی و دەرگاکەی کردەوە. گڕەیەکی گەرمی دڵنیایی لە دەروونیەوە هەستا. ژنێکی بێ ڕەنگی قژ ژاکاو لە بەر دەرگا بوو. بە دەم کڕووزان و گریانەوە گوتی: "ئا، هاوڕێ پێم وایە ئاگام لە هاتنەوەت بوو. دەبێ ئەرک نەبێ سەیرێکی قاپشۆرەکەمان بکەی؟ بۆڕیەکەی گیراوە و..."

"پارسۆنز خانم" ی دراوسێی بوو و لە هەمان نهۆمدا دەژیا. "خانم" نازناوێکی وەک "هاوڕێ" لەبار نەبوو کە دەبوو هەمووان بەکاری بێنن. بەڵام پیاو بۆ گەلێ ژن، هەر لە خۆڕا "خانم"ی دەگوت. تەمەنی لە سیی ساڵی ڕەت دابو بەڵام لەوە پیرتر دیار بوو.وێ دەچوو گەرد لە لۆچەکانی ڕوخساری نیشتبێ. وینستۆن، بە کۆریدۆرەکەدا دووی کەوت. ئەو وەستاییە بەلاشە و ئەو سەرێشەیە کاری ڕۆژانە بوو. شوقە کەرپووچیەکان کۆن بوون. لە (١٩٣٠)یەوە دروست کرابوون و لە تەپینەوە نزیک بوون. جاروبارێ قاقەزی بن میچ و قەد دیوار بەری دەدا. زۆر سەرما بوایە بۆڕییەکان دەتەقین و بەفر بارییا دڵۆپە دەبوو. بە یەک مەکینە ئاو گەرم دەکرا و بە هۆی پاشەکەوتەوە کەم وا ڕێک دەکەوت ئاوی گەرم هەبێ. خەڵکی بە خۆیان وەستاییان نەکردبا دەبوو شارەوانی ئاگادار بکرێتەوە. بۆ چاکردنەوەی چوارچێوەی پەنجەرەش بووبێ، دە ساڵی دەبرد تا دەهاتن و چاکیان دەکرد.

پارسۆنز خانم، بە دەنگێکی نارەوان گوتی: "بۆیە تۆم عەزێت دا چونکە (تۆم) لە ماڵێ نییە". شوقەی خێزانی پارسۆنز لەوەی وینستۆن گەورەتر بوو بەڵام ناپوختەتریش بوو. دەتگوت دڕەندەیەکی بەهێز وگەورە بەژوور کەوتووە و هەموو شتێکی تێک داوە. جۆرەها بابەتی وەرزش و داردەست و دەسکێشی بۆکسێن بەو ناوەدا پەرت ببوون. لەگەنی پۆخڵ و کتێبە کۆنی وەرزش لە سەر مێزەکە بوون. بە دیوارەکەشەوە، ئاڵای سووری لاوان و خەفیەکان، و وێنەیەکی (ڕێبەری گەورە) هەڵواسرابوون. بۆنی بەردەوامی کەلەمی کوڵاو، بۆنی ئاشنای بیناکە، هەموو دەمێ بە لووتدا دەهات. بەڵام لەوێ، بۆنێکی کەسکوونی

عارەقەشی تێکەڵ بوو  هەرچەندە هاسانیش نەبوو، بەڵام بنیادەم لە یەکەم هەناسەیدا دەیزانی – کە عارەقەی کەسێ بوو، ئەو دەمە لەوێ نەبوو. لە ژوورەکەی دی، یەکێ، بە شانەیەک و پارچە کاغەزێکی ئاودەست، ئاوازی لە گەڵ تەلەسکرینەکەدا ڕێک دەخست.

پارسۆنز خانم، نیوەی لەشی لە دەرگاکەوە وەژوور خست و گوتی: منداڵەکانن. ئەوڕۆکە دەرنەکەوتوون... ئێ خۆ...

وا ڕاهاتبوو لە نیوەی ڕستەدا قسەی خۆی بقرتێنێ. قاپشۆری مەتبەخەکە پڕ بوو لە ئاوێکی پیس و سەوز کە بۆنی لە بۆنی کەلەمی کوڵاو ناخۆشتر بوو. وینستۆن کەوتە سەر چۆک و پێچی بۆڕییەکەی سەح کردەوە. داچەمینەوەش کە هەمیشە وەکۆخەی دەهێنا، وەڕسی دەکرد. پارسۆنز خانم، دەسەوەستان بە دیاریەوە وێستابوو.

ئەگەر (تۆم) لە ماڵەوە بوایە یەکسەر چاکی دەکرد. حەز لەم جۆرە کارانە دەکا. هەر وا مەهارەت لە دەست وپەنجەی دەبارێ!.

پارسۆنز، لە وەزارەتی ڕاستیدا هاوکاری وینستۆن بوو. قەڵەو بوو بەڵام گورجوگۆڵیش بوو. لەو بابەتە بوو کە گێل و دەبەنگ دەهاتە بەرچاو. گوێ لە مشت، پترلە پۆلیسی خەیاڵ کاری بۆ پتەوکردنی حیزب دەکرد. تازە سیی و پێنج ساڵی پڕ کردبۆوە و بە بێ ڕەزامەندی خۆی لە یەکێتی لاوان وەدەر نرابوو، و پێش ئەوەی بشچێتە ئەو یەکێتیەوە، کارێکی وای کردبوو کە ساڵێک دوای سنووری تەمەنی بۆی هەبێ لە ڕێکخراوی خەفیەتیدا بمێنێ. لە وەزارەتی ڕاستیدا کارێکی دەکرد کە چ ژیری پێ نەوێ. لە لایەکی ترەوە لە کۆمیتەی وەرزش و کۆمیتەی مەشق و خۆپێشاندانی کتوپڕ و لیژنەی پاشەکەوت و هی تردا، ڕوخسارێکی چاک بوو. هەموو جارێ بە شانازییەوە باسی ئەوەی دەکرد کە لە ماوەی چوار ساڵی ڕابردوودا، هەموو ئێوارانێکی کۆبوونەوە، ئەوی لێ بووە. ڕووی لە هەر جێیەک دەکرد، بۆنی عارەقە تایبەتییەکەی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. کە ئەو جێیەشی بە جێ دەهێشت بۆنەکەی هەر دەما.

وینستۆن دەستێکی بە بورغوەکەدا هێنا و گوتی: سوکرسپانەتان هەیە؟.

پارسۆنز خانم گوتی:"سوکورسپانە"و ڕەق لە جێی خۆی وەستا. دوایی گوتی:

"نازانم، نا! وێ دەچێ منداڵەکان..."

دەنگی پۆتین و تەقە تەقی شتی دی، لە گەڵ منداڵەکاندا هاتنە ژووری دانیشتنەکەوە. پارسۆنز خانم سوکورسپانەی هێنا. وینستۆن بورغوەکەی کردەوە و کەڵافە موویەکی لە



بۆڕیەکە دەرهێنا. بە ئاوی سارد، چەندی پێ کرا دەست و پلی پاک کردنەوە و چووە ژوورەکەی دی. دەنگێکی گڕ، بە نەعرەتەی دڕندانەوە گوتی:" دەست بەرز کەرەوە!" کوڕێکی نۆ ساڵەی جوانکیلە، بەتفەنگە دەسکردەکەیەوە، هەڕەشەی لە قەرەقۆزەکەی خۆی دەکرد. خوشکەکەشی کە دوو ساڵان لەو منداڵتر بوو، بە کوتە دارەکەی دەستی، وەک ئەوی کرد. هەردووکیان پانتۆڵی شینیان لە پێ بوو و کراسی خۆڵەمێشییان لە بەر بوو و سەرو ملپێچی سووریان لە مل بوون. ئەو جۆرە پۆشاکە هی خەفیەکان بوو. وینستۆن بە شڵەژاوی دەستی هەڵبڕی. ڕەفتاری کوڕەکە هێندەی بەڕاست دەچوو قەت بە گەمەی نەدەکرد.

منداڵەکە شیڕاندی:" تۆ خایەنیت! تۆ تاوانباریت! تۆ جاسوسی ئەوروئاسیای!. ڕەمیت دەکەم... دەتکەم بە هەڵم! بۆ ناو چاڵە خوێت دەنێرم!" هەردووکیان بە دەوری وینستۆندا دەخولانەوە و هاواریان دەکرد: "خایەن!" و "تاوانباری خەیاڵ!". کیژەکە، لە گشت ڕەفتارێکیدا لاسایی براکەی دەکردەوە و بە جۆرێ لە جۆرەکان، ترسناک بوو. وەک بەچکە پڵینگ بوون کە زوو پێدەگەن و دەبنە پیاوخۆر. توندوتیژییەکی حسێب بۆ کراو لە چاوی کوڕیژگەکەدا دەبیندرا. پێ دەچوو هەر ئێستا نا نەختێکی تر پڕ بداتە وینستۆن و بە شەق تێی کەوێ. هێندەش گەورە ببوو ئەوەی پێ بکرێ. وینستۆن بیری دەکردەوە: هەر باشە چەکی ڕاستەقینەی پێ نییە!.

پارسۆنز خانم بە سەرسوڕمانەوە، جارێ لە منداڵەکانی دەڕوانی جارێ لە وینستۆن. وینستۆن،لە ژووری دانیشتندا، لە بەر ڕووناکیەکە ڕوخساری ژنەکەی دی کە بە ڕاستی گەردی لێ نیشتبوو. گوتی :"زۆر چاوقایمن. خەمیانە عیدامکردنی خەڵکیان نەدیوە. بەخۆم فریا ناکەوم و (تۆم)یش زوو دەستی لە کار بەر نابێ". کوڕیژگەکە، بە دەنگە گڕەکەی گوتی: "بۆ نابێ تەماشای هەڵواسینی خەڵک بکەین ها؟!" کیژەکەش هەڵدەبەزییەوە و دەیگوت: "دەمانەوێ عیدامکردن ببینین... عیدامکردن ببینین!."

وینستۆن وەبیری هاتەوە کە ئەو ئێوارەیە کۆمەڵێ دیلی ئەوروئاسیایی و تاوانبارانی شەڕ، لە گۆڕەپانەکەدا هەڵدەواسرێن. مانگی جارێ شتێکی وا ڕوو دەدا و ئەو خەڵکەش زۆریان پێ خۆشە. هەردەم منداڵان بۆڵەیان دەهات و دەیانویست بچن سەیر کەن. ماڵاوایی لە پارسۆنز کرد و ڕێی خۆی گرتە بەر. هێشتا هەشت هەنگاوی نەنابوو، شتێ بەر پشتەملی کەوت و ئازارێکی زۆری پێ گەیاند. دەتگوت تەلێکی سوورکراوەی پێدا چزا.

وەرچەرخایەوە. فریای ئەوە کەوت پارسۆنز خانم ببینێ کە کوڕەکەی دەبردە ژووریّ و کوڕەکەش تیروکەوانەکەی دەخستە بەرکی. بەر لەوەی دەرگا داخرێ، کوڕەکە قیژاندی: "هەی گۆڵدستەین!". وینستۆن، پتر خەمی ئەو دایکە کلۆڵە ڕوخسار گەرداوییەی بوو.

لە شوقەکەی خۆیدا، بە خێرایی بە بەردەم تەلەسکرینەکەدا ڕەت بوو و چووە سەر مێزەکە و لێی دانیشت. هێشتا هەر دەستی بە پشتەملیدا دێنا. مۆسیقای تەلەسکرینەکە بڕابۆوە و دەنگێکی گڕی سەربازانەی پچڕ پچڕ، بە تام و چێژەوە باسی چەکی " قەڵای سەرئاو – Floating fortress"ی تازەی دەکرد کە لە ئایسلاندا و "دوورگەکانی فارو Faro Keland" دا لەنگەریان گرتبوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەو ژنە بێ نەوایە، بەو منداڵانەوە ژیانێکی تاڵ دەگوزەرێنێ. یەک دوو ساڵی تر نابا ڕەفتار و کرداری جۆراوجۆری دەخەنە ژێر دیقەت. زۆربەی منداڵی ئەم عەیامە لاسارن. لە هەمووی خراتر ئەوەیە کە هەر لە منداڵییەوە، وەک بێچوە دڕندە،لەڕێی ئەنجومەنی خەفیەگەرێتییەوە ڕایان دەهێنن و وایان لێ دێ قەت لە دەستووری حیزب لانەدەن. بە پێچەوانەوە، حیزب و هەموو شتێکی سەر بە حیزب دەپەرستن. گۆرانی و مەشق و ڕاهێنان و چەکی گەمە و دروشمەکان و ڕێبەری گەورە، هەموویان یاری خۆشی منداڵانن. هەموو کینە و ڕقیان ئاراستەی دەرێ دەکرێ. ئاراستەی دوژمنانی وڵات وبێگانە و خایەن و گێرەشێوێن و تاوانبارانی خەیاڵ دەکرێ. ئەمەش هۆی خۆی هەیە. حەفتە نییە (تایمز) وێنە و هەواڵ دەربارەی گوێ هەڵخستنی هەواڵچنی گچکە(منداڵە قارەمانەکان) کە زاراوەیەکی باوە، بڵاو نەکاتەوە و باوک و دایکی خۆیان ڕەوانەی (پۆلیسی خەیاڵ) نەکەن.

تۆزانەوەی جێی تیرەکە نەمابوو. قەڵەمەکەی بە دەستەوە گرتبوو و نەیدەزانی شتێکی تری بۆ نووسین پێیە یا نا. لە پڕ (ئۆبراین)ی وەبیر هاتەوە. چەند ساڵێ لەوەوبەر – چەند ساڵ لەوەوبەر؟. دەبێ حەوت بووبێ – خەونی دیبوو. بە ژوورێکی تاریکی ئەنگوستەچاودا دەڕۆیی. یەکێ لەوێ دانیشتبوو، پێی گوت:" لەو جێیە یەکتر دەبینین کە تاریکی لێ نییە."بەوپەڕی هێمنییەوە وای گوت – بە هێمنی ئەوەی گوت نەک بە شێوەی فەرمان. وینستۆن لێی ڕەت ببوو. سەیر لەوەدا بوو ئەو دەمە، لە خەونەکەدا، ئەو گوتانە کاریان تێ نەکردبوو. پاش زەمانێ وشەکان، خانەی وێژەیی خۆیان گرتەوە. نەیدەزانی پێش ئەو خەونە یا دواتر بۆ یەکەم جار (ئۆبراین)ی دیوە. نەشیدەزانی کەنگێ ئاشنایەتی لە گەڵ لەرەی دەنگی ئۆبرایندا پەیدا کرد. بە هەرحاڵ، دەنگی دەناسییەوە. ئەوە دەنگی ئۆبراین بوو کە لە تاریکییەکەدا ژنەوتبووی.



هەرگیز وینستۆن لەوە دڵنیا نەبوو کە ئۆبراین دۆستە یا دوژمن. تەنانەت ئەو بەیانییەش کە چاویان لێک بڕی مەحاڵ بوو دڵنیا بێ. مەسەلەکە زۆریش گرینگ بوو. پەیوەندی و لێک حاڵیبوونیان لە سۆز و هاوسەنگەری گرینگتر بوو. ئەو پێی گوتبوو: "لەو جێیە یەکتر دەبینین کە تاریکی لێ نییە. "وینستۆن بۆی لێک نەدەدرایەوە بەڵام دڵنیا بوو کە بە شێوەیەک لە شێوەکان دێتە دی.

تاوێ دەنگی تەلەسکرینەکە بڕا. دەنگی کەڕەناوی خۆش و لە سەرخۆ و ساف بە ژوورە کپەکەدا بڵاو بووەوە. دەنگێکیش بە بەردەوامی دەیگوت:

– گوێ بگرن!... بێ زەحمەت گوێ بگرن!. ئێستا بروسکەی هەواڵەکان لە بەرەی (مالابار)ەوە گەیشت. هێزەکانمان لە هیندی خوارووی سەرکەوتنێکی مەزنیان بە دەست هێناوە. دەکرێ بڵێین ئەو چالاکیانەی کە باسیان دەکەین، کارێکی وا دەکەن بەم زوانە کۆتایی بە شەڕ بێ. ئەوە هەواڵەکان بوو.

وینستۆن لە دڵی خۆیدا گوتی: "هەواڵی خراپ بەڕێوەیە." هەر واش دەرچوو. دوای ڕاگەیاندن و باسکردنێکی شەڕانی، ڕاگەیەندرا کە لە حەفتەی داهاتووەوە، جیرەی شوکلاد لە سیی گرامەوە دەبێتە بیست.

وینستۆن پەڵە دوکەڵێکی تری بە بادا دا. کاریگەرێتی (جن)ەکە کەم دەبوو وهەستی تێکشکان جێی دەگرتەوە. تەلەسکرینەکە – ڕەنگە لە خۆشی سەرکەوتنە مەزنەکە، یا لە داخی شوکلادی لە دەسچوو بووبێ – دەستی کرد بە چرینی "ئۆقیانووسیا لە پێناوی تۆدا". بە هۆی ئەو سروودەوە، دەبوو بە حورمەتەوە، بە پێوە بوەستێ. بەڵام وینستۆن لەو جێیەوە نەدەبیندرا.

"ئۆقیانوسیا لە پێناوی تۆدا" جێی بۆ ئاوازێکی ئارامتر چۆڵ کرد. وینستۆن چووە لای پەنجەرەکە و پشتی کردە تەلەسکرینەکە. هێشتا سارد و خۆرەتاو بوو. لە جێیەکی زۆر دوور بۆمبایەک تەقییەوە. ئەو ماوەیە، حەفتەی بیست سیی بۆمبا بەر لەندەن دەکەوت. لە خوارێ، لە سەر شەقامەکە، بایەکە ڕۆژنامە و پۆستەری دەهێنا و دەبرد. گوتەی "سۆسینگ" دەردەکەوت و دادەپۆشرا. "سۆسینگ" بناغەی پیرۆز، "سۆسینگ"، "گوتەی نوێ" و "باوەڕی دووفاقانە" دەگۆڕان. هەستی دەکرد لە ناو جەنگەڵێکی بنی دەریادا ڕێ دەکا و لە دنیایەکی تۆقێنەردا ون بووە و بەخۆی دێوەزمەی خۆیەتی. بە تەنها بوو. ڕابردوو مردبوو. پاشەڕۆژ شتێ نەبوو بزانێ چۆنە. هەستی بە دڵنیایی دەکرد کە مرۆڤێکی زیندوو

هەیە و لایەنگرێتی. کێ دەیزانی دەسەڵاتی حیزب درێژەی نابێ؟. سێ دروشمەکەی حیزب کە بە قەد وەزارەتی ڕاستییەوە بوون وەڵامیان دەدایەوە:

شەڕ ئاشتییە

کۆیلایەتی ئازادییە

نەزانیی هێزە

بیستوپێنج سەنتییەکی لە گیرفانی دەرهێنا. لە سەر ڕوویەکی دراوەکە، هەر سێ دروشمەکە بە جوانی نەخش کرابوون. ڕووەکەی تریشی سەری ڕێبەری گەورەی پێوە بوو. تەنانەت لە سەر دراویش ئەو چاوانەت بە دواوە بوون. لە سەر دراو، بە پووڵەوە، لە سەر بەرگی کتێب، بە ئەفیش، ڕەسمەکان، لە سەر گڵۆزە جگەرە. لە هەموو جێیەک، هەموو دەمێ چاو تێت ڕادەمان و دەنگ دەیانپێچایتەوە. بە نوستویی، بە ئاگایی، لە کاتی کاردا، بە دەم نانخواردنەوە، لە دەرەوە یا لە ماڵەوە، لە گەرماو یا لە سەر تەختەی نوستن – ڕێی دەربازبوون نەبوو. هیچ شتێ هی خۆت نەبوو چەند سانتیمەترێکی سێجای ناو کەللەسەرت نەبێ...

خۆرەکە سوڕابۆوە و پەنجەرە لە ژمارەنەهاتوەکانی وەزارەتی ڕاستی کە ئیدی هەتاویان بەر نەدەکەوت بە کونی دەربازبوونی قەڵا دەچوون. دڵی وینستۆن لە ئاستی دیمەنی وەک هەرەمی وەزارەتەکە، فرکەفرکی پێ کەوت. زۆر مەحکەم بوو و کاولکردنی مەحاڵ بوو. هەزار بۆمباشی بەرکەوێ هیچی لێ نایا. سەر لەنوێوە بیری کردەوە، یاداشتی خۆی بۆ کێ بنووسێ. بۆ داهاتوو، بۆ ڕابردوو – بۆ زەمانێکی خەیاڵی. مردن بەرانبەری نەبوو بەڵکو قڕکردن هەبوو. یاداشتەکانی دەبنە خۆڵەمێش وبەخۆشی دەبێتە هەڵم. بەرلەوەی یاداشتەکانی مەودای هۆشی جێ بهێڵن و بنووسرێن، هەر پۆلیسی خەیاڵ دەیانخوێننەوە. پیاو چۆن پێی دەکرێ دەستودامێنی پاشەڕۆژ کەوێ، لە کاتێکدا شوێنەواری خۆی و ئەوەی نووسراویشە نەمێنێ؟!.

تەلەسکرینەکە چواردەی لێ دا. دەبێ دە دەقیقەی دی وەڕێ کەوێ. دەبێ چواردە و سیی دەقیقە، لە سەر کارەکەی بێ.

پێ دەچوو زەنگی سەعاتەکە گیانی وەبەر هێنابێتەوە. ئەو، تارماییەکی تەنها بوو و ڕاستییەکی دەگوت هەرگیز کەس نەیدەبیست. بەڵام تا ئەم، ئەو ڕاستییە بە زاری خۆیدا ڕەت بکا، بەردەوامییەکی نەبیندراو دەمێنێ. مانەوەی میراتی مرۆ لەوەوە نییە کە گوێ



لە گوتە بگیرێ بەڵکو لەوەدایە کەهۆش لە کاردابێ.

بەرەو مێزەکە چووەوە. قەڵەمەکەی تەڕ کرد و کەوتە نووسین:

بۆ ئایندە یا ڕابردوو. بۆ سەردەمێ کە هۆشی تێدا ئازادە و مرۆ جوداوازییان لە نێواندا هەیە و بە تەنهایی ناژین – بۆ عەیامێ کە حەقیقیەت بوونی هەیە و کراو ناکرێتە نەکراو. لە دەورانی چونیەکییەوە، لە سەردەمی تەنهاییەوە، لە زەمانی ڕێبەری گەورەوە، لە سەردەمی باوەڕی دووفاقانەوە – لەگەڵ ڕێزدا!.

هەستی کرد مردووە و ئەو کاتە سەرەتایە. واتە ئەو دەمە کاتێ بوو، دەیتوانی دەسکاری بیری خۆی تێدا بکا و هەنگاویشی بۆ نابوو. ئەنجامی هەموو کارێک وا لە ناو خودی کارەکەدایە. نووسی:

"باوەڕی دووفاقانە" هەر بە سەرەنجامی مەرگت ناگەیەنێ، "باوەڕی دووفاقانە" بەخۆی مەرگە.

لەو ساتەدا کە خۆی بە مردوو دادەنا، زۆر گرینگ بوو تا پێی دەکرێ خۆی بە زیندوویی ڕاگرێ. دوو پەنجەی بە مەرەکەبەوە ببوون. ئەوەش دوور نەبوو ئاشکرای بکا. مارێکی گەرمەتەریقەتی وەزارەت (با بڵێین ژنێ. یەکێکی وەک ئەو ژنە قژکاڵە یا کچە قژرەشەکەی دەزگای هەڵبەستن) بە بیریدا بێ کە لە کاتی پشوودا نووسیویەتی و قەڵەمە کۆنی بەکار هێناوە. چی نووسیوە – هەر بە سەر ئیشارەتێ بکات بەسە. چووە گەرماوەکەوە و بە سابوونێکی قاوەیی تۆخی زبر کە وەک سیمپارە دەستی دەڕنی و بۆ ئەم مەبەستەی چاک بوو، دەستی پاککردەوە. دەفتەری یاداشتەکەی خستەوە شوێنی خۆی. بیرکردنەوە لە شاردنەوەی، هەر زۆر بێ هوودە بوو. بەڵام هەر هیچ نەبێ بەو کارەی دەیزانی پێی زاندراوە یا نا. تاڵە موویەک، بۆ نیشانەکردن دەبیندرا. بە سەری پەنجەی، کەمێ گەردی سپی لەسەر گۆشەیەکی بەرگی کتێبەکە دانا. ئەگەر دەست بە کتێبەکەوە بدرێ گەردەکەی لە سەر لادەچێ.

## ٣

وینستۆن خەونی بە دایکیەوە دەدی.

پێی وا بوو ئەو دەمە کە دایکی سڕنوگوم کرا، ئەم دە یا یازدە ساڵان بوو. دایکی ژنێکی کەڵەگەتی کەمدووی لە پەیکەرچووی هێمن و قژ خەنەیی بوو. بە شێوەیەکی تەماویتر باوکی وەبیر دەهاتەوە. پیاوێکی ڕەشتاڵەی باریکەلە بوو و هەمیشە دەمێ جلی تۆخ و ڕێکوپێکی لە بەر دەکرد. وینستۆن، زیاتر بنی پێڵاوەکانی بیر دەهاتنەوە کە زۆر تەنک بوون. باوکی چاویلکەشی لە چاو دەکرد. پێ دەچوو دایک و باوکی، لە سەرەتای ڕاپەڕینەکانی پەنجاکاندا گوم بووبن.

لەم خەونەیدا... دایکی لە جێیەکی قووڵی ژێر ئەمدا دانیشتبوو، و خوشکە بچکۆلەکەشی لە ئامێز بوو. وەک منداڵێکی کۆرپەی بچکۆلەی هێمن و چاو وریا نەبێ خوشکەکەی نەدەدی کە هەردەم بێ دەنگ بوو. بە جووتە سەریان هەڵبڕیبوو و لەمیان دەڕوانی. لە جێیەکی قووڵی ژێر زەویدا بوون – لە بنی بیرێک یا چاڵێکی قووڵدا بوون – بەڵام جێیەکەیان ڕێگایەکی سەرەوخوار بوو. لە ناو ساڵۆنی کەشتییەکی نقومبوودا بوون. ساڵۆنەکە هەوای تێدا مابوو و جارێ ئەمیان پێ دەبیندرا و ئەمیش ئەوانی دەدی. ئەوان، بەردەوام لە نقومبووندا بوون و بە ناو ئاوە کەسکەکەدا ڕۆدەچوون و ڕۆدەچوون ولە هەموو چرکەیەکدا وێ دەچوو بۆ هەمیشە لە چاوان ون بن. ئەم لە دەرەوە، لەبەر ڕووناکی و لە ناو هەوادا بوو و ئەوانیش، بەرەو ناو گەرووی مەرگ ڕۆدەچوون. ئەوان لە خوارەوە، لە ناو قووڵاییدا بوون چونکە ئەم لە سەرەوە بوو. ئەم، ئەو ڕاستییەی دەزانی و ئەوانیش پێیان دەزانی. ئەم، زانینەکەی ئەوانی لە ڕوخساریاندا دەدی. نیشانەی لۆمەکردنیان پێوە دیار نەبوو و لە دڵیشیاندا نەبوو. هەر ئەوەیان پێوە دیار بوو کە دەیانزانی دەبێ بمرن تا ئەم بژێ. ئەوەش لایەکی پەیوەندی (بوون)ەکان بوو و خۆ لێ لادانی مەحاڵ بوو.

نەیدەزانی چ ڕووی داوە بەڵام لە خەونەکەدا درکی بەوە دەکرد کە ژیانی دایکی وخوشکەکەی، بە جۆرێ لە جۆرەکان بوونەتە قوربانی ژیانی ئەم. خەونەکەی لەو بابەتە خەونانە بوو کە دەوروبەرێکی زیندوو و بەردەوام پێک دەهێنێ. لەو بابەتە بوو کە بەردەوامی زیندەخەونە و دوای وەئاگا هاتنەوەش بایەخی دەمێنێ و بە زیندوویی دەمێنێ. ئەوەی لەو ساتەدا بە بیری وینستۆندا هات ئەوە بوو کە مەرگی دایکی بەرلە سیی ساڵ، تراژیدیایەکی وابووە کە ئێستا ئیمکانی ڕوودانی نییە. پێی وابوو کە تراژیدیا گرێدراوی



سەردەمی بەسەرچووە، سەردەمی حەسانەوە و سۆز و ئەوین، ئەو سەردەمەی کە ئەندامانی خێزان، بێ ئەوەی بە دوای بەڵگەی لۆژیکیدا بگەڕێن، بە پەنای یەکەوە بوون. یادی دایکی دڵی دەرووشاند. ئاخر دایکی لە خۆشەویستی ئەمدا نقوم بوو و ئەمیش ئەوەندەی هۆش نەبوو ئەو سۆزەی لە عاستیدا هەبێ. دایکی، بە شێوەیەک – ئەم پەی پێ نەدەبرد چ شێوەیەک – خۆی بە قوربانی وەفادارییەک کردبوو کە تایبەتی و نەگۆڕ بوو. دەیزانی شتی وا لەو سەردەمەدا ڕوو نادا. ئەمڕۆ ڕۆژی ترس و ڕق و ئازارە، نەک ڕۆژی هەست و خەمی هاوبەشی ڕەگداکوتاو. هەموو ئەوانەی لە چاوی دایکی وخوشکەکەیدا دەخوێندەوە کە لە بنی ئاوە سەوزەکەوە، کە سەدان پێ قووڵ بوو، لێی ڕادەمان و نقوم دەبوون.

لە ناکاو، خۆی لە ناو چیمەنێکی نەرمونیانی دوانیوەڕۆیەکی هاویندا دی. تیشکی هەتاو، بە لاری، چیمەنەکەی جوان کردبوو. ئەو ناوەی کە لە بەرچاوی بوو، هێند لە خەونەکانیدا دووپات ببۆوە ئیدی لێی گۆڕابوو و نەیدەزانی لە خەونیدا دیتوە یا دەبێ جارێ بە ڕاستی دیبێتی. کە وەئاگا بوایە بەو جێیەی دەگوت "زەوی زێڕین". چەمەنزارێکی پان و بەرین بوو. لەوەرگەی کەروێشک بوو، ڕچەڕێی بە پێچ وگردۆلکەی کونە جرج لێرە و لەوێی هەبوون. لە قەراغ پەرژینەکانەوە، چلّی دارەبەند بە دەم باوە دەلەرانەوە و گەڵایان وەک قژی ژنان با بای دەدان. لە جێیەکی ئەو دوورە، ڕووبارێکی هێمن و ڕۆشن ڕەت دەبوو و ماسی گچکە گچکە وەک شێت مەلەیان لە ناو چاڵاوە سەوزەکانی بن دارەکانی قەراغیدا دەکرد.

کچە قژ ڕەشەکە، بە ناو چیمەنەکەدا بەرەو ڕووی ئەم دەهات. هەر وای کرد و جلەکانی لە بەر خۆی داماڵاند و بە تورەیی وەلای نان. لەشی سپی و جوان بوو بەڵام ئارەزووی ئەمی نەدەبزواند. لە ڕاستیدا، بە تەواوی تەماشای نەدەکرد. ئەوەی لەو ساتەدا سەرنجی ئەمی ڕادەکێشا شێوەی جل داماڵاندنەکەی بوو. ئەو جەستە جوانە فریودەرە، پێی دەکرا بە بزواندنی باسکێ، هەموو فەرهەنگ و سیستەمی فکری و ڕێبەری گەورە و حیزب و پۆلیسی خەیاڵ بە تەواوی گسک دا و ڕایانماڵێ. بزووتنی وا پەیوەندی بە ڕابردووەوە بوو. وینستۆن بە دەم گوتنی وشەی (شکسپیر)ەوە، وەئاگا هاتەوە.

تەلەسکرینەکە جیکەجیکێکی گوێکەڕکەری بەردەوامی بۆ ماوەی نیو دەقیقە لێوە هات. سەعات حەوت و چارەک بوو و کاتی ڕابوونی فەرمانبەران بوو. وینستۆن بە ڕووتی لە ناو پێخەفەکەیەوە دەرکەوت. ڕووت بوو چونکە ئەندامی حیزب لە ساڵێکدا ٣٠٠ کۆپین پتری

بۆ بەرگ پێ نەدەدرا و دەستێ بیجامەش ٦٠٠ ی تێدەچوو. فانیلە چڵکنەکەی کە بە سەر کورسییەکەوە بوو، لەبەر کرد. سیی دەقیقەی دی وەرزش دەستی پێ دەکرد. هێرشی کۆخە کە هەموو بەیانیانێک بە سەری دەکردەوە، پێچایەوە. کۆخە سییەکانی وا لە هەوا بەتاڵ دەکرد مەگەر بە پاڵەوە بیتوانیبا هەناسەی وەبەردا بێتەوە. دەمارەکانی لاملی ڕەپ دەبوون و کۆنە برینەکەی پێی وە خروو دەکەوت.

دەنگێکی ژنانەی تیژ لە تەلەسکرینەکەوە هات: "دەستەی سیی تا چل!... دەستەی سیی تا چل! تکایە لە جێی خۆتان بوەستن. سیی تا چل!". وینستۆن بە گورجی هەستا و لە بەردەم تەلەسکرینەکەدا وێستا. وێنەی ژنێکی گەنجی ڕوخسار لاوازی بە ماسولکە، بە کراسی کورت و پۆتینەوە، لە سەر تەلەسکرینەکە دەرکەوتبوو. فەرمانی دا: "باسکتان ڕاست ڕاگرن، بیچەمێننەوە! یالڵا لەگەڵ مندا: یەک، دوو،سێ، چوار!یالڵا هاوڕێیان گورج وگۆڵ بن. یەک، دوو، سێ، چوار! یەک، دوو، سێ، چوار!..."

ئازاری کۆخە، بە تەواوی خەوی وینستۆنی نەڕەواندبۆوە بەڵام وەرزش، کەمێ هێنایەوە سەر خۆ. لەگەڵ بەرەو دوا و بەرەو پێشەوە بردنی مەکینانەی بازوویدا، بەختەوەری بە سیمای خۆی دەدا کە لەگەڵ وەرزشەکەدا لێک دەهاتن. هەوڵی دەدا خەیاڵی خۆی، بەرەو سەردەمی تەماوی منداڵی بگێڕێتەوە بەڵام زۆر زەحمەت بوو. پێش کۆتایی پەنجاکانی لە خەیاڵدا سڕدرابۆوە. ئەگەر تۆمارکراوی دەرەکی و ئەسبابی پێداچوونەوەت نەبێ پەنایان بۆ بەری، شێوەی ژیانی خۆتیش کاڵ دەبێتەوە. ڕووداوی گەورەت بیر دەکەونەوە کە لە ڕاستیدا ڕوویان نەداوە. ڕووداوێ بەیاد دەکەی کە ناتوانی بگەڕێیتەوە سەر دەور و بەرەکەی و شێوەی ڕوودانی. دەورانێ لە نێواندا بوو کە هیچ شتێ بە تەختە سپییەکەیەوە نەنووسرابوو. دەڵێی هەموو شتێ بە (ئێستا)وە پەیوەستە. بنکەی فڕگەی ژمارە یەک ئەم ناوەی ئێستای نەبوو، ناوی ئینگلستان یا بەریتانیا بوو و تا ڕادەیەک لەوە دڵنیا بوو کە لەندەن هەر ناوی لەندەن بوو. وینستۆن سەردەمێکی لە یاد نەبوو وڵاتەکەی لە شەڕدا نەبووبێ. دەیزانی لە سەردەمی منداڵی ئەمدا، مەودایەکی دوورودرێژی ئاشتی هەبووە، چونکە لە بیری بوو هێرشێکی کتوپڕی عاسمانی خەڵکی، سەرسام کرد . ڕەنگە ئەو دەمە بووبێ کە بۆمبای ئەتۆم بە سەر (کۆلچستەر – Colchester) دا بەردرایەوە. بەخۆی هێرشەکەی لە بیر نەبوو بەڵام لە بیری بوو کە باوکی توند دەستی گرتبوو و بە پەلە، بە قاڵدرمەیەکی پێچاوپێچدا بەرەو جێیەکی قووڵ دەچوون و دەچوون. پلەکان لە ژێر پێیدا دەنگیان دەهات. لە دوادوایی پلەکاندا، هێند ماندو ببوون، ناچار بوون پشووی بۆ بدەن.



دایکیشی بە شێوە هێمن و خەیاڵییەکەی خۆی، بە دوایاندا دەهات – خوشکە بچکۆلەکەی لە ئامێز بوو – نەیدەزانی ئەو دەمە تازە خوشکەکەی لە دایک ببوو یان نا. ئیدی لە پڕ، لە ناو حەشاماتێکدا خۆیان گرتەوە و دەرکەوت ئەوێ ژێرخانێکی پەناگەیە.

خەڵکی لە سەر عەردە بە بەرد داڕێژراوەکە دانیشتبوون. هێندێکی دی، بە پڕیو چڕی لە سەر قەرەوێڵەی میتاڵی بە سەریەکەوە هەڵچندراو دانیشتبوون. وینستۆن و دایک و باوکی، جێیەکیان لە سەر زەوییەکە بۆ خۆیان گرت. پیرەمێردێک و پیرەژنێکیش بە پەنای یەکەوە، لە نزیک ئەمانەوە، بە جووتە دانیشتبوون. پیرەمێردەکە دەستێ جلی جوان و ڕێکی لە بەر بوو و کڵاوێکی ڕەشی لەسەر نابوو کە مووی سپی لێوە دەرکەوتبوو. ڕوخساری سورخن بوو و چاوی شین و ئاوتێزاو بوون. بۆنی (جن)ی لێ دەهات و دەتگوت لە بری عارەقە (جن) لە پێستیەوە دێ و فرمێسکیشی (جن)ی ڕووتە. هەرچەندە کەمێ خومار بوو بەڵام بە دەست خەمێکی گرانەوە، کە لە توانای خۆی بەدەر بوو، حەلوەلای بوو. وینستۆن، بە هۆشە منداڵانەکەی خۆی دەیزانی شتێ قەوماوە کە قەت خۆش نابێتەوە. پێشی وابوو کە دەیزانی چ قەوماوە. خۆشەویستێکی پیاوە پیرەکە، ڕەنگە کچەزایەکی بچکۆلەی، کوژراوە. هەر چەند دەقیقە و جارێ، پیاوە پیرەکە دووپاتی دەکردەوە: "نەدەبوو باوەڕیان پێ بکەین، چاوت لێ بوو دایە؟. ئەمە ئەنجامی باوەڕپێکردنیانە. هەموو دەمێ گوتوومە... نابێ باوەڕ بەو تەڕەماشانە بکەین". وینستۆن بیری چووبۆوە کە دەبوو باوەڕ بە کیهە تەڕەماش نەکرێ.

لەوکاتەوە، شەڕ بەبێ بڕانەوە بەردەوام بوو با هەموو دەمێکیش لەگەڵ هەمان دوژمندا نەبووبێ. لە سەردەمی منداڵی ئەمدا، شەڕی شەقامەکان، ماوەی چەند مانگێ لە ناو شاری لەندەندا قەوما بوو و هێندێکیانی بە باشی لە بیر مابوون. بەڵام گەڕان بە دوای شێوە و هۆی قەومانیدا و ناسینەوەی بەرەی بەرانبەر، کاری نەکردە بوون. ئەوەش لە بەر ئەوە بوو کە بەڵگەی نووسراو لە بەردەست نەبوون و قسەی خەڵکیش هەر باسی دێوەزمەی سیاسەتی سەردەمەکە بوو. بۆ نموونە، ئێستاکە ساڵی (١٩٨٤)ە – ئەگەر بە ڕاستی (١٩٨٤) بێ – ئۆقیانوسیەکان لە گەڵ ئەوروئاسیادا لە شەڕدان و لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا هاوبەرەن. نە لایەنی ڕەسمی باسی ئەوەی دەکرد کە جارێ لە جاران ئەو سێ هێزە بە شێوەیەکی دی سەنگەریان گرتبێ نە خەڵکەکە. وینستۆن، دەیزانی کە بەر لە چوار ساڵ ئۆقیانوسیەکان دژی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، لەگەڵ ئەوروئاسیادا لە یەک بەرەدا بوون. ئەم پێزانینە بەرەڵایی و لادان بوو چونکە هۆشی ئەم بە تەواوی لە ژێر ڕکێفی دەوڵەتدا نەبوو.

ئۆقیانووسیەکان لە گەڵ ئەوروئاسیادا لە شەڕدا بوون. دوژمنی سەردەم، هەمیشە بە شەیتانی پەتی دەردەخرا و هەموو ڕێکەوتنێکی ڕابردوو و داهاتوو، لەگەڵیدا مەحاڵ بوو.

کارەسات لەوەدابوو- بۆ دەیەم هەزار جار بیری کردەوە و شانی بەرەو دواوە دەبرد (دەستیان لە سەر ڕان دادەنا و خۆیان با دەدا. ئەمەش بۆ ماسولکەی پشت چاک بوو) – کارەسات لەوەدا بوو پێ دەچوو هەموو ڕاست بن. ئەگەر حیزب بیتوانیبا دەست لە ڕابردوو وەردا و بڵێ ئەم یا ئەو کارەساتە قەت نەقەوماوە، ئەوە گەلێ لە ئازاری ئەشکەنجە و مەرگیش تۆقێنەرتر دەبوو.

"حیزب" دەیگوت: هەرگیز ئۆقیانووسی لەگەڵ ئەوروئاسیاییدا ڕێک نەبوون. ئەمیش (واتە وینستۆن سمیت) دەیزانی کە چوار ساڵ لەوەبەر، ئۆقیانووسیا و ئەوروئاسیا لە یەک بەرەدا بوون. بەڵام ئەو زانینە لە کوێ بوونی هەبوو؟. تەنها لە ویژدانی ئەمدا هەبوو و ئەمیش هەڵپەی ئەوەی بوو هەتا زووە نەیهێڵێ. ئەگەر هەموو بەڵگەنامەکان ئەودرۆیانەیان تۆمار بکردبایە کە حیزب دەیسەپاند، ئەوا درۆکان وەک ڕاستی دەچوونە ناو مێژووەوە – بە پێی دروشمی حیزب: "ئەوەی ڕابردوو دەستەمۆ بکا جڵەوی ئایندەی لە دەستدایە و ئەوەی بە سەر ئێستادا زاڵ بێ جڵەوی ڕابردووی بە دەستەوەیە" ڕووداوی هەمە جۆریش لە ئارادا بووبن، هەر نەگۆڕاون. ئەوەی ئێستا ڕاست بێ هەمیشە ڕاست بووە و بۆ هەمیشەش ڕاستە. مەسەلەکە زۆر ساکارە – ئەوەی پێویست بوو هەر ئەوە بوو کە سەرکەوتنی بێ بڕانەوەی یەک لە دوای یەک بە سەر هۆشی خۆتدا بە دەست بهێنی. لە گوتەی نوێدا بە جڵەوکردنی واقیع دەگوترا باوەڕی دوفاقانە.

مامۆستای وەرزش بە شێوەیەکی نەرمتر گوتی: "پشوو بدەن".

وینستۆن هەردوو باسکی شۆڕ کردنەوە و بەکاوەخۆ سییەکانی پڕ لە با کردن. بیری بۆ دنیای پڕ پێچ و پەنای باوەڕی دووفاقانە خزا. زانین و نەزانین، ئاگاداربوون لە ڕاستی ولە هەمان کاتدا درۆی دروستکراو کردن، باوەڕهێنان بە دوو باوەڕی دژ بە یەک لە هەمان کاتدا و بەگەڕخستنی لۆژیک دژی لۆژیک، بە درۆخستنەوەی ڕەوشت و باوەڕ پێهێنانی، باوەڕهێنان بەوەی کە دیموکراسییەت مەحاڵە وحیزب پاسەوانی دیموکراسییەتە، لەبیربردنەوەی هەر شتێ کە دەبێ لەبیر بکرێ، دوایی گێڕانەوەی لەبیرکراو بۆ ناو سنووری هۆش لە کاتی پێویستدا و پاشان لە بیربردنەوەی. لە سەرووی هەموو ئەمانەوە، داڕێژانی لۆژیک بۆ کارێک لە خودی کارەکەدا. سەرچاوەی ڕاستی گەمەکە ئەمە بوو: بە ئاگاداری



باوەڕهێنانی بێ هۆشانە. ئەوجا، جارێکی دی، بێ ئاگابوون لەو بێ ئاگاییەی کە ئەنجامت دا. تەنانەت باوەڕهێنان بە باوەڕی دووفاقانەش بە باوەڕی دووفاقانەوە گرێ درابوو.

مامۆستای وەرزش دیسان ئاگاداری کردنەوە. بە جۆشوخرۆشەوە گوتی: با بزانین کێ دەتوانێ دەستی بگەیەنێتە نووکی پێی. پشتتان بچەمێننەوە هاوڕێیان. یەک! دوو!... یەک! دوو!..." ئەم ڕاهێنانە، وەک تیر ئازاری بە وینستۆن، هەر لە پاژنەی پێیەوە دەگەیاند تا دەگاتە هەردوو گوڵمی و زۆر جاران، بە هێرشێکی تری کۆخە دەبڕایەوە. هۆشی، خەیاڵە خۆشەکانی لە دەست دەدا. بیری کردەوە: ڕابردوو نەک هەر گۆڕدراوە وبەس، بەڵکو ڕووداوەکان خۆ بە خۆی خۆیان سڕدراونەتەوە چونکە دەسەپێندرێن. دەیویست بیری بێتەوە چ ساڵێ بوو کە یەکەم جار ناوی ڕێبەری گەورە هاتۆتە ناو ناوان. پێی وابوو کە لە ساڵانی شەستەکانەوە بوو. بەڵام دڵنیابوون مەحاڵ بوو. لە مێژووی حیزبدا، ناوی ڕێبەری گەورە لە سەرەتای شۆڕشەوە، وەک ڕێبەر و پاسەوان هاتووە. ناوەکەی، وردە وردە گەڕێندرابۆوە دواوە، تا وای لێ هاتبوو دەگەیشتەوە ناو ئەفسانەی سییەکان و چلەکان کە هێشتا سەرمایەدارەکان، بە خۆ و شەپقەی لوولەییانەوە، بە ئۆتۆمبیلی گەورەی بریقەدار، یا گالیسکەی ئاوێنەبەندی دوای ئەسپەوە، بە شەقامەکانی لەندەندا تەراتێنیان بوو. مەحاڵ بوو بزاندرێ چەندی ئەو باسانە ڕاست بوون و چەندیشیان هەڵبەستراو بوون. وینستۆن، بیری نەدەهاتەوە کەی حیزب پەیدا بووە. پێی وانەبوو وشەی "سۆسینگ"ی بەر لە ساڵی ١٩٦٠ ژنەوتبێ. بەڵام لەوانە بوو بە شێوەی گوتەی کۆن، واتە – سۆسیالیزمی ئینگلیزی – ڕەواجی بووبێ. هەموو شتێ لە ناو تەمێکی چڕ و پڕدا ون بوو. لە ڕاستیدا، هێندێ جار دەکرا پەنجە بۆ هێندێ درۆ ڕاکێشرێ. بۆ نموونە، ئەوە ڕاست نەبوو کە لە مێژووی حیزبدا هاتبوو گوایە دروستکردنی فڕۆکە بۆ حیزب دەگەڕێتەوە. بەڵام چونکە چ بەڵگەیەکی دەرەکی بە دەستەوە نەبوو، نەدەسەپێندرا. لە گشت تەمەنیدا تەنها یەک جار بەڵگەیەکی مێژوویی کەوتە بەر دەست کە ڕاستییەکی مێژووی شێوێندراو بوو. ئەو جارەش...

دەنگێکی زیقن لە تەلەسکرینەکەوە بەرز بووەوە: "سمیت! ژمارە ٦٠٧٩ سمیت و! بەڵێ بەڵێ تۆ! بێ زەحمەت چاکتر بچەمێوە!. لەوە باشتریش دەتوانی!. هەوڵ نادەیت. بەرەو خوارتر! ئێستا چاکترە هاوڕێ. دەی ئەوجا هەمووان بە هێمنی بوەستن و سەیری من بکەن".

عارەقەی کتوپڕ و گەرم بە هەموو جەستەی وینستۆندا داچۆڕا. سیمای، بە تەواوی ڕەزامەندی پێوە دیار بوو. هەرگیز نارەزایی پێشان نەدەی! قینی خۆت دەر نەخەی! یەک تەماشاکردن بەسە بۆ وەی ڕاپێچ کرێی. وێستا و سەیری مامۆستای وەرزشی دەکرد کە باسکی لە ژوور سەرەوە – نەدەکرا بڵێی بە نەرمی، بەڵام بە وریایی و چالاکی – دادەگرت و پەنجەی دەستی دەخستنە ژێر پەنجەکانی پێی خۆی: "چاوتان لێیە هاوڕێیان؟ دەمەوێ گشتتان وا بکەن. جارێکی دی سەیر کەن! تەمەنم سیی و نۆ ساڵە و دایکی چوار منداڵم. تەماشا کەن! "دیسان خۆی نوشتاندەوە و بە دەم خۆڕاستکردنەوەوە گوتی: "دەبینن چۆکم نانوشتێنەوە؟ ئەگەر بتانەوێ ئێوەش پێتان دەکرێ. ئەوەی تەمەنی لە ژێر ٤٥ ساڵەوە بێ، بە هاسانی دەستی پێ دەگەیەندرێتە پەنجەی پێی. سەروەری ئەوەمان پێ نەبڕاوە لە ڕیزی پێشەوەی بەرەی شەڕدا بین. بەڵام بەلای کەمەوە دەتوانین ڕێکوپێکی جەستەی خۆمان بپارێزین. منداڵەکانتان وەبیر بێتەوە کە لە "مەلابار"، لە بەرەی شەڕدان. بیرلە کەشتیوانەکان بکەنەوە کە لە ناو ئاوە خوڕەکاندان. بزانە ڕووبەڕووی چ نارەحەتییەک بونەتەوە. ئێستا، لە سەرەوە تێهەڵچنەوە" و لەو کاتەدا، دوای ماوەی چەندین ساڵ، وینستۆن بۆ یەکەم جار دەستی گەیشتە پەنجەی پێی. مامۆستای وەرزش گوتی:"زۆر چاکترە هاوڕێ."



## ٤

وینستۆن، بە دەستپێکردنی کاری ڕۆژانەی، هەناسەیەکی قووڵی بێئاگایانەی هەڵکێشا. مەودای نزیکی نێوان ئەو و تەلەسکرینەکەش ڕێی ئەو هەناسە هەڵکێشانەی لێ نەگرت. ئەوجا دەزگای (بێژە و بنووسە)ی ڕاکێشایە بەردەمی خۆی وپفێکی لێ کرد تا گەردی لە سەر لابەرێ، و چاویلکەی لە چاو کرد. چوار قاقەزی لوولەیی غل کردنەوە بەردەمی خۆی کە لە لای ڕاستی مێزەکەوە بوون و بەدەم یەکەوەی قایم کردن.

دیوارەکانی ژوورەکەی وینستۆن، سێ دەلاقەی تێدا بوون. لە لای ڕاستی (بێژە و بنووسە)، کونێ بوو و لوولەیەکی لێوە هاتبوە دەرێ کە پەیامی فەرمانی پێدا دەهاتن. بە دیوارەکەی تەنیشتی خۆیەوە کە دەستی دەیگەیشتێ دەلاقەیەک بوو و بە پارچە چینکۆ قایم کرابوو. ئەمەیان بۆ فڕەدانی قاقەزی لە کار کەوتوو بوو. هەزاران، بگرە دەیان هەزار کونی وا لەو دایەرەیەدا هەبوون. نەک هەر لە ژوورەکاندا، بەڵکو لە ڕێڕەوەکانیشدا هەبوون. کە کەسێ دەیزانی فلانە نووسراو دەبێ لەناو ببرێ یا کوتە قاقەزێکی لە سەر زەوی بدیبا، دەبوو بە پەلە بیگەیەنێتە نزیکترین (چاڵی خەیاڵ)و تێی هاوێ. هەر فڕەدان و لووشدانی، بە هۆی بایەکی گەرمەوە بەرەو گەرووی فڕنێکی زەبەلاح کە جێی فەوتانی پسوولە و بەڵگەنامە بوو، یەک بوو. وینستۆن، لە نزیکەوە ڕوانییە هەر چوار قاقەزەکە. هەر یەکەیان دوو یا سێ ڕیزی لێ نووسرابوون. بە شێوەی (گوتەی نوێ) نە نووسرابوون و بە ئانقەست، بۆ مەبەستی نێوخۆیی، بە زمانی کۆن نووسرابوون. پەیامەکان وا بوون:

تایمز ٨٤/٣/١٧ گوتەی ڕ گ ئەفریقیا هەواڵ خراپ چاککردن.

تایمز ٨٣/١٢/١٩ پێشبینی پ ٣ س چارەکی چوارەم ٨٣ هەڵەی چاپ لە ژمارەکەدا.

تایمز ٨٤/٢/١٤ وەزافرا گوتەی ناڕاست لە شوکلاد ڕاست دەکرێتەوە.

تایمز ٨٣/١٢/٣ سەرنج ڕ گ فەرمانی ڕۆژ دوو هەندە ناچاک دەربارەی نائاشکراکان بە تەواوی نووسینەوەی بەر لە ئەرشیف.

وینستۆن پەیامی چوارەمی وەلا نا. کارێکی چاکی پڕ لە لێپرسینەوە بوو و وای پێ چاک بوو لە دوادواییدا ئەنجام بدرێ. سیانەکەی دی کاری ڕۆتینی ڕۆژ بوون هەرچەندە دووەمیان پێ دەچوو لیستەی ژمارەی بەسەرهێشەی بە دەمەوە بێ.

وینستۆن، لە تەلەسکرینەکەوە بەشی ئەرشیفی ئاگادار کردەوە کە ژمارەی دیاریکراوی

تایمزی فریا بخەن. دوای چەند دەقیقەیەک، لە لوولەی ڕۆژنامەوە هاتنە دەرێ. بە پێی ئەو فەرمانانەی پێی گەیشتبوون، پەیوەندییان بە هێندێ گوتارەوە بوو کە دەبوو لە بەر هێندێ هۆی پێویست بگۆڕدرێن یا بە پێی گوتەی ڕاستکردنەوە، هەستیان پێ دەکرا. لە تایمزی ١٧ ی مارتدا نووسرابوو: ڕێبەری گەورە، لە گوتەیەکی دوێنێیدا پێشبینی ئەوەی کردبوو کە بەرەی شەڕ لە خوارووی هیند بە ئارامی دەمێنێ. بەڵام هێزێکی ئەوروئاسیا، لەجیاتی وەی لە سەرووی ئەفریقیا بگیرسێتەوە، ئەوێی وەک خۆی هێشتەوە و چووە خوارووی هیند. لە بەر ئەوە دەبوو پەرەگرافێکی گوتەکانی ڕێبەری گەورە بە جۆرێ بنووسرێتەوە کە پێشبینییەکەی لەگەڵ ڕووداوەکاندا جووت بێ. هەروەها تایمزی نۆزدەی کانوونی یەکەم بەرهەمی کشتوکاڵی هەمەجۆری لە چوارەم وەرزیساڵی ١٩٨٣ دا کە لە هەمان کاتدا شەشەم چارەکی بەرنامەی سێ ساڵەی نۆیەم بوو بە ڕەسمی پێشبینی کردبوو. ژمارەی ئەمڕۆش، چەندایەتی ڕاستەقینەی بەرهەمی تێدا بڵاو کرابۆوە و وای دەرخستبوو کە لە هەموو خاڵێکدا هەڵەی گەلێ گەورە بووە. ئەرکی وینستۆن ئەوە بوو ئەو ژمارانەی ناو ڕۆژنامەکە وا ڕێک بخاتەوە کە لەگەڵ نوێیەکەدا ڕێک بێتەوە. سێیەمیان دەربارەی هەڵەیەکی هێند ساکار بوو، بە یەک دوو دەقیقە ڕێک دەخرایەوە. بەم دواییە، لە مانگی ڕەشەمێدا، وەزارەتی فراوانی بەڵێننامەیەکی (کە لە کاروباری بەڕێوەبردندا "بەڵێنی ڕواڵەت"ی پێ دەگوترا) بڵاو کردبۆوە و بەڵێنی ئەوەی تێدا درابوو کە لە ساڵی ١٩٨٤دا پشکە شوکلاد کەم ناکرێتەوە. هێندەی وینستۆن ئاگادار بوو لە کۆتایی ئەو حەفتەیەدا، پشکە شوکلات لە سیی گرامەوە بوو بە بیست. ئەوەی کە دەبوو ئەو بیکا هەر ئەوە بوو کە لە بەڵێننامەکەدا بڵێ دوور نییە لە مانگی نیساندا، بە پێی پێداویست پشکە شوکلاد کەم بکرێتەوە. کە وینستۆن لە گشت ئەرکەکانی خۆی بووەوە، ڕاستکردنەوەکانی تەلەسکرینەکەی بە (تایمز)ەکانەوە لکاند و کردنی بە کونەکەدا. دوایی، بە بزووتنێکی ئۆتۆماتیکی ڕەشنوسەکانی فیچاندنەوە و هەمووی هاویشتنە گەرووی (چاڵی خەیاڵ)ەوە تا ببنە خۆراکی ئاگر.

وینستۆن نەیدەزانی چ لە ناوەوەی(لابۆر – موختەبەر)ی نەبیندراوی ئاگرەکەدا بە وردی ڕوو دەدا بەڵکو شتێکی گشتی لێ دەزانی. بە گورجی گشت ڕاستکردنەوەکانی تایمز گرد کرانەوە و سەرلەنوێ ژمارەکە لە چاپ درایەوە. ژمارە کۆنەکە فەوتێندرا و تازەکەی لە جێ، لە ئەرشیف هەڵگیرا. ئەم گۆڕانکاریە بەردەوامە، تەنها بە سەر ڕۆژنامەکاندا نەدەهات بەڵکو کتێب و گوتار و نامیلکە و ئەفیش و فلیم و تۆماری دەنگ و وێنەی کاریکاتێری



و نیگار و هەموو شێوە بەرهەمێکی ئەدەبی یا بەڵگەنامەشی دەگرتەوە کە پێ بچووبا ناوەڕۆکی سیاسی یا ئایدۆلۆژییان هەیە. ڕۆژ بە ڕۆژ و بگرە دەقیقە بە دەقیقە، ڕابردوو نوێ دەکرایەوە. بەو پێیە، کەس بە پێی بەڵگەنامە نەیدەتوانی ڕاست دەرنەچوونی پێشبینی حیزب بسەپێنێ ؛ هەر جۆرە هەواڵێک یا بۆچوونێکیش لەگەڵ بارودۆخەکەدا دژ بوایە، لە سەر تەختەی هۆش دەسڕدرایەوە. هەموو دەمێ تەختەی پارێزراوی هۆش دەکوژایەوە و بە ژمارەی نوێ پڕ دەکرایەوە. کە کارەکان جێی خۆیان دەگرت و جێگیر دەبوون و لەگەڵ ڕۆژگارەکەدا ڕێک دەهاتنەوە، ئیدی مەحاڵ بوو بەڵگەی گۆڕین و دەسکاریش چنگ کەوێ. گەورەترین بەشی ئەرشیف کە لە جێی کاری وینستۆن زۆر گەورەتر بوو، بەوپەڕی ساکاری، لەو کەسانە پێک هاتبوو کە ئەرکی ئەوەیان لە ئەستۆدا بوو بچن بە دووی ئەو نوسخە کتێب و ڕۆژنامە و بەڵگەنامانەدا بگەڕێن و کۆیان بکەنەوە و بیانفەوتێنن کە دەسکاری کراون. بۆی هەبوو یەک ژمارەی تایمز، بە هۆی گۆڕانی سیاسەتی ڕۆژ و پێشبینی ڕێبەری گەورەوە، دە جاران چاپ بکرێتەوە بەڵام لە ئەرشیفدا مێژووی یەکەم چاپی لە سەر دەنووسرا و چ وێنەی تریش لە ئارادا نەدەما. کتێبیش بە هەمان شێوە دەنووسرانەوە و جار لە دوای جار چاپ دەکرانەوە و سەرلەنوێوە بڵاو دەکرانەوە بێ ئەوەی باسی گۆڕینیان بکرێ. تەنانەت ئەو فەرمانە نووسراوانەش کە دەگەیشتنە وینستۆن، باسی گۆڕینیان تێدا نەدەکرا بەڵکو باسی ڕاستکردنەوەی هەڵە و هەڵەی چاپیان تێدا بوو کە دەبوو ئەنجام بدرێن تا ڕێک دەرچن. لە کاتێکدا کە خەریکی سڕینەوە و نووسینەوەی ژمارەکانی وەزارەتی فراوانی بوو، وای بە بیریدا دەهات کە ئەوە گۆڕین نەبێ. مەسەلە گۆڕینی شتێکی پووچ بوو بە شتێکی تری پووچ. زۆربەی ئەو کەرەسانەی کە لە بەردەستیدا بوون چ پەیوەندییان بە دنیای واقیعەوە نەبوو. تەنانەت ئەو پەیوەندیەیش لە ئارادا نەبوو کە دەبوو بە درۆیەوە هەبێ. ئامارەکان لە نوسخە ڕەسەنەکەدا، هەر هێندەی ڕاستکردنەوەکەیان درۆ بوون. ماوەی زۆری خۆی بە چاوەڕوانی دەکوشت تا خۆی، هەر بە خەیاڵی خۆی ڕێکیان بخات. بۆ نموونە، بە پێی مەزەندەی وەزارەتی فراوانی دەبوو ١٤٥ملیۆن جووتە پێڵاو وەبەرهەم بێ. بەڵام ئەوەی لە ڕاستیدا وەبەرهەم هاتبوو ٦٢ ملیۆن جووت بوو. کە وینستۆن ژمارەکەی نووسییەوە، بۆ ٥٧ ملیۆنی داگرت تا دەریبخات کە ڕادەی بەرهەمهێنانەکە لە پێشبینییەکە پترە. بە هەرحاڵ، نە ١٤٥ ملیۆنەکە لە ڕاستییەوە نزیک بوو نە ٦٢ ملیۆنەکە و نە ٥٧ ملیۆنەکە. پێ دەچوو هەر لە بنیی پێڵاو وەبەرهەم نەهاتبێ. زۆرتریش وا پێ دەچوو کە کەس گوێی بە

ڕادەی بەرهەمهێنان نەدابێ. ئەوەی کە دەیزانی هەر ئەوە بوو کە هەموو وەرزێ ڕادەی خەیاڵیی پێڵاو لە سەر قاقەز وەبەرهەم دەهێندرا و نیوەی ئۆقیانووسیەکانیش بە پێخواسی دەسوڕانەوە. ئەوە لە هەموو مەودایەکی گەورە و بچووکدا هەبوو. هەموو شتێ لە ناو واقعی تەماویدا گوم دەبوو. ساڵ و مێژووش لە ناو ئەو واقیعەدا نادیار بوون.

وینستۆن تەماشایەکیساڵۆنەکەی کرد. لە ژوورەکەی بەرانبەریدا، پیاوێکی کورتەبنەی گرژ ومۆن کە ناوی تیلاتسۆن بوو، بە پەلەپەل کاری دەکرد. ڕۆژنامەیەکی بە سەر چۆکەوە بوو و زاری لە ئامێری بێژە و بنووسە بردبوە پێشێ. ڕواڵەتی وا پێدەچوو کە خەریکی کارێکی نهێنی نێوان خۆی و بێژە و بنووسەکە بێ. سەری هەڵبڕی و چاویلکەکەی، دوژمنانە بەرەو ڕووی وینستۆن چروسکایەوە.

وینستۆن کەمە ئاشنایەتییەکی لەگەڵ تێلاتسۆندا هەبوو بەڵام نەیدەزانی چ کارەیە. لە دایەرەی ئەرشیفدا، کەس باسی جۆری کاری خۆی نەدەکرد. بە درێژایی هۆڵە بێ پەنجەرەکە، وەک ئەم دوو ژوورە بەرانبەر یەکە، هەر خشەخش و چپەچپی وەک پاڕانەوەی زارکی بێژە و بنووسەی خەڵکیی بوو کە وینستۆن بە ناو نەیدەناسین هەرچەندە هەموو ڕۆژێکیش یا لە ڕێڕەوەکەدا یا لە هۆڵی دوو دەقیقەی ڕقدا، لە حاڵەتی کرنۆشدا دەیبینین. دەیزانی ژنە قژکاڵە بچکۆلەکە، لە ژوورەکەی تەنیشتی ئەمەوە، بێ پشوو کار دەکات و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەر خەریکی ئەوەیە ناوی کەسانی بە هەڵم کراو لە ڕۆژنامەکاندا نەهێڵێ. ئیدی ئەو کەسانە وەک ئەوەیان لێ دەهات کە قەت نەبووبن. کارەکەی، لەگەڵ خۆیدا دەگونجا چونکە چەند ساڵێ لەوەبەر، مێردەکەی خۆشی ببوو بە هەڵم. چەند ژوورێک لەولاترەوە، خەلقەندەیەکی خەونئامێزی نەبوو، بە ناوی (ئەمپلفۆرت)ەوە کە گوێچکەی کوڵکن بوون، بە بەهرەیەکی سەیرەوە، خەریکی کێش و قافیەی ئەو شیعرانە بوو کە لە دواچاپدا دەردەکەوتن و پێشتر لەگەڵ ئایدۆلۆژیدا ڕێک نەدەهاتنەوە و لە بەر هەر هۆیەکیش بووبێ دەبوو لە ڕیزی ئەدەبدا بمێننەوە. ئەو ژوورەش کە نزیکەی ( ٥٠ ) فەرمانبەر کاریان تێدا دەکرد تەنها بەشێکی گچکە بوو...یەک شانەی بەشی ئەرشیفی ئاڵۆزکاو بوو. لە پشتەوە، لە سەرەوە و لە خوارەوە، هەر کارمەند بوو و خەریکی کاری ئاڵۆز بوو. لەولاوە، عەشاماتی کارگەرانی چاپخانە بە خۆیان و بەرێوەبەر و مەکینە و ئامێری وێنەگۆڕین، لقی ئامادەکردنی بەرنامەی تەلەڤزیۆن، ئەندازیاران... ئامادەکەران و هونەرمەندان کە لاسایی دەنگی خەڵکیان دەکردەوە و لە بەر لێهاتویی خۆیان لەوێ دانرابوون. لە جێیەکی دی، لەشکری فەرمانبەری بەڵگەنامە بوو کە کاریان هەر ئەوە بوو



ئەو کتێب و نووسینانە دیاری بکەن کە دەبوو دەسکاری بکرێن. کۆگای گەورە گەورەی پڕ لە کتێبی دەسکاریکراو، کوورەی گەورە نوسخە کۆنەکانی دەخستنە خانەی نەبووان. کارەکان، هەماهەنگییەکی سەیریان تێدا بوو و پلانی چاکیان بۆ دارێژرابوو. پلان، پێویست بوو چونکە بۆ نموونە: دەبوو فلانە بابەت یا بەش لە ڕابردوودا هەبێ و فلانەشیان بگۆڕدرێ. هی دی لە سەر تەختەی هۆش بسڕدرێتەوە و شتی تری بێتە جێ.

بەشی ئەرشیف یەک لقی وەزارەتی ڕاستی بوو. کاری ئەم وەزارەتە، هەر تازەکردنەوەی بینای ڕابردوو نەبوو، بەڵکو ئامادەکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و فلیم و کتێب و بەرنامەکانی تەلەسکرین و شانۆگەری و ڕۆمان و هەموو بۆچوون و زانیارییەک و پەروەردە کردنێکیش بوو. هەر لە پەیکەرتاشییەوە بگرە تا دەگاتە قسەی نەستەق، هەرلە شیعرەوە بگرە تا زانیاری دەربارەی زیندەوەران، هەر لە کتێبی ئەلفوبێی حینجەی منداڵانەوە بگرە تا دەگاتە فەرهەنگی گوتەی نوێ. وەزارەتەکە، نەدەبوو هەر پێداویستییە لە ژمارە نە هاتووەکانی حیزب جێبەجێ بکا، بەڵکو دەبوو هەمووی وا هاسان بکاتەوە، بیانگەیەنێتە ڕادەی هۆشی کرێکارانیش. ڕیزە بەشێکی تەواو هەبوو کە بە گشتی خەریکی بەرهەمی پرۆلیتاری ومۆسیقا و دراما و بابەتی سەرگەرمی بوون. لەم بەشانەدا، ڕۆژنامەیەکی هەرزان دەردەچوو کە هیچی تێدا نەبوو وەرزش و هەواڵی تاوانکاری و بەختنامە و چیرۆکی کورتی بە جۆشوخرۆشی هاسان نەبێ. فلیمەکان جنسیان لێ دەباری و گۆرانیەکانیان بەسۆز بوون. فلیمەکان بە هێندێ ئامێر لە سەر جۆرە لوولەیەک کە ناوی (ئاوازساز) بوو، بە پەستترین شێوەی ڕووت پێشان دەدران.لە ناو پاکەتی سەرمۆردا ڕەوانە دەکران. جگە لەوانەی کە خەریکی فلیمەکان بوون هیچ ئەندامێکی تری حیزب بۆی نەبوو بیانبینێ.

وینستۆن سەرگەرمی کار بوو. لە پڕێکدا سێ پەیامی بە لوولەکەدا بۆ هاتن؛ بەڵام هێند هاسان بوون، بەر لە کاتی دوو دەقیقە ڕق، توانی ئەنجامیان بدا. کە دوو دەقیقەی ڕق بەسەر چوو، گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی. فەرهەنگی گوتەی نوێی لە ڕەفتێ داگرت، بێژە و بنووسەی وەلا نا، چاویلکەکەی پاک کردەوە و دەستی کردەوە بە کارەکەی بەیانی.

خۆشترین کاتی ژیانی وینستۆن لە کارەکەیدا بوو. زۆربەی کارەکانی جاڕسی و ڕۆتین بوون. بەڵام کاری واشی تێدا دەبوو کە پیاو خۆی پێوە خەریک بکات و وەک مەسەلەی ماتماتیک، خۆی تێدا ون بکات - گۆڕینی شتی گرینگ کە پیاو هیچی تێدا پێ نەدەکرا

توانای تایبەتی خۆی لە سۆسیالیزمی ئینگلیزی و حالێبوونی ویستەکانی حیزبدا دەویست. وینستۆن، لەم بابەتە کارانەدا پسپۆر بوو. بە هۆی باوەڕپێکردنیەوە، تەنانەت چەند جارێ دەسکاریکردنی (تایمز)یشی پێ سپێردرابوو کە گوتارەکانی دەربارەی ناوەڕۆکی (گوتەی نوێ) بوون. پەیامێکی پێشووی وەلا نابوو، هێنایە پێشێ. نوسرابوو:

تایمز ۸۳/۲/۳ ڕۆژفەرمان ڕ گ گونجانا ناخەڵک سەرنووسین پیشاوان.

لە گوتەی کۆن یا زمانی پێوانەدا، ئەو گوتەیە وای لێ دەهات: فەرمانی ڕۆژانەی ڕابەری گەورە لە ژمارە سێی کانوونی یەکەمی ۱۹۸۳ ی تایمزدا، بە هیچ جۆرێ ناگونجێ و پاڵپشتی نەبووانە. سەرلەنوێوە بینووسەوە و بەر لە هەڵگرتنی بە لێپرساوانی باڵای بدە.

وینستۆن دەستی بە خوێندنەوەی گوتارە هەڵەکە کرد. پێ دەچوو ڕێبەری گەورە لە وتووێژێکی ڕۆژانەیدا، بە ئانقەست بایەخی بە (ج ھ د م) دابێ کە دەزگایەک بوو، جگەرە و بابەتی سەرگەرمی کەشتیوانەکانی وەبەرهەم دەهێنا. لەو گفتوگۆیەدا، بە تایبەتی ناوی (هاوڕێ ویتەرز) هێندرابوو کە ئەندامی باڵای ناوەندی حیزب بووە و دووەم پلەی خەڵاتی باڵای وەرگرتووە.

دوای سێ مانگ بەبێ باسکردنی هیچ هۆیەک، دامودەزگای (ج ھ د م)تێک درا. ئیدی پیاو دەتوانێ بیر بکاتەوە کە ویتەرز و هاوکارەکانی نیشانەی شەرمەزارییان بە بەرۆکەوەیە. بەڵام هیچ شتێ دەربارەی ئەو باسە، لە ڕۆژنامە و تەلەسکرین باس نەکرابوو. هەر ئەوەش پێشبینی دەکرا چونکە دادگای ئاشکرا و تاوانبارکردنی ئاشکرای گێرەشێوێنی سیاسی نائاسایی بوون. پاکسازییە گەورەکانیش کە هەر جارە و هەزاران کەسیان لە خایەن و تاوانبارانی بیر دەگرتەوە، دوای ئەوەی دانیان بە تاوانی خۆیاندا دەنا عیدام دەکران. ئەم ڕووداوە، دوو ساڵ جارێ زیاتر پێش نەدەهات. بەڵام ونکردن و سپاردن بە چاڵی بیرچوونەوەی هەر کەسێ لۆمەی حیزبی بهاتبایەتە سەر، زیاتر باو بوو. ئەم جۆرە کەسانە، شوێنەواریان نەدەما و کەس نەیدەزانی چییان بەسەر دەهات. هێندێ وێ دەچوو نەشمردبێتن. هەر لەگەڵ داک و بابی خودی وینستۆندا، سیی کەسی دی کە باشی دەناسین، سڕنەگوم کرابوون.

وینستۆن، پشتە سنجاقێکی بە لووتیدا هێنا. هێشتا هاوڕێ تیلاتسۆن، لە ژوورەکەی بەرانبەریدا، سەری بە دیار بێژە و بنووسەکەوە ڕاگرتبوو. لە پڕ سەری هەڵبڕی: دیسان چاویلکەکەی بلاچەی ناحەزانەی دا. وینستۆن بیری لەوە دەکردەوە کە دەبێ ئەویش



خەریکی هەمان کار بێ. زۆر پێ دەچوو وا بێ. ئەنجامدانی کارێکی وا گرینگ نەدەکرا بە یەک کەس بسپێردرێ. لە لایەکی تریشەوە، سەپاندنی بە سەر کۆمیتەیەکدا مەترسی ئاشکرابوونی لێ دەکرا. پێ دەچوو هەر لەو دەمەدا، بە لای کەمەوە دە کەس، هەر یەکە و لە لای خۆیەوە خەریکی داڕشتنەوەی ڕاستی گفتوگۆکەی ڕێبەری گەورە بن. پاشانیش هۆشمەندێکی لێهاتووی گەورەی حیزب چاکترینیان لێ هەڵدەبژێرێ و سەرلە نوێوە ئامادەی دەکاتەوە و ئیدی درۆ، جێی خۆی دەگرێ و وەک ڕاستی دەچێتە مێژووەوە.

وینستۆن هۆی بەدناوبوونی(ویتەرز)ی نەدەزانی. لەوانەیە بە هۆی دەسپیسی یا کەم توانایییەوە بووبێ و لەوانەشە ڕێبەری گەورە ویستبێتی نەمێنێ نەبادا ناو دەربکات. لەوانەیە ویتەرز یاکەسێکی نزیکی ئەو، بە هۆی ڕەفتاری ڕافزیانەوە گومانی لێ کرابێ. لەوانەشە - کە ئەمەیان زیاتر ڕێی تێ دەچێ - هەروا ڕووی دابێ چونکە پاکسازی و بە هەڵمکردن، پێداویستی دەزگاکانی حکوومەت بوون. سەرەداوی واقعی، تەنها لە گوتەی (ڕێنمایی نەبووان)دا دەدۆزرایەوە و ئەمە دەریدەخست کە ویتەرز لە دوورگەی نەبوواندایە.

وینستۆن کەمێ ڕاما. (بێژە و بنووسە)ی هێنایە بەرەوە و وەک ڕێبەری گەورە، بە هێمنی دەستی پێ کرد: فەرمانێ کە جارێ لە جاران سەربازانە و بنەبڕ بووە، لە هەمان کاتیشدا بە هۆی پرسیارکردن و وەڵامدانەوەوە ئاسایی بووە (هاوڕێیان، چ وانەیەک لەم ڕاستییەوە فێردەبین ؟. فێر دەبین و ئەمە یەکێکە لە بناغەکانی سۆسیالیزمی ئینگلیزی... هتد. هاوڕێ ئۆگلڤی لە سێ ساڵیدا، هەموو جۆرە ئەسبابێکی گەمەی منداڵانەی ڕەت دەکردەوە، ڕەشاش و تەپڵ و کۆپتەر نەبێ. لە شەش ساڵیدا، ساڵێک بەر لە تەمەنی دیاریکراوی پێویست، چۆتە ئەنجومەنی خەفێگەرانەوە. لە نۆ ساڵیدا بوو بە سەرلەشکر. لە یازدە ساڵیدا، ناوی مامی خۆی داوە بە پۆلیس چونکە گفتوگۆیەکی بۆنی سەرپێچی لێ هاتووە. لە حەڤدە ساڵیدا بوو بە لێپرساوی لیژنەی (دژی جنس)ی لاوان. لە نۆزدە ساڵیدا نەخشەی نارنجۆکێکی کێشا کە دوایی وەزارەتی ئاشتی لە سەری دروست کرد و لە یەکەم تاقیکردنەوەدا، سیی و یەک بەندکراوی ئەوروئاسیایی پێ کوژران. لە بیست و سێ ساڵیدا، لە کاتی بەجێهێنانی فەرماندا کوژرا. کاتێ بە سەر ئۆقیانووسی هیندیدا دەفڕی، فڕۆکەی جەنگی دوژمنی لێ پەیدا بوون. ڕەشاشەکەی لە ئامێز گرت و خۆی هەڵدایە ناو ئاوی ئۆقیانووسەکەوە. بیرکردنەوە لە مەرگی وا، بە بێ هەستی بەخیلیی پێ بردن مەحاڵە. ڕێبەری گەورە چەند ڕستەیەکی تری دەربارەی پاکژی و سادەیی ژیانی هاوڕێ

ئۆگلڤی گوت: ئەو هاوڕێیە، قەتی نەدەخواردەوە، جگەرەی نەدەکێشا، جگە لە وەرزش بابەتێکی تری سەرگەرمکردنی نەبوو. پەیمانی ڕەبەنیی دابوو. پێی وابوو ژنهێنان و دەردەسەری خێزان، لەگەڵ خۆتەرخانکردنی شەو و ڕۆژدا دژی یەک دەوێستنەوە. لە ژیانیدا، جگە لە تێکشکانی ئەوروئاسیایی دوژمن و تاقیبکردنی بەکرێگیراوان و خراپەکاران و تاوانبارانی بیر و خائینان، ئامانجی تری نەبووە.

وینستۆن بیری دەکردەوە: دەکرێ نیشانەی تایبەتی لێهاتوویی پێ بدرێ؟. لە کۆتاییدا، بڕیاری پێچەوانەی دا تا خۆی لەو ڕەنگدانەوە ناپێوستانە لا بدا کە بە هۆیەوە دەردەکەون.

جارێکی تریش تەماشای نەیارەکەی ئەوبەرەوەی کرد. لە دڵی چەسپی بوو کە (تیلاتسۆن)یش هەمان کار ئەنجام دەدا. مەحاڵ بوو بزاندرێ لە کۆتاییدا، بەری ڕەنجی کێ هەڵدەبژێردرێ. بەڵام لە ناخەوە هەستی دەکرد کە ئەوەی خۆی هەڵدەبژێردرێ. هاوڕێ ئۆگلڤی کە بەر لە یەک سەعات بوونی نەبوو، ئێستا هەیە. وینستۆن ئەوەی پێ سامان بوو کە مردوو دروست دەکا نەک زیندوو. هاوڕێ ئۆگلڤی کە هەرگیز بوونی نەبوو، وا لە ڕابردوودا بوونی بوو. کارێ کە بۆ ڕابردوو دادەتاشرا، هەمان ڕەسەنایەتی و بەڵگەی بوونی (کارل)ی گەورە و (جۆلیۆسی قەراڵ)ی دەبوو.



## ٥

کانتینە نەوییەکەی ژێرخانەکە، ڕیزی نیوەڕۆژەی تێدا گیرابوو و ڕیزەکە، وردە وردە پێش دەکەوت. کانتینەکە جمەی دەهات و هاتوهاوار گوێی کەڕ دەکرد. لە پەنجەرەی ئاشپەزەکەوە هەڵاوی شۆربا تێکەڵاوی بۆنی میتاڵی ژەنگگرتوو ببوو بەڵام بە سەر بۆنی (جن)ی سەرکەوتندا زاڵ نەدەبوو. ئەوسەری ژوورەکە بارێکی گچکە بوو. ئەوەش دەلاقەیەک بوو کە دەیانتوانی لەوێوە (جن)ی دەبڵ بە دە سەنت بکڕن.

دەنگێک لە پشت وینستۆنەوە هات: بە دوای ئا ئەمەدا دەگەڕێم.

ئاوڕێکی دایەوە. (سایم)ی برادەری بوو کە لەبەشی لێکۆڵینەوە کاری دەکرد. ڕەنگە "برادەر" وشەیەکی شایستە نەبێ. لەو ڕۆژگارەدا "برادەر" نەبوو بەڵکو "هاوڕێ" هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەمان دوو هاوڕێ بوون کە ئاخاوتنیان پێکەوە لە ئاخاوتنی هاوڕێیانی دی بەسۆزتر بوو... لە (گوتەی نوێ)دا پسپۆڕ بوو. لە ڕاستیدا، یەکێ بوولە ئەندامە زۆر و زەبەندەکانی لیژنەیەک کە خەریکی یانزەمین چاپی فەرهەنگی (گوتەی نوێ) بوون. بنیادەمێکی وردیلە بوو. لە وینستۆن بچکۆلەتر ڕسکابوو. مووی ڕەش و چاوی درشت و ئاوساو بوون. چاوی خەماوی بوون بەڵام لە هەمان کاتیشدا نوکتە ئامێز بوون. کە قسەی دەکرد، دەتگوت گوێگرەکەی بە چاو دەپێوێ. گوتی: ئەرێ دەبێ گوێزانت نەبێ؟!.

وینستۆن بە هۆی ئازاری ویژدانەوە، وەک تاوانبارێک هاتە گۆ: "دە تۆ بلێی یەک دانە! بۆخۆشم دنیا گەڕام چنگم نەکەوت."

گوێزان، بابەتی باس بوو. ڕاستی مەسەلەکە ئەوە بوو کە وینستۆن دوو دانە گوێزانی نوێی هەبوون و دەستی بە سەردا گرتبوون. چەند مانگێ بوو گوێزان قات بوو. ئاخر هەر ماوەیەک و شتێ لە کۆگاکانی حیزبدا قات دەبوو. هێندێ جار قۆپچە نەبوو، هێندێ جار دەزوو نەدەما و هێندێ جاریش قەیتانی قۆندەرە. ئێستا گوێزان نەبوو. تەنها لە بازاڕی ئازاددا ئەوانە چنگ دەکەوتن، ئەوەش بە دزییەوە. وینستۆن لە سەر گوتەی خۆی ڕۆیی: "شەش حەوتووە یەک گوێزانم هەیە." بەڵام دیار بوو ڕاستی نەدەکرد.

ڕیزەکە چووە پێشتر. کە وێستان ڕووی لە سایم کردەوە. هەر یەکەیان سینییەکی لەو سینییانە هەڵگرت کە لە سەر یەک داندرابوون. گەیشتنە ئاشپەزەکە. سایم گوتی: "دوێنێ چویتە سەیری عیدامکراوان؟." وینستۆن بە لامبالاتییەوە گوتی: "کارم دەکرد. پێم وایە

لە سینەما بیانبینم چاکە". سایم گوتی: "چارەسەرێکی وا نییە بەس بێ." چاوی پڕ لە لۆمەی بە وینستۆندا گێڕا. دەتگوت دەڵێ: "دەتناسم چ زاتێکی! ناخت دەناسم! باش دەزانم بۆ نەچوویتە دیتنی عیدامکراوان!" سایم بە شێوەیەکی هۆشمەندانە بۆچوونی ژەهراوی خۆی دەردەبڕی. بە خۆشی و بە دەم ڕقەوە باسی هێرشی هێلیکۆپتەری دەکرد کە کرابوونە سەر گوندەکانی دوژمن. بە هەمان شێوە باسی دادگا و دانپێدانان و هەڵواسینی تاوانبارانی فکری دەکرد کە لە وەزارەتی ئەوین ئەنجام دەدران. هەست دەکرا کە سایم لە ئاخاوتندا هەوڵی ئەوە دەدا گوێگرەکە بەرەو ناو تەکنیک و هونەرکاری پاکتاوکردنی فەرهەنگی گوتەی نوێ ڕاپێچێ. ئەو لەوەدا بەتوانا بوو و تێیدا کولا بوو. وینستۆن، بۆ ئەوەی خۆی لە چاوی درشت و ڕەشی بدزێتەوە، کەمێ بە لایەکی تردا سەری خوار کرد. سایم، بۆ مەبەستی وەبیرهێنانەوە گوتی: "هەڵواسینی چاک بوو. لاقبەستنیان کارەکە ناخۆش دەکا. حەزێ دەکەم لەقەفرکێی هەڵواسراوان ببینم. دواییش، زمانی شین و مۆر هەڵگەڕاویان بێنە دەرێ. ئەو جۆرە بە هەوەسی منە."

چێشتتێکەرەکە، بەروانکە بە بەرۆک و کەوچک بەدەست وێستابوو. گوتی: "تکایە با نەفەری دواتر بێتە پێشێ..."

وینستۆن و سایم، هەر یەکەیان سینی خۆی لە ژێر پەنجەرە شیشبەندەکەوە بە ژوورێدا کرد. بە خێرایی بروسکە خواردنیان بۆ تێکرا. شۆربایەکی ڕەنگ خۆڵەمێشی لە کاسەیەکدا و پارچە نانێک و قاڵبە پەنیرێک و فینجانێک(ئاوی سەرکەوتن)ی بێ شیر و یەک کلۆ شەکریش. سایم گوتی:" لە ژێر ئەو تەلەسکرینە مێزێکی چۆڵ هەیە. با لەگەڵ خۆماندا سەر و پەرداخێ (جن)یش بەرین."

(جن)، لە ناو قاپێکی چینیدا درایە دەستیان. ڕێی خۆیان بە ناو حەشاماتەکەدا کردەوە و هەرچییان پێ بوو، لە سەر مێزێکیان دانا. قاپە شۆربایەک لە قەراغی مێزەکە جێ مابوو. شلەیەکی پیس، هەر بە ڕشانەوە دەچوو. وینستۆن (جن)ەکەی خۆی بەرز کردەوە و کەمێ وێستا تا خۆی بۆ هەڵدانی قایم کات. ئەوجا ئەو (دەگمەن!)ەی هەڵدا. لە کاتێکدا بە هۆی (جن)ەکەوە ئەشکی دەڕشت برسێتیشی وەبیر هاتەوە. کەوتە خواردنی شۆرباکە. مەعجوونێ بوو، پارچەی گچکەگچکەی وەک ئیسفەنجی تێدابوون. ڕەنگە گۆشت بووبن. تا قاپەکانیان بەتاڵ نەکرد، هیچیان ورتەیان لێوە نەهات. لە سەر مێزەکەی لای دەستەچەپی وینستۆن، کەمێ لە پشتیەوە، یەکێ دەنگی لێ هەڵبڕیبوو و بە پەلەپەل و بێ



پشوو قسانی دەکرد. دەنگی بە قاڕەقاڕی مراوی دەچوو و بە ناو هەموو دەنگەکانی ناو ژوورەکەدا ڕێی خۆی دەکردەوە. وینستۆن بە دەنگێکی بەرز پرسی: "فەرهەنگەکە بە چ گەیشت؟".

سایم لە وەڵامدا گوتی: "وردە وردە پێش دەکەوێ. گەیشتوومەتە ڕاناو. زۆری نەماوە تەواو بێ."

بە ناوهێنانی "گوتەی نوێ" گەشایەوە. قاپەکەی وەلا نا. نانەکەی بە دەستێکەوە و پەنیرەکەی بە دەستەکەی ترەوە گرتن و سەری بردە پێشێ تا بێ ئەوەی دەنگ هەڵبڕێ قسان بکا:

– چاپی یازدە، دواچاپە. زمانەکە دەگەیەنێتە شێوەی کۆتایی خۆی. شێوەی کۆتایی زمان ئەوەیە کە ئیدی کەس بە زمانێکی تر نەدوێ. ئەو زمانەی کە تەواوی دەکەین دەبێ خەڵکی وەکی تۆ، وەک ئاو و دۆ بیزانن. فەرهەنگەکە، یەک وشەی لەوانە تێدا نابێ کە بەر لە ساڵی **٢٠٥٠** لە کار دەکەون.

بە ئارەزووەوە قەپاڵی بە نانەکەدا کرد و یەک دوو پارووی لێ قووت دا. ئەوجا بە جۆش و خرۆشەوە، هاتەوە سەر باسەکەی خۆی. سیمای تەڵخی گەش بووەوە و ژیانی تێ زا. چاوی کە درەوشانەوەیان نەبوو، گەشانەوە:

– تێکدانی زاراوە، تا بڵێی کارێکی نایابە. دیارە زەرەری هەرە گەورە بە ڕاناو و کردار دەگا بەڵام لە دەستی سەدان وشە ڕزگار دەبین. هەر ئەو وشانە نا کە هەموویان یەک واتایان هەیە، بەڵکو وشە دژ بە یەکەکانیش. ئاخر وشەیەک کە پێچەوانەی وشەیەکی دی بێ بە عەمەلی چی دێ؟. هەر وشەیەک بگری پێچەوانەی خۆی وا لە ناو خۆیدا. بۆ نموونە، تەماشای وشەی (چاک) بکە. ئەگەر وشەیەکی وەک (چاک)ت هەبێ ئیدی چ پێویست بە وشەی (خراپ) دەکا؟. (ناچاک) هەمان واتای هەیە و چاکتریشە چونکە بە تەواوی پێچەوانەی (چاک)ە بەڵام (خراپ) هێندە پێچەوانەی (چاک) نییە. ئەگەر شێوەیەکی بەهێزی (چاک)ت بوێ وشەی بێ کەڵک و لاوازی وەک (باش) و (نایاب)ت ناوێ. (گەلێ چاک) ئەو واتایەی هەیە یا لەوەش بەهێزتر (دەبڵ گەلێ چاک) هەیە. شتی تری پێ ناوێ. دیارە ئێستا ئەو وشانە بەکار دەهێنین بەڵام لە دواچاپی فەرهەنگەکەدا بە هیچ جۆرێ نامێنن. لە کۆتاییدا هەموو وشەیەکی چاک و خراپ کە شەش دانەن و لە ڕاستیدا یەکێکن دەبن بە یەک وشە. وینستۆن چاوت لێیە چۆنە؟!. دوای تاوێ

بیرکردنەوە لە سەری ڕۆیشت: "دیارە بۆچوونەکە لە بنەڕەتدا هی (ڕ. گ)یە."

بە ناوهێنانی ڕێبەری گەورە، پەرۆشییەکی بێ گیان سیمای وینستۆنی گرتەوە. بەڵام سایم درکی پێ نەکرد، و لە سەر گوتەی خۆی بەردەوام بوو:

"وینستۆن! تۆ چ دیاردەیەکی پەیوەندیت بە گوتەی نوێوە پێوە دیار نییە. کە پێشی دەنووسی هەر بە گوتەی کۆن بیر دەکەیتەوە. هێندێ لەو گوتارانەت دەخوێنمەوە کە جاروبار لە تایمزدا بڵاو دەکرێنەوە.بێ عەیبن بەڵام وەرگێڕانن. لە ناخەوە خۆت بە گوتەی کۆنەوە، بە هەموو تەمومژ و پانتایی و قووڵایی واتا بێ بایەخەکانیەوە گرێ داوە. جوانییان شێواوە و وشەکان ڕێک نەهاتوون. ئایە دەزانی کە گوتەی نوێ تاکە زمانی دنیایە کە ساڵ بە ساڵ وشەی لێ کەم دەبێتەوە؟.

دیارە وینستۆن ئەو ڕاستییەی دەزانی. بزەیەکی لایەنگرانەی بۆ کرد. باوەڕی بە خۆی نەبوو لە سەری بدوێ. سایم پاروویەکی تری لە نانە بۆرەکەی خستە زارەوە. نانەکەی جویی و لە سەر قسەی خۆی ڕۆیشت: "ئاگات لەوە نییە کە هەموو مەبەستێک لە گوتەی نوێدا بەرتەسککردنەوەی هۆشە؟. لە ئەنجامدا تاوانی بیر مەحاڵ دەبێ، چونکە وشەی دەربڕینی نامێنێ. ناوەڕۆکی مەبەستی هەموو شتێ بە وشە دەردەبڕدرێ و واتاکەی بە تەواوی دادەندرێ و هەموو واتایەکی لاوەکی لە ناو دەبرێ و دەسپێردرێتە دنیای لەبیرچوو. لە چاپی یازدەدا، کەمان ماوە بگەینە ئەو مەبەستە. بەڵام ئەم کارە زۆر لە دوای مردنی من و تۆشدا بەردەوام دەبێ. هەر ساڵە و وشەی کەمتر و کەمتر. مەودای هۆش، تەنگتر و تەنگتر دەبێتەوە. دیارە ئێستا چ بەڵگەیەک بۆ تاوانی بیر بە دەستەوە نییە. مەسەلەکە، خۆڕێکخستنی تەواو و جڵەوکردنی واقیعە. لە ئەنجامدا ئەوەشی پێ ناوێ. کە زمانەکە پێگەیشت شۆڕش پێ دەگا. بە گەشکەوە دەوامی بە قسەکانی خۆی دا: "گوتەی نوێ (سۆسینگ)ە و (سۆسینگ) یش گوتەی نوێیە. وینستۆن! قەتت وەبیردا هاتووە کە ساڵی ٢٠٥٠ کەس تێماننناگات ؟."

وینستۆن بە دوودڵییەکەوە گوتی : "جگە..." بەڵام قسەکەی خۆی قرتاند. وەخت بوو بڵێ "جگە لە کرێکاران". بەڵام خۆی گرتەوە. بە تەواوی دڵنییا نەبوو کە ئەو گوتەیە بەجێ بێ. سایم لە مەبەستی حاڵی بوو، بە بێ گوێدان گوتی:

– کرێکاران بنیادەم نین. تا ساڵی ٢٠٥٠ – لەوانەیە زووتریش – زانیارییەکی واقعی لە سەر زمانی کۆن نامێنێ. هەموو ئەدەبی کۆن لە بەین دەچێ. چاسەر، شکسپیر، میلتۆن، بایرۆن... تەنها لە گوتەی نوێدا دەمێنن. ئەوەش نەک بە شێوەیەکی تەواو جیاواز و بەس، بەڵکو بە پێچەوانەی خۆشیانەوە. تەنانەت ئەدەبیاتی حیزبیش دەگۆڕێ، دروشمەکانیش. کە وشەی ئازادی بسڕدرێتەوە چۆن دەبێ دروشمی (کۆیلایەتی ئازادییە) هەبێ؟. شێوەی بیرکردنەوە دەگۆڕێ. لە ڕاستیدا، بیرکردنەوەی لەو بابەتەی کە تێی دەگەین بوونی نییە. یەکسانی واتە بیرنەکردنەوە – پێویست نەبوونی بیرکردنەوە، خۆی لە خۆیدا یەکسانی ئەودیوی هۆشە.

وینستۆن گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە سایم بەو زووانە دەبێتە هەڵم. زۆر بە ئاگایە وباش تێدەگا و بێ پێچ و پەنا دەدوێ. حیزب پیاوی وای پێ پەسند نییە، لە ناوچەوانی نووسراوە. وینستۆن، نانوپەنیرەکەی تەواو کردبوو. کەمێ لە جێی خۆی جما تا قاوەکەشی فڕ بکا. لە مێزەکەی لای دەستەچەپییەوە، قاڕەقاڕی کابرای مراوی دەهات. ئافرەتێکی گەنج کە پێ دەچوو سکرتێری بێ، گوێی بۆ شل کردبوو و پێ دەچوو یەکە یەکەی قسەکانی بە دڵ بن. جاروبارێ بە دەنگ دەهات: "وا بزانم ڕاست دەڵێی، لەگەڵ بۆچوونتدام." دەنگی ژنانە و گەمژانەی ئافرەتەکە بەر گوێی وینستۆن دەکەوت. بەڵام دەنگەکەی دی، تەنانەت لە کاتی ئاخاوتنی ژنەکەشدا نەدەبڕا. وینستۆن بە شێوە و سیمادا کابرای دەناسی. هەر ئەوەندەشی دەربارە دەزانی کە فەرمانبەرێکی بە پلە و پایەی بەشی خەیاڵە. پیاوێکی سیی ساڵەی مل ئەستوور و دەم پان بوو. کەمێ سەری بە دواوەدا بردبوو. بە هۆی گۆشەی دانیشتنەکەیەوە، لە بری ئەوەی وینستۆن چاوی ببینێ، دوو بازنەی خڕی ڕووناکی دەدیتن. ئەوەی تا ڕادەیەک ترسناک بوو، ئەوە بوو کە لەو ڕیزە دەنگەی لە زاریەوە هەڵدەڕژان، حاڵیبوونی یەک وشە مەحاڵ بوو. وینستۆن، ڕستەی "لەناوبردنی تەواو و بنەبڕی گۆڵدستەین "ی لە گوتەکانیدا قۆستەوە کە بە پەلە بە زاریدا دەرپەڕی. گوتەکانی دی هەر بڵمەبلم و قاڕە قاڕ بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە نەدەزاندرا چ دەڵێ، بەڵام ناوەڕۆکی قسەکانی شاراوە نەبوو. لەوانە بوو گۆڵدستەین ڕیسوا بکات یا خواستیاری سزای توندوتیژ بێ بۆ تاوانبارانی بیر و خراپەکاران. لەوانە بوو دەربارەی دەستدرێژی ئەوروئاسیا داد و بێ دادی بێ یا بە ڕێبەری گەورەدا هەڵبڵێ یا باسی قارەمانێتی، لە بەرەی مالابارادا بکا. جیاوازی نەبوو. هەرچۆنێ بێ، دەتوانی دڵنیابیت کە هەر وشەیەکی گوتەکانی، یەکسانیی تەواو بوو، گشتی سۆسینگ بوو. وینستۆن لە ڕوخساری بێ چاو و ئێسقاناوی ئەو ڕادەما کە هەڵبەز و دابەزی دەکرد. لە بەر چاوی، بە بنیادەمێکی تەواو نەدەچوو، بێ مێشکێ بوو بۆ خۆی. ئەوەی پێی دەدوا مێشک نەبوو. دەنگێ بوو کە وەک

قاڕەقاڕی مراوی، نەشیویستبا هەر دەردەهات. سایم، ماوەیەک بە بێ دەنگی دانیشت و بە کلکی کەوچکەکەی، خەتخەتۆکێی لە شورباکە دەکرد. دەنگی سەر مێزەکەی لایانەوە، بە پەلەپەل بەردەوام بوو و هەرچەندە دەنگەدەنگ زۆریش بوو، بەڵام ئەوەیان هەر دەبیسترا.

– لە گوتەی نوێدا وشەیەکی نوێ هەیە. نازانم ئاگاداریت یا نا: "گوتەی مراوی"، قاڕەقاڕی وەک مراوی. یەکێکە لەو وشانەی کە سەرنج ڕادەکێشن. ئەمەیان دوو واتای دژ بە یەکی هەیە. ئەگەر ئاراستەی دوژمن بکرێ سووکایەتییە بەڵام ئەگەر بە دۆست بگوترێ ستایشە.

وینستۆن دیسان بیری لەوە کردەوە کە سایم، بە بێ چەند و چۆن دەبێ بە هەڵم. وای بیر دەکردەوە و چاکیشی دەزانی کە سایم خۆشیی پێدا نەدەهات و بە نزمی دەدی و ئەگەر پێویستیشی بکردبا دوور نەبوو بە تاوانی بیر بەگرتی بدا. شتێ لە سایمدا ناسروشتی بوو... درکی بە شتێ کردبوو: سڵکرنەوە، کەنارگیری یا جۆرە گێلییەک بوو. نەدەکرا بڵێی نایەکسانە. باوەڕی بە بنەڕەتەکانی سۆسینگ هەبوو و ڕێبەری گەورەی پێ مەزن بوو، بە سەرکەوتن شاگەشکە دەبوو. قینی لەوانە بوو کە خەتیان بەر دەدا. نەک هەر بە دڵسۆزی بەڵکو بە جۆش و خرۆشێکی گەرمەوە لە باوەڕی حیزب دەدوا کە ئەندامە ئاساییەکانی دی وا نەبوون. لە گەڵ هەموو ئەوانەشدا، مۆری ناپاکی بە ناوچەوانییەوە دیار بوو. شتی وای دەگوت کە هی گوتن نەبوون. کتێبی زۆری خوێندبۆوە و هاموشۆی باڕی (داربەڕوو)ی دەکرد کە مەکۆی نیگارکێش و مۆسیقاژەنەکان بوو. هیچ یاسایەکی تۆمارکراو یا نەکراو لە سەر هاموشۆکردنی ئەو جێیە نەبوو بەڵام جێی گومان بوو. ڕێبەرە کۆنەکانی حیزب، بەر لە تێداچوونیان، هاموشۆی ئەوێیان کردبوو. دەیانگوت خودی گۆڵدستەین، ساڵان و دەیان ساڵ لەوەوبەر لەوێ بیندراوە. زەحمەت نەبوو پێشبینی چارەنووسی سایم بکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەوەندەی درکی بە بیرکردنەوەی وینستۆن بکردبا دەمودەست دەیدایە دەستی پۆلیسی خەیاڵ. هەر کەسێکی تریش بوایە وای دەکرد. بەڵام حسێبی سایم جودا بوو. جۆش و خرۆش بەس نەبوو... هەستی چوونیەکی نائاگایانە بوو. سایم سەری هەڵبڕی و گوتی: " ئەوەش پارسۆنز"ە.

پارسۆنزی قەڵەو و دەستەباڵا و قژ بۆر و ڕوخسار بۆق، لە ئەپارتمانی سەرکەوتندا، دراوسێی وینستۆن بوو. بەرەو ڕوویان هات. لە سیی و پێنج ساڵیدا، غەز و بەز دەوری



پشتێنەی گرتبوو بەڵام لە هەڵسوکەوتیدا چاپک و گورج بوو. سیمای بە هی منداڵێک دەچوو کە زوو گەورە بووبێ. تا ئەو ڕادەیە بە منداڵ دەچوو کە جلە شینە حیزبییەکەشی پۆشی بوو وا پێ دەچوو کراسی خۆڵەمێشی وملپێچی سووری خەفیەشی، لە سەر ئەوەوە پۆشیبێ. وێنەی ئەو، لە تاریکایی هۆشدا، لە چۆکی بەچاڵدا چوو و قۆڵی هەڵکراوی دەوری بازووی گۆشتنی پێک هاتبوو. ئەوەش بە هۆی ئەوەوە بوو کە پارسۆنز، لە مەشقی هاوبەش یا هەر جۆرە وەرزشێکی دیدا کە دەرفەتی تێدا بدیبا، بەشدار دەبوو. بە دەم سڵاوی گەرمەوە لە هەردووکیان، لە سەر مێزەکەیان دانیشت و بۆنی عارەقەی بە دەوری خۆیدا پەرت کرد. دڵۆپە عارەقەی درشت بە ڕوخساریەوە بوون. توانای عارەقەڕشتنی لە ڕادە بە دەری هەبوو. لە هۆڵی (تێنس)دا، بە پێی ڕادەی شێی تەڕی دەسکی (ڕاکت)ەکان دەزاندرا چ کاتێ ئەو یاری کردووە. سایم، لیستە وشەیەکی درێژی دەرهێنابوو و قەڵەم پاندانێکی لە نێوان قامکەکانی نابوو و بە دیققەت ورد دەبووەوە.

پارسۆنز، سیغورمەیەکی بە وینستۆندا ماڵی و گوتی: "تەماشا!. لە کاتی پشووی خواردنیشدا کار دەکات. زیرەکییە ها؟. کوڕیژگە ئەوە چییە پێت؟. ڕەنگە لە سنووری توانای هۆشی من بەدەر بێ. سمیت گیان با پێت بڵێم بۆچ بە دووتدا وێڵ بووم. بیرت چوو شتەکەم وێ دەی."

دەستی وینستۆن، هەر لەخۆڕا بۆ پارە دەگەڕا. گوتی: "کام شت؟." دەبوو چواریەکی مانگانە بۆ ئەو ئابونانە وەلا نرێ کە لە ژماردن نەدەهاتن.

– بۆ حەفتەی ڕق. یارمەتی خانووی کرێ. بە خۆت دەزانی کە من خەزنەداری بلۆکەکەی خۆمانم. کۆششێکی هەمەلایەنە دەکەین... پێشانگایەکی بەردەوام پێک دێ. با پێت بڵێم: هەڵەی من نییە کە لە هەموو شەقاماکەدا، ئەپارتمانی سەرکەوتن ئاڵای زۆرە. بەڵێنی دوو دۆلارت داوە.

وینستۆن دوو یەکدۆلاریی چڵکنی دەرهێنان و پێی دان. پارسۆنز لە دەفتەرە گچکەکەی یاداشتەکانیدا کە بە هی منداڵ دەچوو و بە چەوتوچێڵی لێی نووسرابوو، نووسی و گوتی:

"ئەرێ بیستم دوێنێ ئەو سواڵکەربەچە گچکەیەم کردووتی بە نیشانەی تیر و کەوان. لە سەر ئەوە چاکم پێدا ماڵی. لە ڕاستیدا، تێمگەیاند کە ئەگەر دووپاتی بکاتەوە ئیدی تیروکەوانەکەی لێ دەستێنم."

وینستۆن گوتی: "پێم وایە لە داخی ئەوەی نەچووبوە دیتنی عیدامکردن دڵگران بوو."

– دەی باشە پێت وا نییە ئەوەی بە هۆی کاردانەوەوە کردبێ؟. هەردوو سواڵکەربەچە گچکەکانم هاروهاجن ئەمما تا بتەوێ زیرەکن . هەموو هۆشوگۆشیان لە سەر خەفیەگەرێتی و جەنگە. دەزانی شەممەی ڕابردوو کچەکەم لەگەڵ دەستەکەی خۆیدا لە شەقامی (بێرک هامس) چی کردبوو؟. دوو کیژی تری دووی خۆی خستبوون و بە دزییەوە، هەموو ئەو دوانیوەڕۆیە تاقیبی پیاوێکی بێگانەی کردبوو. ماوەی دوو سەعاتی تەواو، بە نێو دارستانەکەدا جێ پێیان هەڵگرتبوو تا گەیشتبوونە ئامرشام. ئیدی خەبەری مەفرەزەیان لێ دابوو.

وینستۆن کە تا ڕادەیەک شڵەژابوو گوتی: "بۆ وایان کردبوو؟".

پارسۆنز، سەرکەوتوانە لە سەر قسەی خۆی ڕۆیی: منداڵەکەم دڵنیا بوو کە ئەو پیاوە فەرمانبەری دوژمنە و لەوانەیە بە پەرەشووت هەڵدرابێتە ناوچەکەوە.بەڵام مەسەلەکە لێرەدایە کوڕیژگە.پێت وایە بۆ دووی کەوتوون؟. تەماشای کردبوو کابرا پێڵاوی عەنتیکەی لە پێدان. گوتی قەت پێڵاوی وام لە پێی کەسدا نەدیوە. لە بەر ئەوە بۆ وەی چووبوو بێگانە بێ. ئەمە بۆ منداڵی حەوت ساڵان کارێکی ژیرانەیە. وایە؟.

وینستۆن گوتی: "ئەدی کابرا چی بە سەر هات؟."

– ئەمەیان نازانم. بەڵام جێی سەسوڕمان نییە ئەگەر...

ئەوەی گوت و زمانی وەک لوولە بە خڕی دەرهێنا. ئەوجا گوایە تفەنگە، تەقەی پێ کرد.

سایم بێ ئەوەی سەری هەڵبڕێ گوتی: "دەستخۆش."

وینستۆن لایەنگریی کرد و گوتی: "دیارە!... ناتوانین خۆمان زەوت کەین."

پارسۆنز گوتی: "مەبەستم ئەوەیە کە شەڕ لە ئارادایە."

دەنگی کەڕەناو لە تەلەسکرینەکەوە بە جۆرێ بەرز بووەوە، دەتگوت نیشانەی لایەنگری ئەمانە. بەڵام ڕاگەیاندنێکی سەرکەوتن بوو... هی وەزارەتی فراوانی.

دەنگێکی بە جـۆش و خـرۆش بەرز بووەوە: "هاوڕێیـان گـوێ بدێرن... هەواڵێکی گرینگ!.لە شەڕی بەرهەمدا سەرکەوتنمان وەدەست هێناوە! ئامارەکان دەریانخستووە کە ڕادەی بەرهەمی کەرەسەی سەرفکردن لە ماوەی ساڵی پاردا، ڕێژەی لەسەدا بیست پتر بووە. ئەمڕۆ لە سەرانسەری ئۆقیانووسیادا خۆپێشاندان ساز کراوە. کارمەندان و فەرمانبەران، لە کارخانەکانەوە دەرکەوتوون و ڕژاونەتە سەر شەقامەکان. دروشمی سوپاسگوزاری بۆ ڕێبەری گەورە بەرزکراونەتەوە کە بە لێهاتویی خۆی ژیانی نوێ و



بەختەوەری بۆ مەیسەر کردوون و هەرزانیی هێناوە. ئەمەش هێندێ ژمارە. خواردەمەنی..."

گوتەی (ژیانی نوێ و بەختەوەری)ی چەند جارێ دووپات کردەوە کە ناوەڕۆکی ویستی وەزارەتی فراوانی بوو. پارسۆنز کە دەنگی کەڕەناو سەرنجی ڕاکێشابو، بە زاری دابچڕاو و کڕنۆش و گوێ لە مشتییەوە، گوێی دەدێرا. سەری لە ژمارەکان دەرنەدەچوو بەڵام دەیزانی ئەو ژمارانە، بە شێوەیەک لە شێوەکان، جێی دڵنیایی بوون. قەلوونە پیسەکەی کە تا نیوەی تووتنی سووتاو بوو، دەرهێنا. حەفتەی سەد گرام پشکە تووتن بەشی نەدەکرد تا قەلوونەکەی لێ پڕ بکا. وینستۆن جگەرەی سەرکەوتنی دەکێشا. بە وردیی، بە شێوەی ئاسۆیی جگەرەکەی ڕاگرت. پشکە تووتنی تازە تا سبەینێ نەدەهات و ئەویش بۆ ئەو ماوەیە چوار جگەرەی پێ مابوون. ئەو دەمە گوێی بۆ تەلەسکرینەکە شل کردبوو و هێند گوێی بە دەنگەکانی دی نەدەدا. دەرکەوت خۆپێشاندانێکی تریش بۆ سوپاسکردنی ڕێبەری گەورە دەکرێ چونکە بەشە شوکلات گەیشتۆتە حەفتەی بیست گرام. دەیزانی هەر دوێنێ شوکلاد کرایە حەفتەی بیست گرام. دەکرێ لە ماوەی بیستوچوار سەعاتدا ئەوەیان بە سەردا تێپەڕێ؟. بەڵێ تێپەڕی. زۆر بە هاسانی بە سەر پارسۆنزدا تێپەڕی، بە گێلێتی ئاژەڵ بە سەریدا تێپەڕی. بە سەر گیاندارە بێ چاوەکەی سەر مێزەکەی تەنیشتیاندا، بە لەزەت و بە گەرمییەوە تێپەڕی. لە ترسی خستنەچاڵەوە، لە تاو ناردن و بەهەڵمبوونی هەر کەسێ کە بتوانێ بڵێ حەوتووی پێشوو بەشە شوکلاد سیی گرام بوو، بە سەریاندا تێدەپەڕێ. سایمیش، ڕێیەکی گرتۆتە بەر کە دەگاتەوە باوەڕی دووفاقانە. باشە هەر ئەم (وینستۆن) بە تەنێ هۆشی هەیە؟.

ئاماری ئەفسانەئاسا لە تەلەسکرینەکەوە هەڵدەڕژا. بەگوێرەی پار، خواردنی زۆرتر و پۆشاکی زۆرتر، خانووی زۆرتر و بارودۆخی ئاشپەزی چاکتر، سوتەمەنی زۆرتر، کەشتی و کۆپتەری زیاتر، کتێب زۆرتر و منداڵ زۆرتر – هەموو شتێ زۆرتر نەخۆشی و تاوانکاری و شێتبوون نەبێ. ساڵ بە ساڵ و دەقیقە بە دەقیقە، هەموو شتێک و هەموو کەسێ، بە پەلە پلەی پێشکەوتن دەبڕێ. وینستۆن لاسایی سایمی دەکردەوە و بە کەوچکەکە، خەتی بەشۆربا بێ ڕەنگەکەی سەر مێزەکە دروست دەکرد. ڕێچکەیەکی لێ ڕاکێشا و خەتخەتۆکەیەکی لێ پێک هێنا. بیری لە شێوەی فیزیاوی ژیان دەکردەوە. دەبێ هەر وا بووبێ؟. دەبێ تامی خۆراک هەر وا بووبێ؟. چاوێکی بە ناو کانتینەکەدا گێڕا: ژوورێکی نزم و قەرەباڵغ، دیوارەکانی هێندە جەستەی خەڵکیان پێدا هاتبون چڵکن ببوون. مێز و کورسیە میتاڵە قەراغ سواوەکان، هێند بە پەنای یەکەوە بوون، لە کاتی دانیشتندا

ئانیشکی خەڵک بەر یەک دەکەون. کەوچکی خواروخێچ، سینیی قوپاو، لەگەنی ئەستوور و سپی، دیواری ڕۆناوی، لە هەر جێیەک پەڵە چڵکێ، بۆنی ترشاوی و بۆنی (جن)ی خراپ و قاوەی خراپ و شۆربای تام تەنەکە و جلوبەرگی چڵکن. لە هەموو جێ، لە ناو زگ وله سەر پێستدا نارەزایی هەبو، هەستی ئەوەی مافێکت لێ زەوت کراوە. ڕاستە هیچی ئەوتۆی بیر نەماوە، ڕاستە سەردەمێکی وەبیرنەدەهاتەوە خۆراک زۆرتربووبێ. هەرگیز گۆرەوی و جلی ژێرەوەی بێ پینە نەبوون. کەلوپەلی ماڵەوە هەمیشە دڕاو و ناڕێک بوون. ژوورەکان ساردوسڕ بوون. قەتاری ژێر زەوی دایم پڕ بوون. خانووەکان، کەلاوە و وێرانە بوون. نان ڕەش، چای دەگمەن، قاوە بێ تام، جگەرە کەم - جن نەبێ هیچ شتێکی دی هەرزان و زۆر نەبوو. هەست دەکرا کە هەموو شتێ خراپترە و تەنانەت جەستەکانیش کۆن دەبن. بارودۆخی ژیان خراپترە، خەڵکی بە نارەحەتی و پۆخڵی و گۆرەوی پینەکردن و نەبوونی پێداویستی، زستانی یەک لە دوای یەک، بە ئاسانسۆری هەمیشە سەقەت و ئاوی سارد و سابوونی زبر و ئەو جگەرانەی کە ورد دەبوون و خۆراکی ناخۆش ژیانیان دەگوزەراند. ئایە هەموو ئەوانە نیشانەی ئەوە نەبوون کە ژیانی سروشتی وا نابێ؟. ئەگەر شتێ لە هۆشی خەڵکیدا نەبێ کە تێیانبگەیەنێ ژیان جۆرێکی دی بووە ئیدی چۆن درکی پێ دەکەن؟.

جارێکی دی چاوی بە کانتینەکەدا گێڕا. نزیکەی هەموو ئەوانەی لەوێ بوون ناشرین بوون. ئەگەر لە بری جلە شینەکانیان جلی تریشیان لەبەر بوایە هەر وا دەبوون. لەو سەری ژوورەکە، پیاوێکی ئەندام وردی بە دیققەتی وەک سیسرک، بە تەنها دانیشتبوو و قاوەی دەخواردەوە. چاوە گچکەکانی، بە پەلەپەل بە دەوری خۆیدا دەگێڕان. وینستۆن بیری کردەوە: چەند هاسان دەبوو ئەگەر دەوری خۆت نەبینی و باوەڕ بهێنی کە ئەو جۆرە جەستە وەبەرهەمهاتووانەی حیزب - لاو و کەڵەگەت و بە ماسولکەن. کیژی مەمک قیت و قژزەرد، زیت و وریا، هەتاو سووتە و بێ خەمن و لە هەموو جێ هەن. لە ڕاستیدا، ئەوەندەی ئەم پێی دەزانی، زۆربەی ئەوانەی کە لە فڕگەی ژمارە یەکدا بوون، لاواز و ڕەش و ڕوخسار نەخۆش دیار بوون. سەیر لەوەدایە کە لە بابەتی ئەو کابرا سیسرکیە لە وەزارەتەکاندا زۆر بوون: پیاوی کورتەبنە، ئەوانەی زوو قەڵەو دەبوون، لاق کورت، چاپک و گورجوگۆڵ، ڕوخساری ئاڵۆز و مەتەڵاوی و چاوگچکە. دەتگوت ئەمانە لە ناو حیزبدا زاوزێ دەکەن.

به دەنگی کەڕەناوە، تەلەسکرینەکە کۆتایی بە ڕاگەیاندنی وەزارەتی فراوانی هێنا و



مۆسیقایەکی هێمن دەستی پێ کرد. پارسۆنز، بە هۆی بۆمبارانی ژمارەکانەوە، زەوقێکی چاکی هەبوو. پایپەکەی لە نێوان ددانی دەرهێنا و بە وریایی تەکاندی و گوتی: ئەمساڵ وەزارەتی فراوانی کاری نایابی ئەنجام داوە. بەڕاست سمیت گیان گوێزانت نییە وێم دەی؟

– تۆ بلێی یەک دانە گوێزان. شەش حەفتەیە یەک گوێزان بەکار دەهێنم.

– باشە. هەروا ویستم بپرسم.

– بە داخەوە.

قاڕەقاڕەکە، کە لە کاتی ڕاگەیاندنەکەدا کپ ببوو، دەستی پێ کردەوە. لە پڕ وینستۆن، پارسۆنز خانمی وەبیر هاتەوە. بە خۆی و قژی ئاڵۆزکاو و ڕوخساری خۆڵاوییەوە، هاتەوە یادی. دوو ساڵی دی نابا منداڵەکانی بەرەو پۆلیسی خەیاڵ ڕاپێچی دەکەن. پارسۆنز خانم دەبێتە هەڵم. سایم دەبێتە هەڵم. لە لایەکی ترەوە، هەرگیز پارسۆنز نابێتە هەڵم. پیاوە کورتەبنە گورجوگۆڵە لە سیسرک چووەکان کە بە ڕێڕەوی وەزارەتەکاندا خێرا خێرا دێن و دەچن، هەرگیز نابنە هەڵم. ئەو خەلقەندە قاڕەقاڕکەرە هەرگیز نابێتە هەڵم. هەرچەندە دیاریکردنی مانەوە و نەمانەوە سادە نەبوو، بەڵام لەخۆڕا دەیزانی کێ دەمێنێ و کێ دەمرێ.

لەو کاتەدا خەیاڵی پچڕا. کیژەکەی سەر مێزەکەی تەنیشتیان ئاوڕی دابۆوە و لەمی دەڕوانی. کیژە قژ ڕەشەکە بوو. دانیشتبوو و بە تیلەی چاو تەماشای دەکرد. تەماشا!. بە وردی لێی ڕامابوو. هەر لەو دەمەدا کە چاوی ئەمی دی، ڕووی خۆی وەرچەرخاند.

بڕبڕەپشتی وینستۆن عارەقەی دەردا. ترسێکی مەرگئامێز چنگی لە هەناوی نا. ترسەکەی زوو بەسەر چوو، بەڵام جۆرە دوودڵییەکی هێشتەوە. بۆ سەرنجی ئەمی دەدا؟. لە بەر چی دووی کەوتووە؟. خەمی بوو. نەیدەزانی کامیان پێش ئەوی تریان هاتووە. بەڵام دوێنێ، لە کاتی دوو دەقیقەی ڕقدا، ڕێک لە پشتی ئەمەوە دانیشتبوو کە دەشکرا وا نەکا. پێ دەچوو مەبەستی ئەوە بووبێ گوێ بدێرێ و بزانێ داخوا بە دەنگی توند دەقیژێنێ یا نا.

ئاوێزانی خەیاڵ بووەوە: "ڕەنگە ئەو کیژە خەفیەی پۆلیسی خەیاڵ نەبێ. بەڵام خەفیەی خۆتەرخانکەری بەئارەزوو، لەوانەی دی بقەترە." نەیدەزانی لە کەیەوە دانیشتووە و تێی ڕاماوە. لەوانەیە پێنج دەقیقەی تەواو بووبێ. دووریش نەبوو لەو ماوەیەدا، ئەم ئاگای لە قیافەی خۆی نەمابێ. کاتێ پیاو بەرانبەر تەلەسکرین بێ یا لە جێیەکی گشتیدا بێ،

جێی مەترسییە جڵەو بۆ خەیاڵی خۆی شل بکات. بچووکترین شت ڕاپێچت دەکا. ڕاچەنینی کتوپڕ یا شڵەژانێکی ئاشکرا یا لە خۆڕائاخاوتن یا ڕوخسار مۆن کردن تاوان بوون و سزایان هەبوو (بۆ نموونە لە کاتی ڕاگەیاندنی هەواڵی سەرکەوتندا، خۆ بە ناباوەڕ پێشاندان) جێی مەترسیی بوو. وشەیەکی گوتەی نوێ هەبوو: "تاوانی ڕوخسار"ی ناو بوو.

کیژەکە پشتی تێ کردبوو. خۆ لەوانەش بوو دووی ئەو نەکەوتبێ. دوور نەبوو هەر بە ڕێکەوت، دوو ڕۆژ لە سەر یەک، لە نزیکی ئەمەوە دانیشتبێ. جگەرەکەی کوژابۆوە، بە وریایی لە لێوار مێزەکەی دانا. نیازی وابوو دوای کار دایگیرسێنێتەوە. دوور نەبوو یەکێ لەوانەی سەر مێزەکانی دەوریان، خەفیەی پۆلیسی خەیاڵ بێ و لەوانەشە، دوای سێ ڕۆژان، خۆی لە بنخانی (وەزارەتی ئەوین)دا ببینێتەوە. بەڵام نەدەکرا قونکە جگەرەکە بە خەسار چێ. سایم، قاقەزەکەی قەدونوشت کردبۆوە و خستبوویەوە بەرکی. پارسۆنز، دەستی بە قسان کردبۆوە.

– بەڕاست، پێم نەگوتی منداڵەکانم داوێنی پیرەژنێکی دەسگێڕیان گڕ داوە چونکە دیویانە باسترمەی بە وێنەی (ڕ. گ) پێچاوەتەوە؟. بە دزییەوە،لە دواوە بۆی چووبوون. ها؟. دەنکە شقارتەیان لێ دابوو. وا بزانم بە تەواوی سووتابوو. گەڕۆڵە گچکەکانم، ها؟. بەڵام سووک و باریک، لەم ڕۆژانەدا پلەی یەکەمی ئەنجومەنی خەفیەگەریێتی وەردەگرن. لە سەردەمی منیش باشتر. دەزانی تازەترین شتیان پێ دراوە چییە؟. سەماعەی گوێ کە لە کونی کلیلەوە گوێی پێ دەگیرێ. کەنیشکەکەم پێری هێناویەتی – لە ژووری دانیشتنەکەماندا تاقی کردەوە. دەڵێ دوو جاران لەوە باشتر دەبیستری کە گوێ بە کونی کلیلەوە بنێی. دیارە ئامێری ساکاری یاری منداڵانە بەڵام ئەمان بە ڕێکوپێکی بە عەمەلی دێنن.

لەو دەمەدا تەلەسکرینەکە، دەنگێکی هەراسانکەری لێ بەرز بووەوە. نیشانەی کۆتایی پشوو بوو. هەرسێکیان گورج هەستان تا لە ململانێی بەردەم ئاسانسۆرەکەدا بەشدار بن. تووتنی ناو جگەرەکەی وینستۆن هەڵڕژا.



## ٦

وینستۆن دانیشتبوو و لە دەفتەری یاداشتەکەیدا دەینووسی:

سێ ساڵ لەمەوبەر بوو. ئێوارانێکی تاریک، لە شەقامێکی باریکی لای وێستگایەکی گەورەی شەمەنەفەر. ئەو ژنە لە بەر دەرگایەک، لە ژێر چرایەکدا کە بە عاستەم ڕووناکایی هەبوو ڕاوێستابوو. سیمای گەنج دیار بوو و زۆری ئارایش کردبوو. لە ڕاستیدا ئارایشەکە، سپیاوی وەک ماسک بوو و سوراوی لێوی سەرنجی ڕاکێشام. ژنانی حیزب هەرگیز خۆیان ئارایش ناکەن.کەس لە سەر شەقامەکە نەبوو. تەلەسکرینیش نەبوو. گوتی دوو دۆلار. من...

کەمێ لە نووسین کەوت. چاوی داخستن و بە توندی پەنجەی لە سەر دانان و فشاری دا. هەوڵی دەدا خەونێ کە جاروبار دەیبینێ دەربینێ. ئارەزوویەک بە ناخیدا دەگەڕا و دەیویست پیسترین جنێو بدا. یا سەری خۆی بە دیواردا بکێشێ، مێزەکە بداتە بەر شەق و شووشە مەرەکەبەکە، لە پەنجەرەکەوە هەوا دا – دەیویست بقیژێنێ یا کارێکی ئازاربەخش ئەنجام بدا تا ئەو یادگارییەی لە بیر چێ کە ئازاری دەدا.

بیری لەوە دەکردەوە کە ناهەموارترین ئۆرگانی بنیادەم ئۆرگانی عەسەبیە. لە هەموو ساتێکدا دەتوانێ جەستەت وەک نیشانە پێشان بدا. پیاوێکی بیر کەوتەوە کە حەفتەی پێشوو، بە شەقامەکەدا، بە لایدا ڕەت بوو: پیاوێکی هاکەزایی، ئەندامی حیزب، سیی و پێنج یا چل ساڵە، کەمێ کەڵەگەت و لاواز، جانتایەکی بە دەستەوە بوو. چەند هەنگاوێکیان مابوو پێک بگەن، ڕوخساری لە لای چەپەوە شێوا. کە پێکیش گەیشتن هەر وا بوو: گرژ بوونی ماسولکە بوو، لەرزێک بوو، ماوەی چرکەی کامیرەیەکی پێ چوو. بەڵام بە ڕواڵەت وا وێدەچو خووی پێوە گرتبێ. وەبیری هاتەوە کە لە بەر خۆیەوە گوتی:" نەگبەتی هەش بە سەرە، حسێبی ڕۆیشتووە." کارەساتی گەورە لەوەدا بوو بە دەم خەوەوە وڕینە بکەی، ئیدی تا هۆش بڕ دەکا خۆپاراستن دیار نییە.

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و کەوتەوە نووسین:

لەگەڵیدا وەژوور کەوتم و بەلای دیوارەکەی دواوەدا چووینە مەتبەخێکەوە. قەرەوێڵەیەک بە پەنای دیوارەکەوە بوو. چرایەکی کزکراو لە سەر مێزەکە بوو. ئەو...

ددانی ئاڵ بوون. حەزی دەکرد تفێ ڕۆ بکات. هاودەمێتی ئەو ژنە لەو ئاشپەزەدا،

ژنەکەی خۆی، (کاترین)ی وەبیر هێنایەوە. وینستۆن ژنی هەبوو - بە هەرحاڵ، کاتی خۆی ژنی هێنابوو. دوور نەبوو ئێستاش ژنی هەبێ چونکە ئەوەندەی ئاگادار بێ، ژنەکەی نەمردبوو. هەستی کرد بۆنی گەرمایی و مس، لە ئاشپەزی ژێرخانەکەوە دێ و تێکەڵی بۆنی سیسرک و جلوبەرگی چڵکن و لە هەمان کاتدا عەتری هەرزانبەها دەبێ. هیچ ژنێکی سەر بە حیزب بۆنی بەکار نەدەهێنا. بیرلە خەرجی عەتریش دەکرایەوە. تەنها کرێکاران عەتریان لە خۆ دەدا. بۆنی عەتر،لە هۆشی ئەمدا تێکەڵاوی فەسادی دەبوو. بەدووکەوتنی ئەو ژنە یەکەم هەنگاوی هەڵەی بوو لە ماوەی دوو سێ ساڵ یا ماوەیەکی لەو بابەتەدا. هاودەمێتی سۆزانی قەدەغە بوو بەڵام یاساکەی لەو بابەتانە بوو کە پیاو بوێرێ ڕێی شکاندنی بەخۆی بدا. جێی مەترسی بوو، بەڵام باس باسی سەر نەبوو. یەکێ لەگەڵ سۆزانیدا بگیرابا، لەوانە بوو بە پێنج ساڵ زیندانیی و کاری بێگاری گران ببڕێتەوە. ئەگەر تاوانی تری بە دوودا نەهاتبا، بە پێنج ساڵەکە کۆتایی دەهات. پیاو دەیتوانی خۆی بپەڕێنێتەوە بە مەرجێ لە سەری نەگیرابا. گەڕەکە هەژارەکان، شەپۆلی ئەو ژنانەی دەدا کە لەشی خۆیان دەفرۆشت. هێندێ جار بە یەک قاپ جن بوو کە کارگەران بۆیان نەبوو بیکڕن. حیزب بە شێوەیەکی نهێنی دەیویست سۆزانیان ڕەواجیان هەبێ تا دەروویەک بۆ ئەو غەریزانە بکرێتەوە کە کپ نەدەکران. مادام ژنبازی بە دزییەوە دەکرا و لەزەتێکی ئەوتۆی نەبوو و هەر ژنانی چینە پاینەکانی دەگرتەوە، هێندە گرینگ نەبوو. کرداری وا، لە ناو ئەندامانی حیزبدا قابیلی چاوپۆشی نەبوو. هەرچەندە لە پاکسازییەکاندا، تاوانباران بە بێ چەندوچۆن دانیان پێدا دەنا بەڵام باوەڕکردن بە کاری وا دژوار بوو. مەبەستی حیزب تەنها ئەوە نەبوو لێ نەگەڕێ ژن و پیاو پێکەوە بەختەوەری بنیات بنێن نەبادا ڕام نەبن. مەبەستی ڕاستی و شاردراوە ئەوە بوو لەزەتی (نێری) و (مێیی) لابەرن - لە چوارچێوەی هاوسەرێتیدا یا لە دەرەوەیدا، ئەوین دوژمن بوو. هەموو هاوسەرێتییەکی ئەندامانی حیزب دەبوایە بە ڕەزامەندی لیژنەیەکی تایبەتی بێ کە بۆ ئەو مەبەستە پێک هاتبوو، و - هەرچەندە ئەم دەقە بە ڕووتی دەرنەدەخرا - ژن و پیاو گومانی ئەوەیان لێ کرابا کە دڵی یەک ڕادەکێشن، ڕێی هاوسەرێتییان لێ دەگیرا. مەبەستی سەرەکی هاوسەرێتی تەنها ئەوە بوو کە منداڵ بۆ خزمەتی حیزب دروست بکرێ. دەبوو جووتبوونیش وەک دەرزی لێدان بە قیزوبێز و بە پێی پێداویستی بێ. ئەمەش بە ئاشکرا نەدەگوترا بەڵام هەر لە منداڵییەوە، ناڕاستەو خۆ، دەپەسترایە هۆشی ئەندامانی حیزبەوە. تەنانەت ڕێکخراوی وەک لاوانی دژی سێکس هەبوون کە دەیانویست کچ وکوڕ بە بوخچەی نەکراوەیی بمێننەوە



و پز دروستکردن بە چاککردنی دەسکرد (چادە، بە گوتەی نوێ) بێ و لە دەزگا گشتییەکاندا پەروەردە بکرێن. وینستۆن دەیزانی کە شتی وا ناکرێ، بەڵام بە جۆرێ لە جۆرەکان لە گەڵ ئایدۆلۆژیای حیزبدا یەکی دەگرتەوە. حیزب دەیویست غەریزەی نێر ومێ نەهێڵێ. ئەگەر لەمەدا سەریش نەکەوێ، دەتوانێ بیشێوێنێ و بێتامی بکا. نەیدەزانی بۆ وایە بەڵام وێ دەچوو ئاوها سروشتی بێ. هێندەی باسەکە پەیوەندی بە ژنانەوە هەبوو، حیزب زۆر تێیدا سەرکەوتوو بوو.

دیسان (کاترین)ی بیر کەوتەوە. نۆ، دە ساڵ یا یازدە ساڵ دەبوو کە لێک دابڕابوون. سەیر بوو کە لەو ماوەیەدا کەم جار بیری دەکەوتەوە. هێندێ ڕۆژ بیری دەچوو کە ژنی هێناوە. تەنها یازدە مانگ پێکەوە بوون. حیزب ڕوخسەتی تەڵاقی پێ نەدەدان. بەڵام کە مەسەلە بوو بە مەسەلەی منداڵ هانی دابڕانی دان.

کاترین کچێکی قژ زەرد و کەڵەگەت و ڕێکوپێک بوو. هەڵسوکەوتی جوان بوو. ڕوخساری بوێرانە و لووتی بەرانیی هەڵکەوتبوو. ڕوخساری، بەر لەوەی نهێنیەکانی ژێرەوەی بزاندرێن، دەتواندرا بگوترێ خانمانەیە. دوای هاوسەرێتیان بە ماوەیەکی کەم، وینستۆن بۆی دەرکەوت کە کاترین - بە بێ هیچ دوودڵییەک - نەفامترین و گێلترین و بازاڕیترین مێشکی، لە ناو هەموو ئەوانەدا هەبوو کە تا ئەو دەمە ناسیبوونی. ڕەنگە بە هۆی ئەوەوە ئەم ڕاستییەی زانیبێ چونکە لە هەموو کەس زیاتر لێوەی نزیک بوو. چ بیرێ لە کەللەیدا نەبوو دروشم نەبێ. هەموو کەرێتیەک، هەر هەموو کەرێتیەکی قەبووڵ بوو بەو مەرجەی حیزب پێی ڕاگەیاندبا. (تۆماری زیندووی دەنگ) شیاوترین ناو بوو بۆ ئەو کە ئەم لە خەیاڵی خۆیدا بۆی دانابوو. لەگەڵ ئەوانەشدا، تەنها لە پێناوی یەک مەبەستدا کە ئەویش سێکس بوو، دەیتوانی لەگەڵیدا بەردەوام بێ.

هەر هێندەی دەستی پێوە دەدا، ڕادەپەڕی و وەک داری ڕەقی لێ دەهات. لە باوەشگرتنی وەک ئەوە بوو کۆتکە دارت لە ئامێز بێ. سەیر ئەوە بوو کە کاتێ وینستۆنی بەرەو خۆی ڕادەکێشا، وەک ئەوە بوو پاڵی پێوە بنێ و دووری بخاتەوە. گرژبوونی ماسولکەکانی، ئەو هەستەیان پێ دەبەخشی. بە چاوی داخراوەوە پاڵی لێ دەدایەوە، نە هاوکاریی دەکرد نە بەرهەڵستیش دەبوو. هەموو جەستەی بە دەستەوە دەدا. لە سەرەتاوە ناخۆش بوو و لە کۆتاییدا دەبوو بە کارەساتێکی کوشندە. دەیتوانی بە بوخچەی نەکراوەیی لەگەڵیدا هەڵ بکا بەو مەرجەی ئەو قایل بوایە. بەڵام کاترین وا ڕازی نەدەبوو. دەیگوت:

ئەگەر بشێ، دەبێ بەچکەیەک وەبەرهەم بێنین. بەو پێیە، ئەگەر چ بەرهەڵستێ نەبوایە ئەوا حەفتەی یەک جار ئەرکی خۆیان بەجێ دەگەیان. بەیانیانیش، وەک ئەوەی کارێکی گرینگ کە دەبێ ئێوارە ئەنجام بدرێ و ناکرێ لە بیر چێ، وەبیریان دەهاتەوە. دوو ناوی لەو کارە نابوو. یەکەمیان "منداڵێ بکەین"، دووەمیشیان "ئەرکی حیزبایەتی بەجێ بگەیەندرێ". (ئا، ئەمەیانی بەکار دەهێنا). زۆری نەبرد کە ڕۆژی دیاریکراو بۆ وینستۆن بووە مایەی دڵتەنگی. بەڵام خۆشبەختانە چ شوێنەواری منداڵ دیار نەبوو و لە ئەنجامدا ڕازی بوو کە دەسبەرداری بێ. دوای ئەوە، زوو لێک دابڕان.

وینستۆن، هەناسەیەکی هەڵکێشا و قەڵەمەکەی هەڵگرت و نووسی:

لە سەر قەرەوێڵەکە ڕاکشا. ئیدی بە بێ هیچ پێشەکییەک، بە ناشرینترین شێوە داوێنی خۆی هەڵماڵی. من...

خۆی لە بەر ڕۆشنایی چرا کزەکەدا دیتەوە. بۆنی سیسرک و عەتری خراپ لە لووتیدا بوون و هەستی تێکشکان و بێزاری لە دڵیدا. هاوکاتیش جەستەی سپی و سۆڵی کاترین کە بە پێی توانای ئەفسووناوی حیزب، بۆ هەمیشە وەک سەهۆڵ بەستبووی، تێکەڵاویان دەبوو. بۆ دەبێ هەمیشە وەها بێ؟. بۆ لە بری هاودەمێتی وا پۆخڵ، لە ماوەی ئەو هومموو ساڵانەدا ژنێکی تایبەتی بە خۆی وەدەست نەهێنا؟. بەڵام هاودەمێتی بە سۆز و ئەوین، شتێ نەبوو دەست کەوێ. ژنانی ڕیزی حیزب، هەموویان یەک بابەتن. پاکژیی قووڵ و وەفاداری بۆ حیزب تێکەڵاوی بوونیانن. بە وەرزشی سەرەتایی، بە یاری و ئاوی سارد، بەو توورەهاتانەی کە لە قوتابخانە و ئەنجومەنی خەفیەتی و لاوان دەرخواردیان درابوون، بە ئاخاوتن و ڕیزبوون و ئاواز و دروشم و مارشی سەربازی، هەستی سروشتییان تێدا دەرهێندرابوو. عەقڵی پێی دەگوت کە دەبێ ڕیزپەڕ هەبێ بەڵام دڵی باوەڕی نەدەهێنا. هەموو ئەمانە بەپێی خواستی حیزب و دژی واقیع بوون. ئەوەی کە ئەم بەر لە هەموو شتێ گەرەکی بوو ڕووخاندنی دیواری پاکژی بوو. سێکس بە شێوەی کامەرانی، یاخیگەرێتی بوو. ویستی جەستە تاوانی بیر بوو. تەنانەت ئەگەر بیویستبا کاترین بێدار بکاتەوە بە جۆرە خەڵەتاندنێک دەژمێردرا با هاوسەریشی بووبێ.

بەڵام دەبێ داستانەکە تا کۆتایی بنووسرێ. نووسی:

فتیلەی چراکەم بەرز کردەوە. کە لە بەر ڕووناکی دیتم...

دوای تاریکی، لە بەر چراکەدا، بە تەواوی دیار کەوت. بۆ یەکەم جار توانی بە تەواوی



ژنەکە ببینێ. هەنگاوێکی بەرەو لای نا. حەز و ترسی لێ دەبارین. لە جێی خۆی وێستا. لە بەر ئەوەی خۆی دووچاری ئەو مەترسییە کردبوو سەغڵەت و شڵەژاو بوو. زۆر ڕێی تێ دەچوو لە کاتی دەرکەوتنیدا تووشی مەفرەزەیەک بێ و دەسگیر بکرێ. دوور نەبوو هەر ئەو کاتە لە بەر دەرگا بن. ئەگەر ئەو کارەش نەکا کە بۆی هاتووە و بچێتە دەرێ...!.

دەبێ بنووسرێ. دەبێ دانی پێدا بێنێ. ئەوەی لەبەر چراکە دیتی پیرەژن بوو. سپیاوەکەی ڕوخساری هێند تۆخ بوو دەتگوت چینێ موقەبایە و ها ئێستا نا کەمێکی دی شەق دەبا. گەبەڵە مووی سپی لە قژیدا بوو. ئەوەی زۆر دڵی تەنگ کرد ئەوە بوو کە دیتی، کەمێ زاری بەش کردبۆوە و ئەودیوی لێوەکانی تەنها کونێکی ڕەش بوو. یەک تاکە ددانی نەمابوو:

کە لە بەر ڕووناکیم دیت، دەبینم پیرەژنە. بەلای کەمەوە پەنجا ساڵە. بەڵام هەرچۆنێ بێ بەردەوام بووم و کاری خۆمم کرد.

دیسان پەنجەی خستنە سەر چاوی خۆی و فشاری دا. ئاخرێکەی نووسی. بەڵام هیچ نەگۆڕا. هێشتا لە ناخەوە دەیویست بە هەموو توانای خۆیەوە بقیژێنێ و پیسترین جنێو بدا.

## ٧

وینستۆن نووسی:

ئەگەر هیوایەک هەبێ تەنها پرۆلیتارە.

ئەگەر هیوایەک بووبێ پرۆلیتار بوو. تەنها ئەوان، ئەو جەماوەرە پشتگوێ خراوە، ٨٥ لە سەدای دانیشتوانی ئۆقیانووسیا پێیان دەکرا ڕێکخراوێک پێک بهێنن و حیزب وێران بکەن. حیزب لە دەرەوەڕا وێران نەدەکرا. دوژمنانی حیزب، ئەگەر دوژمنی بووبن، ڕێیەکیان بۆ گردبوونەوە یا تەنانەت یەکتر ناسینیش نەبوو. لە حاڵەتێکدا ئەگەر ڕێکخراوی برایەتی بوونی بووبێ، کە لەوانە بوو هەبێ، ئەندامەکانی، دوو دوو یا سێ سێ زیاتر نەیاندەتوانی کۆوە بن. ڕاپەڕین، چاوداگرتن بوو. هێرش چرپەچرپ بوو. هەر هێندەی بیانزانیبا چتۆ توانایەکیان هەیە ئیدی پێی نەدەویست مل بدەن. هەر ئەوەندە گرینگ بوو ڕاست ببنەوە و وەک ئەسپێک مێش لە خۆ پاس کات تەکان بدەن. بیانویستبا، هەر سبەینێ حیزبیان تەفروتونا دەکرد. درەنگ یا زوو، دەبێ بگەنە ئەو باوەڕە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا...

وەبیری هاتەوە کە جارێکیان بە شەقامێکی قەرەباڵغدا دەڕۆیی. هاتو هاوارێکی زۆر – هی ژنان – لە گەرووی سەدان کەسەوە، کەمێ لەولاترەوە، لە شەقامێکی لاچەپەوە، بەرز دەبوەوە. هاتوهاوارێکی بە جۆشوخرۆش و هەژێنەری ڕق و ناهومێدی بوو. (ئووووو)یەکی قووڵ و بە هێز، بە زرینگەی دوای لێدانی زەنگ دەچوو. خورپەی بە دڵدا هات. لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەها قەوما! شۆڕشە! ئاخرێکەی کرێکاران زنجیریان پساند. کە گەیشتە شوێنەکە، دیتی دوو سەد سێ سەد کەس لە وردەفرۆشێ گرد بوونەتەوە. ڕوخساریان هێند خەماوی بوو، دەتگوت وان لە ناو کەشتییەکدا و نقوم دەبن. بەڵام هەر لەو ساتەدا، هەڵپەی گشتی بوو بە هەڵپەی تاکە کەسی. دەرکەوت یەکێ لە فرۆشیارەکان لەگەنی چینکۆ دەفرۆشێ. قوپاو و تەنک بوون بەڵام هەموو پێداویستییەکی مەتبەخ قات بوو. کەس نەیزانی ئەوانەش چۆن فرۆشران و تەواو بون. ئەو ژنانەی وەگیریان هێنا بوو، بە پاڵەپەستۆ ڕێی خۆیان بەناو حەشاماتەکەدا دەکردەوە. هێندێ ژنیش، بە سەر فرۆشیارەکەدا دەیانقیژاند و تاوانباریان دەکرد کە جیاوازی کردووە و ناعادیلانە دابەشی کردووە. هاتوهاواری تازە هەستا. دوو ژنی قەڵەو، یەکێکیان قژی تەواو ئاڵۆزکا بوو، هەر یەکەیان لایەکی لەگەنێکی گرتبوو و دەیویست لە دەستی ئەوی تری بستێنێ. لە ڕاکێش و



بکێشدا قاپەکەیان لە دەست کەوت. وینستۆن بە بێزارییەوە تەماشای دەکردن. لەو ساتەکەمەدا کە قیژەی چەندسەد کەسێ بەرز دەبۆوە، بزانە چتۆ هێزێکی تێکشکێن پێکهاتبوو! ئەدی لە بەر چی نەیاندەتوانی بۆ هەر شتێ کە لێی نارازین بەرپای بکەن؟!.

نووسی: تا وەئاگا نەیەن هەرگیز ڕاناپەڕن، تا ڕانەپەڕن ناتوانن وەئاگا بێن.

بە بیریدا هات: دەبێ لە کتێبی وانەی حیزبدا تۆمار کرابێ. دیارە حیزب ڕایدەگەیاند کە پرۆلیتاریای لە ژێردەستیی ڕەها کردووە. بەر لە شۆڕش، لە ژێر ستەمی سەرمایەداراندا ناڵاندویانە. برسێتییان دەکێشا و لێدانیان دەخوارد. ژنان ناچار بوون لە (کان)ی خەڵووزی بەرددا کار بکەن (لە ڕاستیدا، هێشتا ژنان لە کانە خەڵووزەکاندا کاریان دەکرد)، منداڵ بە شەش ساڵان، بە کارگەکان دەفرۆشران. بەڵام ئێستا بە هۆی باوەڕی دووفاقانەوە، حیزب پێی وا بوو کە کرێکاران، نرخیان لە سروشتدا کەمترە و دەبێ بە پێی هێندێ یاسای هاسان وەک ئاژەڵ لێبخوڕدرێن. لە ڕاستیدا، خەڵکی هێندەیان زانیاری لە بارەی پرۆلیتارياوە نەبوو. پێویست نەبوو زۆر بزانن. مادام بەرهەمیان هەبوو و زاوزێیان دەکرد، ئیدی لایەنەکانی تر گرینگ نەبوون. چۆن ئاژەڵ لە ئەرجەنتین بەرەڵا دەکرێن، ئەوانیش وا بوون. شێوە ژیانێکیان بۆ خۆیان پێکەوە نابوو کە بە لای خۆیانەوە سروشتی بوو و پشتاوپشت دەقیان پێوە گرتبوو. لەدایک دەبوون، لە ناو چڵکاودا گەورە دەبوون، بە دوانزە ساڵان دەستیان بە کار دەکرد. مەودایەکی کورتی نەشونماکردن و جوانی و حەزیان بەڕێ دەکرد، لە بیستساڵیدا ژنهێنان و مێردکردن بوو. سیی ساڵ ناوەڕاستی تەمەنیان بوو و زۆربەیان لە شێست ساڵیدا دەمردن. کاری گرانی ماسولکە و سەرپەرشتی ماڵ و منداڵ، وردەشەڕ و دەمەقاڵێ لەگەڵ دراوسێدا، سینەما، تۆپی پێ، بیرە و – لە سەرووی هەمووانیشەوە قومار بوو کە ئاسۆی بەر چاویانی تەسک دەکردەوە. ئاژاوتنیان زەحمەت نەبوو. هەمیشە چەند پۆلیسێکی بیر لە ناویاندا بوون و پڕوپاگەندەی درۆیان بڵاو دەکردەوە و پاشان، چەند نەفەرێکیان دەستنیشان دەکرد کە کەللەیان بۆنی مەترسی لێ بهاتبا، دوایی لە ناو دەچوون. هەوڵی ڕوونکردنەوەی ئایدۆلۆژیای حیزب کەڵکی نەبوو. بوونی هۆشی سیاسیانە لە ناو کرێکاراندا گرینگ نەبوو. ئەوەی لێیان دەویسترا هەر ئەوە بوو وڵاتی خۆیان خۆش بوێ و ئامادە بن کاری زیادەی بۆ بکەن و کرێی کەمی لێ بستێنن. ئەگەر نارازی بوونایە، نارەزاییان ئاراستەی هیچ شتێ نەدەکرد. لە بەر ئەوەی هۆشیان بۆ کێشە گەورەکان بڕی نەدەکرد، هەر خەریکی کێشە و هەرای پڕوپووچ بوون و خۆیان لە کێشەی گەورە لا دەدا. زۆربەی کرێکاران تەلەسکرینیشیان لە ماڵەوە نەبوو و پۆلیسی

خەیاڵ دەسبەرداریان ببوون. خراپەکاری لە شاری لەندەن سنووری دیاری نەبوو: دنیایەکی دزی، ڕێگری، تلیاک، فەسادی، باجگری لە هەموو شتێکدا بەڵام لە ناو خودی کارگەراندا، چی ڕووی دەدا گرینگ نەبوو. سەربەست بوون چۆن پشتاوپشت ڕەوشتی خۆیان بەکێش دەکەن، مەرجی حیزبییان بە سەردا نەدەسەپا. بەرەڵایی سێکس چ سزای لە سەر نەبوو. تەڵاق ڕێی پێ دەدرا. باوەڕی مەزهەبی و ئاین سزایان لە سەر نەبوو ئەگەر کرێکاران پێیان گرینگ بوایە. بە هۆی هیچ گومانێکەوە توندوتیژییان لە گەڵدا نەدەکرا: پرۆلیتار و ئاژەڵ سەربەستن.

وینستۆن نوشتایەوە و برینەکەی قاچی خوراند. برینەکەی بە خروو هاتبوو. ئەوەی بەردەوام بیری لێ دەکردەوە ژیانی پێش شۆڕش بوو. دەبێ چۆن بووبێ؟. کتێبی منداڵانەی مێژووی لە دۆلابێ دەرهێنا کە لە پارسۆنز خانمی وەرگرتبوو. کەوتە لەبەر نووسینەوەی هێندێکی:

لە زەمانی کۆندا، بەر لە بەرپابوونی شۆڕشی مەزن، لەندەن وەکو ئێستا جوان نەبوو. جێیەکی پیس بوو. خەڵکەکەی هەژار بوون و خۆراک بە شەڕەشەق چنگ دەکەوت. سەدان و هەزاران خەڵکی هەژار نە پێڵاویان لە پێدا بوو نە کونجێکیان هەبوو تێیدا بژین. منداڵ لە تەمەنی ئێوەدا ناچاربوون ڕۆژی دوازدە سەعات، بۆ ئاغا ستەمکارەکان کار بکەن. ئەگەر زەغەلییان بکردبا سەنتەرییەکان دارکارییان دەکردن و تەنها قەراغەنانی کۆن و ئاویان دەدانێ. بەڵام لەگەڵ ئەو هەژاری و نەدارییەشدا، خانووی گەورە و جوان هەبوون کە دەوڵەمەندیان تێدا دەژیان و یەکی سیی کارەکەریشیان هەبوون. بەو دەوڵەمەندانە دەگوترا سەرمایەدار. ئەوانە قەڵەو و ناشرین بوون – تەماشای وێنەکەی ئەوبەرەوە بکە – دەبینێ چاکەتێکی ڕەشی درێژی لە بەردایە کە پێی دەگوترێ بۆنژۆر. کڵاوێکی ڕەشی درێژی بریقەداریشی لە سەردایە کە پێی دەگوترێ سلندەر. ئەو پۆشاکە، هی سەرمایەدار بوو و کەسی دی مافی پۆشینی نەبوو. سەرمایەداران هەموو شتێکی دنیایان هەبوو وگشت خەڵکی کۆیلەیان بوون. ئەمانە خاوەنی هەموو زەویوزار و خانووبەرە و کارخانە و پارەیەک بوون. ئەوەی سەرپێچی فەرمانی بکردبان یا لە زیندانیان دەنا یا کارەکەیان لێ دەستاندەوە و لە برسان بە هیلاکیان دەبرد. ئەگەر یەکێ لەگەڵیاندا بدوابا دەبوو ملی مات بکات و کڵاو لە سەری لادا و بە (قوربان) ناویان بڵێ. سەرۆکی گشت سەرمایەدارەکان بە پاشا ناو دەبرا...

باقی لیستەکەی دەزانی. باسی قەشە، بە خۆیان و قۆڵی فشوفۆڵیانەوە. باسی حاکم و



ڕۆبی خز و لووسیان، جێی خراپەکاری، زەخیرە، بەرداش، پشیلە نۆ کلکە، زیافەتی جەنابی قایمقام و ماچکردنی پەنجەی پێی پاپا. شتێکی تریش هەبوو کە ناوی (مافی سەرەتایی گەل) بوو کە ڕەنگە لە کتێبی منداڵاندا باس نەکرابێ.

چۆن دەزاندرا ئەوانە چەند ڕاستن؟. لەوانەیە ڕاست بێ و ژیانی ئێستا لە ژیانی پێش شۆڕش خۆشتر بێ. تاکە بەرپەرچدانەوەیەک هەبووبێ، هەر ئەوە بوو کە لە جەستەدا هەست پێ دەکرا. هەستێکی خۆڕسک ڕایدەگەیاند کە دەبێ ڕۆژێ لە ڕۆژان، ژیان جۆرێکی تر بووبێ. پێی وابوو ئەوەی ئەم ژیانەی ئێستای ناخۆش کردووە تەنها ڕەنج و نائاسودەیی نیە بەڵکو ساردوسڕی و پیسوپۆخڵی شێوەکەیەتی. ئەگەر پیاو بە دەوری خۆیدا بڕوانێ، دەبینێ ئەوەی هەیە، چ لێکچوونێکی لەگەڵ ئەو درۆیانەدا نییە کە تەلەسکرین هەڵیدەڕشتن. لەگەڵ ئەو بۆچوونانەشدا وێک نەدەهاتنەوە کە حیزب باسی دەکردن. تەنانەت ئەندامەکانی پاینی حیزبیش دەبوو کاری ناڕەحەت ئەنجام بدەن و لە وێستگەی شەمەنەفەری ژێر زەویدا، هەڵپەی دۆزینەوەی پەنایەک بکەن، کۆنە گۆرەوی پینە بکەن، کلۆقەند لێک بخوازنەوە و قونکەجگەرە پاشەکەوت بکەن. پەیامەکانی حیزب، گەورە و تۆقێنەر و بریقەدار بوون – دنیایەکی پۆڵا و چەمەنتۆڕێژ، مەکینەی زەبەلاح و چەکی تۆقێنەر – میللەتێکی تەواوی شەرکەر و توندڕەو، کە لە یەک یەکەدا وێکڕا پێش کەوێ. هەموو یەک جۆرە بیرکردنەوەیان هەبێ و یەک دروشم بڵێنەوە و تا هەتایە کار بکەن و شەڕ بکەن و سەرکەون و لە سێدارە بدرێن. سێ سەد ملیۆن بنیادەم هاوسیما بن. واقعی شاری وێرانە ئەوە بوو کە ئەو خەڵکە برسییە پێڵاو دڕاوە بێن و بچن، لە خانووی چاککراوی سەدەی نۆزدەدا بژێن کە بۆنی کەلەمی کوڵاو و ئاودەستیان لێ دەهات. شاری لەندەنی پێ وا بوو: شارێکی گەورەی یەک ملیۆن زبڵدان پارسۆنز خانمیش بە خۆ وقژی ژاکاو و سیمای لۆچاوییەوە کە لە دەست بۆڕی زێراب حەلوەلایەتی، بەشێکە لەو شارە.

دەستی بردە خوارێ و برینەکەی خوراند. تەلەسکرین، شەو و ڕۆژ ژمارەی دەپەستایە کەللەی خەڵکەوە تا باوەڕ بهێنن، کە خەڵکی لەو سەردەمەدا، خۆراکی چاکتر و پۆشاکی چاکتر و خانووبەرەی چاکتریان هەیە. تەمەنیان درێژە، کاری کەمتر دەکەن، لە بنیادەمی بەر لە پەنجا ساڵ ساغتر و زلتر و خۆشحاڵتر و بەهۆشتر و خوێندەوارترن. هەرگیز نەدەکرا ئەو گوتانە بە درۆ یا بە ڕاست بخرێنەوە. حیزب ڕایدەگەیاند کە ٤٥ لە سەدای کرێکاران بە سەوادن. دەشگوترا ڕادەی خوێندەواری کرێکارانی بەر لە شۆڕش لە سەدا ١٥ بووە. حیزب ڕایدەگەیاند کە ڕادەی مردنی منداڵ بەر لە شۆڕش لە هەزاردا سێ سەد بووە و

ئێستا تەنها سەد و شێستە... هتد. ئیدی ببوو بە هاوکێشەیەک کە دوو نەزاندراوی تێدا بن. ئەوەندەی ئەم پەی پێ دەبرد، شتێ نەبوو ناوی (مافی سەرەتایی گەل) بووبێ یا شتێ بە ناوی سەرمایەدار یا کلاوی قووچ هەبووبێ.

هەموو شتێ تەماوی بوو. ڕابردوو دەسڕدرایەوە، ڕووداوەکان بیر دەچوونەوە و درۆ وەک ڕاستییەک جێی خۆی دەگرت. لە هەموو تەمەنیدا تەنها یەک جار - پێش ڕوودانی ڕووداوێک، بەڵگەی تەواوی، لە گۆڕینی ڕاستیدا، لە بەردەستدا هەبوو. ئەو بەڵگەیەی بۆ ماوەی سیی چرکەی تەواو لە مشتدا بوو. پێ دەچوو ساڵی ١٩٧٣بووبێ - بە هەر حاڵ، ئەو ساڵە بوو کە لە کاترین دابڕا. بەڵام مێژوو حەوت هەشت ساڵی بەرلە خۆی دەگرتەوە. ئەو داستانە، لە ڕاستیدا لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە دەستی پێ کرد. واتە ئەو دەمەی کە پاکسازییە گەورەکان ئەنجام دەدران و ڕێبەرە ڕاستەقینەکانی شۆڕش لەناو دەبران. تا ساڵی ١٩٧٠ ، ڕێبەری گەورە نەبێ کەسی تریان لێ نەما. ئەو نەبێ، هەموو ئەوانی دی بە تۆمەتی خیانەت و دژایەتیکردنی شۆڕش ناویان زڕا. گۆڵدستەین هەڵات و خۆی لە جێیەک حەشار دا کە کەس پەی پێ نەبا. ئەوانی دی هێندێکیان ون بوون و هێندێکیان، دوای ئەوەی تاوانی خۆیان بە دادگا ڕادەگەیاند لە دار دەدران. لە ناو ئەوانەی کە مابوونەوە، سێ کەس هەبوون کە ناویان جۆنز، ئارنسۆن و ڕاتەرفۆرد بوو. دەبێ ساڵی ١٩٦٥ ئەو سێیە دەسگیر کرابن. وەک هەموو دەمێ ڕووی دەدا، ئەوانیش ماوەی ساڵێ یا زیاتر ون بوون و کەس بە مان و نەمانیانی نەدەزانی. لە پڕێکدا دەرکەوتنەوە تا دان بە تاوانی خۆیاندا بنێن. دانیان پێدا نا: سیخوڕی دوژمن بوون (ئەو دەمە ئەوروئاسیا دوژمن بوو)، دزییان لە میللەت کردبوو، چەند ئەندامێکی جێ باوەڕی حیزبیان کوشتبوو، زۆر بەر لە ڕوودانی شۆڕش پیلانیان لە ڕێبەری گەورە کردبوو. کردەوەیان ببوو بە هۆی مەرگی سەدان و هەزاران کەس. دوای ئەوە، لێبوردنیان بۆ دەرچوو و لە حیزب وەرگیرانەوە و کاری سەرگەرمکردنی وایان پێ سپێردرا کە پارەی باشی تێدا بێ. بەڵام بە کاری گرینگیش دەچوو. هەر یەکەیان تۆبە و ژیوانبوونەوەی خۆی لە تایمزدا بڵاو کردەوە و بەڵێنیان دا تۆڵەی ڕابردووی خۆیان بکەنەوە.

ماوەیەک دوای ئازادبوونیان، وینستۆن هەرسێکیانی لە (باڕی داربەڕوو)دا دیبوون. بیری کەوتەوە کە بە چ ڕێزێکەوە، بە تیلەی چاو سەیری کردن. لە خۆی بە تەمەنتر بوون. پاشماوەی ڕۆژانی زوو، دوا گەورەپیاوانی نەکوژراوی سەردەمی قارەمانێتی حیزب بوون. گەورەیی خەباتی نهێنی و شەڕی ناوخۆیان هێشتا بە سیماوە دیار بوو. هەرچەندە مێژووی



کۆن دەگۆڕدرا و لێی دەسڕدرایەوە، بەڵام ئەم دەیزانی کە ناوی ئەمانی بەر لە چەند ساڵێ، لە پێش ناوی ڕێبەری گەورەدا بیستبوو. وەک پەلەوەر ئازاد بوون، دوژمن بوون، دەستیان پێوە نەدەدرا بەڵام دیار بوو لە ماوەی یەک دوو ساڵی تردا لە ناو دەبردرێن. کەس نەبوو کەوتبێتە داوی پۆلیسی خەیاڵەوە و خەلەسابێ. دەتگوت چاوەڕوانی ئەوەیانە بۆ گۆڕیان بگێڕنەوە.

مێزەکانی دەوروبەریان چۆڵ بوون. نزیکبوونەوە لە کەسانی وا، کارێکی ژیرانە نەبوو. بە بێ دەنگیی دانیشتبوون و پەرداخە (جن)ی تام مێخەکیان لە بەردەم بوو. قەڵافەتی ڕۆتەرفۆرد لە ناویاندا، سرنجی وینستۆنی ڕادەکێشا. ڕۆتەرفۆرد، ماوەیەکی پێش شۆڕش وماوەیەکی دوای شۆڕشیش نیگاری کاریکاتێری دەکێشا و سەرنجی جەماوەری ڕادەکێشا. ئێستاش، جاروبارێ کاریکاتێرەکانی لە تایمزدا بڵاو دەبوونەوە. سیمایان کۆنینە بوو بەڵام وەک بێ گیان وابوون و خۆیان بەختەوەر پێشان دەدا. ئەوان، زیندووکەرەوەی ڕۆژانی کۆن بوون - شاری وێران، منداڵی سەردەمی قاتوقڕی، شەڕی شەقامەکان، سەرمایەداری کڵاو قووچ (ڕەنگە سەرمایەداران لە سەنگەریشدا ئەو کڵاوانەیان لە سەر نابێ) - بێ هومێدییەکی بێ بڕانەوە، بۆ گەڕانەوە بەرەو ڕابردوو. لاوێکی بەخۆ بوو. قژی کاڵ و چەور بوو. ڕوخساری وەک کەوگیر و لێوی پێکەوە نووسابوون. دەبێ سەردەمێ دەسەڵاتی هەبووبێ. ئێستا، هەموو جەستە زلەکەی دادەڕما. دەتگوت شاخێکە و بە بەر چاوی ئەو عالەمەوە هەرەس دەهێنێ.

سەعات یازدە بوو. وینستۆن نەیدەزانی بۆ لە کاتێکی ئاوهای ڕۆژدا ڕووی لەو باڕە کردووە. باڕەکە مەیلەو چۆڵ بوو. ئاوازێکی ناسک لە تەلەسکرینەکەوە دەهات. ئەو سێ کەسە، بە زمانی بەستراوەوە و بە بێ جووڵە دانیشتبوون. (بۆی)ە کە، بێ ئەوەی پێی گوترابێ، سێ پەرداخ جنی تری بۆ هێنان. لە تەنیشتیانەوە، شەترەنجێ دانرابوو و داشەکانی ڕیز کرابوون بەڵام یاری پێ نەکرابوو. لە پڕێکدا، ڕەنگە لە ماوەی نیو دەقیقەدا بووبێ، لە تەلەسکرینەکەوە شتێ ڕووی دا. ئاوازەکەی پێشا گۆڕا. بوو بە ئاوازێ کە بە زەحمەت باس دەکرێ. ئاوازێکی سەیر، وشک، نەڕەنەڕکەر، گاڵتەجاڕ. وینستۆن لە دڵی خۆیدا ناوی ئاوازی زەردی لێ نا.دوایی دەنگێ لە تەلەسکرینەکەوە دەستی بە خوێندنەوە کرد:

لە ژێر داربەڕووە گەورەکەدا، ڕۆژباش
دەسخەڕۆم کردی دەسخەڕۆت کردم:

ئەوەی لەوێ درۆ بکا، درۆ ناکا

لە ژێر داربەڕووە گەورەکەدا، نا نایکا

سێ پیاوەکە نەبزوان. وینستۆن سەرنجی ڕوخساری تێکشکاوی (ڕۆتەر فۆرد)ی دا، چاوی پڕ لە ئەشکی بینی. ناخی، لەرزێکی سەیری لێ نیشت کە خۆشی نەیدەزانی چ لەرزێ بوو. بە دەم ئەو لەرزەوە، بۆ یەکەم جار زانی کە کەپووی ئارینسۆن و ڕۆتەرفۆرد شکاون.

پاش ماوەیەک، هەرسێکیان دەسگیر کرانەوە. ئاشکرا بوو کە هەر لە کاتی بەربوونیانەوە، بەشداری پیلانی نوێیان کردووە. لە دادگای دووەمیاندا، سەرلەنوێوە دانیان بە تاوانی خۆیاندا نا و ریزێ تاوانی تریشیان خستنە پاڵ. هەرسێکیان هەڵواسران و سەرگوزەشتەیان خرایە مێژووی حیزبەوە تا لە داهاتوودا دەرسیان لێ وەرگیرێ. دەوری پێنج ساڵ بەر لەو ڕووداوە، ساڵی **١٩٧٣**، وینستۆن بە لوولەی داهاتدا نوشتە قاقەزێکی پێ گەیشتبوو ولێی عەیان بوو کە بە ڕێکەوت لەوێوە هاتوە و بیر کراوە. کردیەوە، ڕێکی خست و گرینگیی بۆ دەرکەوت. لاپەڕەیەکی تایمزی بەر لە دە ساڵ بوو. لاپەڕەی یەکەمیش بوو چونکە مێژووی لە سەر بوو. وێنەی پەیامنێرانی لە سەر بوو کە سەفەری نیویۆرکیان کردبوو. وێنەی جۆنز و ئارسۆن و ڕۆتەرفۆرد، لە ناو گرووپێکی بەرجەستە و لێهاتووی حیزبدا، بەرچاو دەکەوتن. ناویان بە درشتی لە خوار لاپەڕەکەوە نووسرابوو و ئەوەش گشت گومانێکی دەڕەواندەوە.

مەسەلەکەش لەوەدا بوو کە هەرسێکیان، لە هەردوو دادگاکاندا، دانیان بەوەدا نابوو کە لەو کاتەدا لە ناو خاکی ئەوروئاسیادا بوون. لە ئۆردوگایەکی نهێنی کەنەداوە، بۆ کۆبونەوە، بەرەو سیبریا فڕیون. لەو کۆبوونەوەیەدا، گفتوگۆیان لەگەڵ ئەندامانی بەرزی ئەوروئاسیادا کردووە و نهێنی گرینگیان خستوونەتە بەر دەست. ئەو مێژووە لە هۆشی وینستۆندا جۆش درابوو چونکە ڕۆژی ناوەڕاستی هاوین بوو: بەڵام سەرجەمی داستانەکە، لە سەرچاوەی بێ شوماری تردا تۆمار کرابوو. تەنها یەک ئەنجام لە زەیندا مابۆوە: دانپێدانانەکان درۆ بوون.

دیارە ئەم بۆچوونە پسپۆریی پێ نەدەویست. وینستۆن بیری لەوەش نەدەکردەوە کە ئەوانەی لە پاکسازیەکاندا لە بەین دەچوون، بە هۆی تاوانەوە بووبێ. ئەمە بەڵگەیەکی زیندوو بوو، لایاکی سڕدراوەی ڕابردوو بوو. بە ئێسقانێکی بە بەردبوو دەچوو کە لە لایەکەوە دەرکەوێ و تیۆرییە جیۆلۆجیەکان بە درۆ بخاتەوە. ئەگەر لە جێیەک بنووسرابا و



بەر گوێی دنیا کەوتبا، بۆ ئەوە بەس بوو پایەکانی حیزب لە بنەوەڕا هەڵتەکێنێ.

دەمودەست دەست بە کار بوو. هەر کە پەی بە چەندوچۆنی وێنەکە برد، بە قاقەزێکی دی دایپۆشی. کە یەکالآشی کردەوە، خۆشبەختانە لە تەلەسکرینەکەوە دیار نەبوو.

دەفتەرەکەی لە سەر چۆکان دانا و کورسییەکەی وا ڕێک خست کە بتوانێ لە تەلەسکرینەکە پەنهان بێ. پیاو دەیتوانی بە سەر هەناسەبڕکەی خۆیدا زاڵ بێ بەڵام هیچ لەگەڵ تەپەتەپی دڵدا نەدەکرا و تەلەسکرینەکەش تا ئەو ڕادەیە توانای هەبوو وەریگرێ. ماوەی دە دەقیقە، لە ترسان کشومات بوو - بۆ نموونە، نەک شتێ بەر مێزەکە بکەوێ - و ئیدی بپێچرێتەوە. لە هەموو ئەو ماوەیەدا دەتلایەوە. دەستی دایە وێنەکە. بێ ئەوەی قاقەزەکەی سەری وەلا نێ، لەگەڵ هێندێ قاقەزەشڕی تردا هاویشتیە چاڵی خەیاڵەوە. ڕەنگە دوای یەک دەقیقە بووبێتە مشکی.

ئەم باسە، دە یا یازدە ساڵی بە سەردا تێپەڕیبوو. ئەگەر ئێستا بوایە، ڕەنگە وێنەکەی لە لای خۆی گل داباوە. ئەوەی گومانی تێدا نەبوو ئەوە بوو کە وێنەکەی بە دەستی خۆیەوە گرتبوو و ئێستاش هەستی بە بوونی دەکرد. وێنەکەش وەک ئەو هەواڵەی باسی لێوە دەکرد، تەنها یادگارییەک بوو. بە خەیاڵیدا هات: توانا و دەسەڵاتی حیزب بە سەر ڕابردوودا لەوە کەمتر نەبوون کە ئەو بەڵگانەی لە ئارادا هەبوون، جارێ لە جاران بوونیان بووبێ؟.

ڕەنگە ئەو وێنەیە چی دی بەڵگە نەبێ با بە شێوەیەک لە شێوەکان، لە ناو خۆڵەمێشەکەشەوە سەرهەڵداتەوە. هەر ئەو دەمە بۆی دەرکەوت کە ئۆقیانووسیەکان لەگەڵ ئەوروئاسیادا لە شەڕدا نەبوون. جا دەبێ ئەو سیانە خۆیان بە پیاوانی ئەوروئاسیا نەفرۆشتبێ. لە دوای ئەو سەردەمەوە، گۆڕان پەیدا ببوون - دوو یا سێ، ژمارەیانی لە بیر نەمابوو. پێ دەچوو ڕووداوەکان ئەوەندە گۆڕدرابن ئیدی مێژوویان بایەخی نەمابێ. ڕابردوو، تەنها نەدەگۆڕدرا، بەڵکو بە بەردەوامی دەسکاری دەکرا. ئەوەی لە هەموو شتێ زیاتر لێی ببوو بە خولیا ئەوە بوو نەیدەزانی "لە بەر چی" ئەو گۆڕانکاریانە ئەنجام دەدرێن. دیسان قەڵەمەکەی هەڵگرتەوە و نووسی:

دەزانم چۆن: نازانم بۆ.

وەک گەلێ جار، ئەم جارەش لە خۆی پرسی کە دەبێ تێکنەچووبێ. کەسێ تێک چووبێ کەسێکی کەمایەتییە. زەمانێ، تێکچوون ئەوە بوو باوەڕت وا بێ کە زەوی بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە. ئەمڕۆش ئەوەیە باوەڕت وابێ کە ڕابردوو نایەتە گۆڕان. ڕەنگە ئەم،

لەو بوارەدا تاکە کەس بێ و بەو پێیەش دەبێ تێک چووبێ. بیرکردنەوە لە شێتبوون ئازاری دەدا. ئەوەی کە بە ڕاستی مایەی خەم بوو: دوور نەبوو بە هەڵەدا چووبێ.

(کتێبی مێژوو)ی منداڵانی هێنا و لە نیگاری ڕێبەری گەورە ڕاما کە بە بەرگەکەیەوە بوو. چاوە تەلیسماوییەکانی سەیری چاوی ئەمیان دەکرد: دەتگوت وزەیەکی مەزن خۆی بە کەللەتدا دەکا و مۆخت دەکوتێ و وات دەتۆقێنێ لە باوەڕی خۆت ژیوان ببیەوە و بەڵگەی زەینی خۆت بەدرۆ بخەیتەوە. لە ئەنجامدا، حیزب ڕایدەگەیاند کە دوو و دوو دەکاتە پێنج. دەبوو باوەڕت بەو ئەنجامە هەبێ. ئەوەش پێداویستییەک بوو، زوو یا درەنگ دووچاری دەبوویت: لۆژیکی بارودۆخەکە ئەوەی دەخواست. تەنها یاسا سەپاوەکانی ژیانی ڕۆژانە وا نەبوون بەڵکو خودی بۆچوونی دەرەکی کە لە بۆچوونەکاندا دەردەکەوت لە لایەن فەلسەفەی حیزبەوە بە درۆ دەخرایەوە. هۆشی ساغ باوکی ڕافزیگەری بوو. ژیانت بە هۆی بیرکردنەوەی جیاوازەوە لە مەترسیدا بوو. مەترسیش لەوەدا بوو کە بۆچوونەکان ڕاست بن. ئاخر چۆن بزانین دوو و دوو دەکاتە چوار؛ یا کێشی زەوی بوونی هەیە؟. یا ڕابردوو دەسکاری ناکرێ؟. ئەگەر ڕابردوو و واقعی دەرەکی هەر لە خەیاڵدا بوونیان هەبێ و خودی خەیاڵیش دەسکاری بکرێ – چۆن دەبێ؟.

بەڵام نا!. دەتگوت لە پڕێکدا و هەر لەخۆڕا گێچی ئازایەتی بەرز بۆتەوە. سیمای ئۆبراین، لە خۆڕا و لە پڕێکدا خۆی کوتایە هۆشیەوە. لە جاران دڵنیاتر بوو کە ئۆبراین لایەنگرێتی. یاداشتەکانی بۆ ئۆبراین دەنووسێ – بۆ ئۆبراین: بە نامەیەکی بێ کۆتایی دەچوو کە هەرگیز نەخوێندرێتەوە. ئاراستەی کەسێکی دیاریکراو کرابو و لەوەدا ڕەنگی خۆی دابۆوە. بەڵام حیزب دەیگوت دەبێ بەڵگەی بیستراو و بیندراو وەلا نێی. ئەوە فەرمانی بنەڕەتیی و گرینگیان بوو. کاتێ بیری لەو هێزە زەبەلاحە دەکردەوە کە بەرەنگاری بۆتەوە، دڵی دادەخورپا. هاسان بوو ڕووناکبیرانی حیزب بیخەنە بەر لێکۆڵینەوە کە ئەوەش لە توانای هۆشی ئەمدا نەبوو چجای بەرپەرچیان بداتەوە. هێشتا هەر ئەم ڕاست بوو و ئەوان هەڵە. دەبوو بەرگری لە بەڵگەنەویستەکان و بێ عەقڵییەکان بکا. ڕاستی لە سەر هەقە!. دنیای پتەو بوونی هەیە و یاسا ناگۆڕێ. بەرد ڕەقە و ئاو تەڕە. جەستەی ڕەها بەرەو چەقی زەوی هەڵدەکوتێ. کە هەستی دەکرد بۆ ئۆبراین دەدوێ و بابەتێکی گرینگی خستۆتە ڕوو، نووسی:

سەربەستی کاتێ سەربەستییە کە بتوانی بڵێی: دوو و دوو دەکاتە چوار. ئەگەر باوەڕ بەمە بهێندرێ، ئیدی هەموو شتەکانی دی، خۆیان بە دوویدا دێن.



## ٨

لە بنی کۆریدۆرەکەوە، لەوسەرەوە، بۆنی قاوەی تازە لێنراو دەهات – قاوەی ڕاستەقینە نەک "قاوەی سەرکەوتن"- بۆنەکە، دەگەیشتە شەقامەکە و بە هەوادا پەرت دەبوو. وینستۆن، هەر لەخۆڕا ساوەساوی کرد. ڕەنگە ماوەی یەک دوو چرکە، بۆ جیهانی نیوە لەبیرچووی سەردەمی منداڵی گەڕابێتەوە. دەرگا داخرا و بۆنی قاوەکە، وەک ئەوەی دەنگێ بووبێ، بڕا.

چەند کیلۆمەترێ بە سەر شۆستەکاندا پیاسەی کردبوو و زامەکەی ئازاری دەدا. لە ماوەی سێ حەفتەدا، ئەوە دووەم جاری بوو بەشداری کۆبوونەوە نەبێ. ئەمەش کارێکی سەرکێشانە بوو. ئەوەی بەشدار نەبوایە، بە دڵنیاییەوە چاودێری دەکرا. لە ڕاستیدا، ئەندامانی حیزب چ کاتی ئەوەیان نەبوو تەنها بن لە سەر نوێنی خەوتن نەبێ. دەبوو هەموو دەمێ – کاتی کار و نوستن و خواردنی لێ دەرچێ – لە ڕاهێنانی دەستەجەمعیدا بەشدار بن. ئەنجامی هەر ڕەفتارێ کە بەرەو تەنهایی بڕۆیشتبا، مەترسی بوو. دەقێکی تایبەتی لە (گۆتەی نوێ)دا بە ناوی (ژیانی خۆیی)یەوە هەبوو کە واتای تاکڕەوی و ڕیزپەڕی دەگرتەوە. بەڵام ئەمڕۆ وینستۆن کە دەستی لە کار بەر بوو، هەوای مانگی نیسان فریوی دا. عاسمان شینێکی سەرنجڕاکێش بوو و ئەو ساڵە، بۆ یەکەم جار وای دیبوو، و ڕۆژی دوور و درێژی بە سەرهێشەی کار، ڕاهێنانی وەرسکەر و ماندووکەر، دەمەتەقێ و هاوڕێیەتی ژەنگگرتوو کە بە جن خاوێن دەکرایەوە، لە وزە بە دەر بوون. کتوپڕ، لە وێستگەی پاسەکانەوە بە پەلە وەرچەرخا و بەرەو دواوە گەڕایەوە. ملی نایە کۆڵانە بێ سەروبەرەکانی لەندەنەوە. بەرەو خوار ڕۆیی و دوایی ڕووەو ڕۆژهەڵات و ئەوجا بەرەو سەرێ. لە ناو کۆڵانە نەناسراوەکاندا خۆی گوم کرد و بیریشی لەوە نەکردەوە ئاخۆ بەرەو کوێ دەچێ.

لە دەفتەری یاداشتەکەیدا نووسیبووی:" ئەگەر ئومێدێ هەبێ تەنها پرۆلیتارە." ئەوەی زوو زوو دەگوتەوە. وشەکان ناوەڕۆکی ڕاستی وسۆفیگەرانە و بەربەستی زەقیان هەبوو. جار و بارێ خۆی لە گەڕەکی ساکاری هەژارانی لای سەرەوە و لای ڕۆژهەڵاتەوە دەدی. ئەو شوێنەی کە سەردەمێ وێستگەی (سێن پانکراس) بوو. بە کۆڵانە بەردڕێژەکەدا هەڵگەڕا کە خانووەکانی دوو نهۆمی بچووک بوون و دەرگا خواروخێچەکانیان بە سەر شۆستەکاندا دەکرانەوە و بە جۆرێکی سەیر لە کونەمشک دەچوون. ئێرە و ئەوێی ناو بەردەکان چڵکاو

بوو. ژوورەوە و دەرەوەی دەرگا تاریکەکان، لە خەڵک جمەیان دەهات – کچە عازەبەکان بە نارێکی لێوی خۆیان ئارایش کردبوو، کوڕ و کاڵ دوای کچان دەکەوتن، ژنی پفدراو و جرپن، پێشانیان دەدا کە ئەو کیژانەش دە ساڵی دی چۆن دەبن، خەلقەندەی پیر و چەماوە، بە پێی پانەوە، بەرەو پێش دەکشان، منداڵی پێخاوس و شڕ و وڕ، لە ناو چڵکاوەکاندا کایەیان دەکرد و لە قیژە و هەرای دایکانیان دوور کەوتبوونەوە. دوو ژنی کەتە، باسکی سوورخنیان ڕاست و چەپ، لە سەر بەرهەڵبێنەکانیان دانابوون، لە بەر دەرگایەک قسانیان دەکرد. کە وینستۆن لێیان نزیک کەوتەوە گوێی لێیان بوو:

– گوتم بەڵێ دەتوانی. گوتم بەلانەکینێ لە جێی من بای هەر وەکی من دەبووی. ڕەخنەگرتن هاسانە. گوتم بەلام کێشەی من لەگەڵ ئی تۆ جیاوازە.

ئەوی تریان گوتی: بەڵێ وایە. هەر ڕێک ئەوەیە کە دەیڵێی.

لە پڕێکدا دەنگەدەنگ بڕا. ژنەکان، وینستۆنیان لە بێدەنگییەکی دوژمنانەدا پێچایەوە بەلام ئەم ڕەت بوو. بە تەواوی دوژمنانە نەبوو؛ جۆرە سڵکردنەوەیەک بوو، وریایییەکی کتوپڕ و گرژبوونەوەی ماسولکە بوو وەک ئەوەی ئاژەڵێکی نا ئاشنا ڕەت بووبێ. جلی حیزب، لە گەڕەکی وادا کەم بیندرابوو. لە ڕاستیدا، خۆ دەرخستن بەو جلانەوە و لە جێی وادا، ئەگەر بۆ مەبەستێکی دیاریکراو نەبێ کارێکی ژیرانە نەبوو. پیاو تووشی مەفرەزە بوایە ڕادەگیرا:

"هاوڕێ یارمەتی هەیە پێناسەکەتمان وێدەی؟. لێرە چ دەکەی؟. سەعات چەند لە کار بوویتەوە؟. هەموو دەمێ لێرەوەڕا دەچییەوە ماڵێ؟. و.... هتد. مەسەلە لەوەدا نەبوو یاسایەکی تایبەتی بۆ ڕێی گەڕانەوە بووبێ، بەڵکو لەوەدا بوو پۆلیسی خەیاڵ پێت بزانێ.

کتوپڕ، لە گشت لایەکی کۆلانەکەوە جموجووڵ پەیدا بوو. خەڵکی خرۆشان و هاواری بە ترسیان لێ هەستا. خەڵکەکە، وەک کەروێشک بەرەو دەرگاکان دەیانکوتا. ژنێکی گەنج، لە دەرگایەکی نزیک وینستۆنەوە، بە گورجی دەرکەوت و پەلی منداڵێکی دەست داپێ کە بە دیار چالاوێکەوە کایەی دەکرد و بردیە ژوورێ. هەر ئەو دەمە پیاوێک بە فەرەوەیەکی خەتخەتەوە، بە ڕاکردن لە کۆلانێکەوە بەرەو ڕووی وینستۆن دەهات و دەستی بۆ حەوا هەڵدەبڕی و هاواری دەکرد:" کەشتی هەڵم!. ئاگادار بە گەورەم! بە سەر سەرمانەوەیە! خۆت بە عاردیدا دە!."

"کەشتی هەڵم" ناوێ بوو کە کارگەران بە بۆمبای موشەکیان دەگوت. وینستۆن، لە جێی



خۆی، خۆی بە زەویدا دا. زۆربەی کات، کرێکاران، لە بارودۆخی وادا ڕاستیان دەکرد. هەرچەندە مووشەک لە خێرایی دەنگ تیژتر بو، بەلام ئەوان، دەتگوت غەریزەیەکیان هەیە و چەند چرکەیەک بەر لە هاتنی مووشەک هەواڵیان دەداتێ. وینستۆن، هەردوو مەچەکی خستنە سەر سەری. هاژەیەک هات، دەتگوت کۆلانەکە هەڵدەتەکێ. کۆمەڵێ چیلکەوچواڵ بە سەر سەریدا داباری. کە ڕاست بووەوە، هەموو جەستەی وردەشووشەی پەنجەرەکەی تەنیشتی بوو.

ڕێی خۆی گرتەوە بەر. بۆمباکە، دووسەد مەترێ لەولاترەوە چەند خانوویەکی وێران کردبوو. دوکەڵێکی ڕەش، وەک ستوون بەرەو عاسمان دەچوو و لە خواریشەوە تەپوتۆز بوو و خەڵکی، لە ناو وێرانەکاندا گرد ببوونەوە. شتێکی وەک پارچە گەچ لەسەر شۆستەکە کەوتبوو و ناوەڕاستی سوور بوو. کە لێی نزیک کەوتەوە، بینی دەستێکە و لە مەچەکەوەڕا بڕدراوە. پاشماوەی ئەو دەستە خوێناوییە هێند سپی بوو بە گەچ دەچوو. بە نووکە شەقێ هاویشتیە جۆگاکەوە. بۆ ئەوەی خۆی لە حەشاماتەکە لا بدا، بە لای ڕاستدا، بە کۆلانێکی تردا لای دا. دوای سێ و چوار دەقیقە، لە ناوچە بۆردمانکراوەکە دوور کەوتەوە. جموجۆڵی پۆخڵی کۆلانەکان، وەک ئەوەی هیچ نەقەومابێ، بەردەوام بوو. سەعات دەوری بیست بوو و ئەو بارانەی کە کرێکاران دەیچوونێ (مەیخانەیان پێ دەگوتن) جمەیان دەهات. بۆنی داری ڕزیو و مێز و بیرەی ترشاویان لە دەرگا خواروخێچەکانەوە لێ دەهات کە بەردەوام دەکرانەوە و دادەخرانەوە. لە گۆشەیەکدا، سێ کوڕی گەنج سەریان پێکەوە نابوو و لە بەردەم ماڵێکدا کە دیواری زگی دابوو وێستابوون. ئەوەی ناوەڕاستەوە ڕۆژنامەیەکی بە دەستەوە بوو و ئەوانی تر لە سەر شانی ئەوەوە دەیانخوێندەوە. بەر لەوەی بگاتە عاستیان، بە ڕوخساریاندا زانی کە بە تەواوی سەرگەرمی ڕۆژنامەکەن. دیار بوو باسێکی گرینگیان دەخوێندەوە. چەند هەنگاوێکی مابوو بیانگاتێ، کتوپڕ لێک دابڕان و دووانیان بوو بە هەرایان. هێندەی نەمابوو یەکتر داکوتن.

– نابێ گوێم لێ بگری؟. من دەزانم ئەو ژمارەیەی کە بە حەوت کۆتایی دێ، بە لای کەمەوە چوار مانگ دەبێ نەیبردۆتەوە.

– نەخێر، من دەڵێم بردوویەتییەوە.

– ئاخر نەیبردۆتەوە!. لە ماڵەوە هەمووم هەن. دوو ساڵە لە دەفتەرێکدا دەیاننووسم. لە بەر ئەوە دەڵێم ئەو ژمارەیەی کە بە حەوت کۆتایی دێ...

– ئیللا و بیللا بردوویەتیەوە!. با پێشت بێژم کامە ژمارە: بە ٤٠٧ کۆتایی دێ. مانگی ڕەشەمێ بوو... دووەم حەفتەی ڕەشەمێ.

– ڕەشەمێت گوت نەنکە گیان؟. من دەڵێم کە ژمارە...

سێیەمیان گوتی: – دە بیبڕنەوە!.

باسی پیتاقەیان دەکرد. کە وینستۆن سیی هەنگاو لێیان دوور کەوتەوە، ئاوڕی لێ دانەوە و دیتی هێشتا هەر مشتومڕیان بوو. پیتاقەی (یانسیب)ی حەفتانە و هەموو حەفتەیەکیش قازانجی زۆر، تاکە شتێ بوو کە کرێکارانی بە لای خۆیدا ڕادەکێشا. پیتاقە، بۆ چەند ملیۆنێ کرێکار، ئەگەر تاکە هۆی مانەوە نەبووبێ، ئەوا هۆی سەرەکی بوو. مایەی خۆشییان بوو، بابەتی ڕابواردنیان بوو، دەرمانی بەنجکردنیان بوو، ماتۆڕی خولاندنەوەی خۆیان و هۆشیان بوو. بە هۆی پیتاقەوە، تەنانەت ئەوانەش کە کەمێ خوێندەوارییان هەبوو، سەریان لە حیساباتی وا دەردەچوو کە کەللەیان سڕ دەکرد. کۆمەڵێ خەڵک، بە هۆی بەختنامە و زارهەڵدان و جادووەوە دەژیان. وینستۆن کاری بە ڕاکێشانی ژمارەکانەوە نەبوو کە لە وەزارەتی فراوانییەوە ئەنجام دەدرا. بەڵام دەیزانی (لە ڕاستیدا گشت ئەندامانی حیزب دەیانزانی) کە بەرەندەی خەڵاتەکان گەلێ جار خەیاڵیی بوون و هەر بەرەندە گچکەکان کەمێ پووڵیان پێ دەدرا. بەرەندەی گەورە، خەڵکانێکی (نەبوو) بوون. لە بەر ئەوەی بەشەکانی ئۆقیانووسیا پەیوەندییان پێکەوە نەبوو، مەیسەر کردنی ئەو کارە دژوار نەبوو.

بەڵام ئەگەر هومێدێ هەبێ هەر پرۆلیتارە. دەبێ خۆت بەوەوە گرێ بدەی. گوتەکە لەبار بوو: کە پیاو لە سیمای خەڵکی سەر شەقامەکە ورد دەبووەوە، دەبوو ئەو باوەڕەی هەبێ. ئەو شەقامەی پێیدا ڕەت دەبوو سەرەوخوار بوو. پێی وابوو کە جارێ لە جاران ئەوێی دیوە و شەقامێکی سەرەکیشی لێوە نزیک بوو. لە پێش خۆیەوە، گوێی لە بگرەو بەردەیەکی زۆر بوو. ئەو شەقامەی پێیدا دەڕۆیی دەگەیشتە قالدرمەیەک. دوای پلیکانەکان کۆلانێکی پڕ لە چاڵ وچۆڵ بوو کە تەڕەفرۆش بابەتی خۆیان لێ دانابوو. ئەو دەمە وینستۆن جێیەکەی بیر کەوتەوە. ئەو کۆلانە دەچووەوە سەر شەقامێک ولە سەر کۆلانێکی دواتر کەپێنج دەقیقە ڕێ دەبوو، دوکانی کۆنەفرۆشەکە بوو کە کتێبە سپییەکەی لێ کڕیبوو و کردبووی بە دەفتەری یاداشت. کەمێ لەولاتریشەوە، لە دوکانی دەفتەرفرۆشێکدا، قەلەمدان و مەرەکەبی کڕیبوو.

تاوێ لە سەر پلیکانەکان ڕاوێستا. ڕێک بەرانبەر کۆلانەکە مەیخانەیەکی گچکە بوو کە



پەنجەرەکانی دەتگوت بەستوونی. بەڵام لە ڕاستیدا چینێ گەردیان بە سەرەوە نیشتبوو. پیاوێکی بە ساڵداچووی چەماوە بەڵام بەگوڕ، نووکی سمێڵە سپییەکەی، تیژ و ڕاست بەرەو پێشەوە دەرچووبوون، پاڵی بە دەرگاکەوە نا و وەژوور کەوت. ئەو دەمە، وینستۆن بیری لەوە کردەوە کە تەمەنی کابرا بە لای کەمەوە هەشتا ساڵ دەبێ و دەبێ لە کاتی بەرپابوونی شۆڕشدا مەیانساڵە بووبێ. ئەو و خەڵکی وەکی ئەو، دوا شوێنەواری سەردەمی سەرمایەداری گۆڕکراو بوون. لە ناو حیزبدا، ژمارەی ئەوانەی کە سیمایان دەقی ئەو سەردەمەی پێوە بوو زۆر نەبوو. زۆربەی وەچەی پێشوو، دە دە، پەنجا پەنجا، شەست شەست، لە پاکسازییە گەورەکاندا لەناو دەچوون. ئەو تاکوتەرایەش کە مابوونەوە، سەری خۆوەدەستەوەدانیان کز کردبوو. ئەگەر کەسێکی زیندوو مابێ کە بتوانێ هەواڵێکی سەرەتای ئەو سەدەیەت بداتێ، مەگەر هەر لە ناو کرێکاراندا پەیدا بێ. کتوپڕ، وینستۆن ئەو بڕگەیەی بیر کەوتەوە کە لە کتێبی مێژووی قوتابخانەوە نووسیبوویەوە. دەبێ بچێتە مەیخانەکەوە، دەبێ ئاشنایەتی لەگەڵ ئەو پیاوە پیرەدا پەیدا بکاو پرسیاری لێ بکا. دەبێ بڵێ: باسی ژیانی ئەو دەمەی خۆت بکە کە هەرزەکار بووی. ئەو سەردەمە چۆن بوو؟. لە ئێستا چاکتر بوو یا خراپتر؟

بۆ ئەوەی مەودا بە ترس نەدا، بە پلەکاندا ڕۆیی و بەرەو کۆلانە تەنگەکە لایدا. دیارە ئەم بڕیارەی بڕیارێکی شێتانە بوو. دەقێکی یاسایی نەبوو کە بینینی کرێکار یا چوونە مەیخانەی کرێکاران یاساغ بکا بەڵام لە ڕاستیدا کارێکی نائاسایی بوو و لە بەر چاوان ون نەدەبوو. گەر مەفرەزەی پۆلیس بهاتبا خۆی دەکردە سەرخۆش. بەڵام باوەڕیان پێ دەکرد؟. دەرگای کردەوە و بۆنی ناخۆشی بیرەی ترشاوی بۆ هات. کە وەژوور کەوت، کەمێ دەنگەدەنگ کەم بووەوە. بێ ئەوەی تێیان بڕوانێ، دەیزانی سەیری جلە شینەکانی ئەو دەکەن. گەمەی تیرهاویشتن کە لەوسەرەوە گەرم بوو تاوێ وێستا. کابرای پیرە، لە بەردەم بارەکەدا وێستابوو و لەگەڵ بۆیەکەدا کە کوڕێکی لاو بوو، چەقە و هەرای بوو. هێندێکی دی، پەرداخ بەدەست ڕاوێستابوون و سەیریان دەکرد.

– چما بە ئەدەبەوە داوام لێ نەکردیت؟. گوایە (پنت)[١٦] لەم مەیخانە کاولبووەدا نییە؟.

بۆیەکە کە نووکی پەنجەکانی لە سەر تەختەی بەردەمی نابوون و خۆی بە پشتدا بردبوو، گوتی: پنت چییە؟.

---

١٦ – پنت Pint (٥٦٧ ، ٠)ی لەترێکە.

– ده فەرمـوو تەمـاشای کە!. خۆی بە بۆی دەزانێ و ناشزانێ پنت چییـە!. باشە دەی، پنت نیوەی نیو قاپە. دەبێ ئەلفوبێشت فێر بکەم، ها ؟!.

– نەمبیستـووە. ئێمـە تەنهـا یەک لەتری و نیـو لەتریمان هەیە. ئەها! شووشـەکانیش ئەوەتان لە سەر ئەو ڕەفتە.

کـابرای پیـرە، لە سـەر خـواسـتی خـۆی سـوور بوو: (پنت)ێکم گـەرەکـە پنت. دەتـوانی بەهاسانی بۆم پەیدا کەی. ئەو دەمەی لاو بووم یەکلەتریی سەگباب نەبوو.

بۆیەکە سەیرێکی کرێکارەکانی تری کرد و گوتی:" ئەو دەمەی تۆ لاو بووی ئێمە لە سەر لقی دار دەژیاین." دەنگی پێکەنین بەرز بوەوە و دەتگوت هاتنی وینسـتـۆن بیـر چۆتەوە. ڕوخسـاری سـپـیی پیـرەمـێـردەکـە تەلـخ ببـوو. بە دەم بۆڵەبۆڵەوە وەرچەرخـا و خـۆی بە وینسـتۆندا کـێشـا. وینسـتۆن پێی گـوت: "پەرداخێ لە سـەر حیـسـابی من دەخـۆیەوە؟."
ئەویش شانی ڕاست کردەوە و گوتی: "تۆ پیـاوێکی زەریفیت!". دیار بوو سـەرنجی بەرگە شینەکەی وینستۆنی نەدابوو. بە تووڕەیی بە بۆیەکەی گوت: "پنتێ!".

بۆیەکە دوو پەرداخی لە ناو پەقرەنجێکی گەورەی ژێر بارەکەوە دەرهێنا و وشکی کردنەوە و سەرو نیو لەتر بیرەی قاوەیی تێ کردن. بیرە، تاکە خواردنەوەیەک بوو کە لە مەیخانەی کرێکاراندا چنگ کەوێ. نەدەبوو کرێکار جن بخواتەوە هەرچەندە لە ڕاستیدا، دەیانتوانی زۆر بە هاسانی وەدەستی بێنن. گەمەی تیرهاویشتن دەستی پێ کـردەوە و گـروپ گـروپ، دانیشتوانی مەیخانەکە باسی پیتاقەیان دەکرد. هاتنی وینستۆن کەمێ بیر چووەوە.

مـێـزێکی قـومـار بەلای پەنجـەرەکـەوە بوو. دەیتـوانی لەوێ، بە بێ ترس لە گـەڵ پیـاوە پیرەکەدا بدوێ. جێی مەترسی بوو بەڵام هەرچۆنێ بێ تەلەسکرینی لێ نەبوو. لە بەر ئەوە دڵنیا بوو.

پیرەمێردەکە، بە دەم دانیشـتنەوە گوتی: "دەیتوانی پنتێکم وێدا. نیو لەتر بەش ناکا، پیـاوی پێ تێر نابێ. لەترێکیش زۆر زۆرە و دەبێ بەردەوام بە ڕێی ئاودەسـتـەوە بیت و لە پارەکەشی گەرێ!."

وینسـتـۆن، بۆ دەمبـۆنکردن گـوتی:"دیارە لە سـەردەمی لاوێتی تۆوە گـەلێ گـۆڕانکاری ڕوویان داوە". چاوە شین و سـافـەکـانی پیـرەمـێـردەکـە، لە سـەر مـێـزەکـەوە بۆ بارەکـە و لەوێشـەوە بۆ دەرگـاکـەیان ڕوانی. دەتگوت چاوەڕوانی گۆڕانێکی کـتـوپڕە. دوایی گـوتی: "بیرە چاکـتـر بوو، هەرزانتریش بوو!. ئەو دەمـەی من لاو بووم، بیـرەی چاک، پنتی بە چوار پەنیک بوو. دیارە پێش جەنگ وابوو."



– کام جەنگ؟!.

پیـرەمـێـرد، بە ئاڵۆزییـەوە گـوتی: "هەمـوو جەنگەکـان." پەرداخـەکـەی هەڵگـرت و شـانی ڕاست کردنەوە:"بە سەلامەتیت دەیخۆمەوە". قوڕقوڕاژگەی، خێرا خێرا، بەرز و نزم دەبۆوە. وینسـتـۆن بەرەو بارەکە چوو و بە دوو پەرداخی نیو لەترییـەوە گـەڕایەوە. پیـرەمێـردەکە، بێ توانایی خۆی بۆ خواردنەوەی یەک لەتر بیرە لە بیر بردبۆوە.

وینسـتـۆن گـوتی:" تۆ لەمن بە تەمـەنتریت. بەر لـەوەی من بخـولقـێم، تۆ پیـاوێکی تەواو بووی. ژیانی بەر لە بەرپابوونی شـۆڕشت وەبیـرە؟. ئەوانەی لە تەمـەنی مـندان شـتـێکی ئەوتۆ لەبارەی ئەو دەور و زەمانەوە نازانن. ئەوەی دەشیزانن لە کتێبەوەیە کە لەوەیە ڕاست نەبن. حـەزێ دەکـەم لە تۆوەی بزانم. کـتـێـبـە مـێـژووییـەکـان دەڵێن گـوایە ژیانی پێش بەرپابوونی شـۆڕش بە تەواوی جیـاواز بووە لەوەی ئێـسـتـا. چەوسـاندنەوەی بەردەوام، ناعـەدالەتی و هەژاری زۆر لەوە خراپتر بوون کە بیری لێ بکەینەوە. لەم لەندەنەدا زۆربەی خـەڵکی، لە ڕۆژی لەدایکبـوونیـانەوە تا دەمـردن خـۆراکی تەواویان نەدەبوو. نیـوەیان پێـخاوس بوون. ڕۆژی دوانزە سـەعات کاریان دەکرد. لە نۆ ساڵیدا دەسـتیـان لە خوێندن هەڵدەگـرت. دە نەفـەر لە یەک ژووردا دەنوستن. لە هەمـان کـاتدا هێندێ خـەڵک هەبوون، تەنها چەند هەزار کەسێ بوون – پێیـان دەگـوترا کـاپیـتـالسـت – دەوڵەمـەند و دەسـەڵاتدار بوون. هەرچی تۆ بڵێی، هەیانبوو. لە خانووی گەورە و فەڕاحدا دەژیان و هەریەکەو سیی خزمەتکاریان هەبووە. سواری ئۆتۆمبیل و گالیسکەی چوارپاچکە دەبوون و شەمپانیـایان دەخواردەوە و شەپقەی قووچیان لە سەر دەنان."

پیـرەمـێـرد، لە پڕێکدا وەدەنگ هات: "کـڵاوی قـووچ؟!. باش بوو گـوتت. بەخـۆشم لەم ڕۆژانەدا وەبیـرم هاتەوە. نازانم بۆ. هەروا بەبیـرمـدا هاتەوە. سـاڵەهایە کـڵاوی قـووچم نەدیوە. نەما. ئاخر کەڕەت کڵاوی قووچم لە سەر نا، لە ناشتنی تەرمی ژنخوشکەکەمدا بوو. بیرم نییـە چ ساڵێ بوو. ڕەنگە پەنجا ساڵ لەمەوبەر بووبێ. دیارە کڵاوەکەم بە کرێ گرتبوو. حاڵی بووی؟."

وینستـۆن، بە ئارامییەوە گوتی:"مەسەلەی گرینگ کڵاوی قووچ نییە. مەسەلە ئەوەیە کە ئەو سـەرمـایەدارانە – ئەوان و حاکم و کەشیـش کە نانی ئەوانیـان دەخـوارد – خـوای سـەر زەوی بوون. هەمـوو شتێ لە پێناوی بەرژەوەندی ئەواندا بوونی هەبوو. خەڵکی ئاسایی و کرێکاران کۆیلەی ئەوان بوون. چۆنیـان بویستـبا وایان ڕەفـتار لەگەڵدا دەکردن. بۆ نموونە،

دەیانتوانی بۆ کەنەدا، بە بڕ، وەک ئاژەڵ لێتان ڕەوانە بکەن. حەزیان بکردبا، بۆیان هەبوو لە گەڵ کیژەکانتاندا بنوون. دەستووریان دەدا بە قامچی پشیلەی نۆ کلک لێتان بدرێ. کە بە لایاندا ڕەت دەبوون، دەبوو کڵاوەکانتان لابەرن. هەر سەرمایەدارێک کە دەڕۆیی، کۆمەڵێ پیادە، بە ڕاکەڕاک بە دەوریەوە بوون کە..."

دیسان پیرەمێرد وەدەنگ هاتەوە: "پیادەکان! دەمێکە ئەو وشەیەشم بەر گوێ نەکەوتووە. پیادە!. بەرەودواوەم دەگێڕیتەوە. لە بیرمە – ئۆ هووو، خۆ دوێنێ نەبوو... چەندین ساڵە – هێندێ جار، دوانیوەڕۆی ڕۆژانی یەکشەممە دەچوومە (هاید پارک) تا ئاخاوتنی هاوڕێیان بژنەوم. سوپای سەرفرازی، کاتۆلیکی وابەستە بە کڵێساکانی ئیتالیاوە، جووەکان، هندی – هەمووو بابەتێکی لێ بوون. کوڕێک، نازانم ناوی چ بوو، بەڵام قسەکەرێکی بەتوانابوو. بەڵێ کردی بە هەرا: "پیادەکان، بۆرژواکان، کاسەلێسەکانی دەسەڵاتداران." هێندێ شتی تریشی دەگوت کە یەکێکیان مشەخۆر بوو. ئەو بابەتە قسانە. بەڵێ دڵنیام وایان پێ دەگوتن. دیارە مەبەستی حیزبی کارگەران بوو. دەزانیت..."

وینستۆن هەستی دەکرد کە لە مەبەستی تێنەگەیشتوە. گوتی:" لە ڕاستیدا ئەوەی من گەرەکمە بیزانم ئەوەیە کە داخوا هەست دەکەیت ئازادی ئێستات لە هی ئەو دەمەت پتر بێ؟. ئایە وەک مرۆ هەڵسوکەوتت لەگەڵدا دەکرێ؟. لە ڕۆژانی کۆندا، خەڵکی دەوڵەمەند، ئەوانەی کە لە سەرە..."

پیرەمێرد بۆ وەبیرهێنانەوە گوتی:" دیوانی گەورەپیاوان"

– کە حەزێ دەکەی، باشە دیوانی گەورەپیاوان. ئەوەی کە دەمەوێ بیزانم ئەوەیە ئایە ئەوانە دەیانتوانی بە چاوێکی سووک سەیرتان بکەن هەرلە بەر ئەوەی ئێوە هەژار بوون و ئەوان دەوڵەمەند؟. ڕاستە دەبوو بە (جەناب) ناویان بهێنن و کە بە لاتاندا ڕەت دەبوون، دەبوو کڵاوەکانتان وەلانێن؟.

وێ دەچوو کابرای پیرەمێرد چاک بە خەیاڵدا ڕۆچووبێ. بەر لەوەی وەڵام بداتەوە چواریەکی بیرەکەی هەڵقوڕاند و گوتی: "بەڵێ حەزیان دەکرد کڵاو داکەنی. نیشانەی جۆرە حورمەت لێنانێ بوو. من لەگەڵ کاری وادا نەبووم بەڵام زۆر جاریش کردوومە. دەتوانم بڵێم کە ناچاری بوو."

– ئایە بۆ ئەو خەڵکە و– ناوەڕۆکی کتێبی مێژووت بۆ باس دەکەم – پیاوەکانیان، ئاسایی بوو لە سەرەڕێیەکانەوە بتانهاونە ناو چڵکاوەوە؟.



– یەکێکیان جارێ وای لە من کرد. دەڵێی دوێنێ بوو. شەوێ، پێشبڕکێی بەلەم بوو – شەوانی پێشبڕکێ بەد و شەڕانی دەبوون – و لە خیابانی شەفتزبوری خۆم بە کوڕێکی گەنجدادا بەملا و ئەولادا دەهات و منیش بەری کەوتم. گوتی: "بۆ تەماشای بەر پێی خۆت ناکەی؟." و دەستی لە یەخەم گیر کرد و باوەڕت بێ وای هەڵدام وەخت بوو بەر پێچکەی ئۆتۆمبیلێ بکەوم. بەڵام ئەو دەمە لاو بووم و دەمویست مستەکۆڵەیەکی هەواڵە بکەم."

هەستی بێ دەسەڵاتی بە سەر وینستۆندا زاڵ بوو. جگە لە شتی بێ کەڵک، هیچ شتێ لە توێی زەینی پیرەمێردەکەدا نەبوو. ڕۆژێکی تەواو پرسیارت ئاراستە بکردبا، لەوە بوو هیچ وەڵامێکت دەست نەکەوێ. مێژووی حیزب هێشتا هەر ڕاستە. لەوانەیە هەمووی، بە تەواوی ڕاست بێ. دوا هەوڵی دا:

– ڕەنگە نەمتوانیبێ مەبەستی خۆم ڕوون کەمەوە. ئەوەی دەمەوێ بیڵێم ئەمەیە: بۆ نموونە لە ساڵی **١٩٢٥** دا گەورە بووی. ئەوەندەی لە بیرت بێ، ژیانی ساڵی **١٩٢٥** ت خۆش بوو یا هی ئێستات؟. ئەگەر بە دەستت بێ دەتەوێ ئەو دەمە بژیی یا ئێستا؟.

پیرەمێردەکە، بە دەم بیرکردنەوەوە، لە مێزەکەی بەردەمی خۆی ڕاما. بیرەکەی لە جاران هێواشتر دەخواردەوە. کە کەوتیشە ئاخاوتن شێوەی گەورەیی و بەخشندەیی پێوە دیار بوو. دەتگوت بیرە، توانای ئاخاوتنی پێ داوە:

– دەزانم بە تەمای چ وەڵامێکی. دەتەوێ بڵێم ئای خۆزگە جوان دەبوومەوە. زۆربەی خەڵکی حەز بە جوانبوونەوە دەکەن. ئەگەر لاو بیت، بێ وەی و بەهێزیت. کە گەیشتیتە تەمەنی من قەت وەزعت چاک نابێ. بە دەست ئازاری پێمەوە هەڵدەپلکێم و وەزعی میزڵدانم قۆڕە و شەوی شەش حەوت جار لە نوێنم ڕاپێچ دەکا. لە لایەکی تریشەوە، پیربوون چاکەی خۆی هەیە. خەمی سەردەمی هەرزەکاری تێدا نییە. کارت بە ژنان نییە کە ئەمە خۆی لە خۆیدا نیعمەتێکی گەورەیە. دەوری سیی ساڵە ژنم نییە و نەشمویست ببێ.

وینستۆن خۆی بە دوادا شکاندەوە و پشتی بە پەنجەرەکەوە دا. بەردەوامبوون لە سەر ئاخاوتن بێ کەڵک بوو. ئەو خەریکی کڕینی بیرە بوو، لە پڕ پیرەمێردەکە هەستا و بەرەو ئاودەستە بۆگەنەکە چوو کە کەوتبووە کەنارێکەوە. نیو لەتری زیادە کاریگەرێتی خۆی کردبوو. وینستۆن یەک دوو دەقیقە دانیشت و چاوی بڕیبە پەرداخە بەتاڵەکەی خۆی. نەیزانی کەنگێ، قاچی بەرەو خیابانی بردن. بیری کردەوە: بیست ساڵ دەبوو ئەو پرسیارە

مەزن و ساکارە: "ئایە ژیانی پێش شۆڕش خۆش بوو یا دوای شۆڕش؟." لای وینستۆن بێ وەڵام مابۆوە. لە ڕاستیدا ئێستاش هەر بێ وەڵام مابوو. لە بەر ئەوە بێ وەڵام بوو چونکە ئەو تاکوتەرایەی مابوونەوە توانای ئەوەیان نەبوو سەردەمێ بە سەردەمێکی دی بپێون. ئەوانە، یەک ملیۆن شتی بێ کەڵکیان بیر دەکەوتەوە. شەڕەسەرەی خواردن، گەڕان بە دوای پەمپی پاسکیلدا، شێوەی ڕوخساری باریکی خوشک لە سەرەمەرگدا. گەردەلوولی بەیانیانی ڕۆژێکی بەر لە شەست ساڵ... بەڵام سەرجەمی ڕووداوەکان لە ڕادەی دیدی ئەوان بەدەر بوو. بە مێرووله دەچوون کە شتی زۆر بچووکیان دەدی بەڵام هی گەورە نا. کاتێکیش دەخلەفان، نووسینی ناو مێشکیان تێک دەچوو. کە ئەوەش ڕووی دەدا، ئیدی بۆچوونی حیزب بە تەواوی بە ڕاست دەردەچوو چونکە پێوەری دی نەدەما و هەرگیزیش پەیدا نەدەبووەوە.

لە پڕێکدا، وەرچەرخانێک لە بیرکردنەوەکانیدا پەیدا بوو. ڕەق ڕاوێستا و سەری هەڵبڕی. لە کۆڵانێکی تەنگەبەردا بوو. چەند دوکانێکی گچکە و نارێک لە نێوان ماڵەکاندا بوون. بە دیار سەریەوە، سێ تۆپی ڕەنگ پەڕیو هەڵواسرابوون. دەتگوت زەمانێ زێرڕێژ کراون و ئێستا ئەو ڕەنگەیان نەماوە. پێ دەچوو ئەو جێیە بناسێ. بەڵێ!. لە بەردەم دوکانێکدا وێستابوو کە کاتی خۆی دەفتەرەکەی لێ کڕیبوو. ترسی لێ نیشت. بەر لە هەموو شتێ دەفتەرکڕین بقە بوو و سوێندی خواردبوو هەرگیز لەوناوە نزیک نەکەوێتەوە. لە گەڵ ئەوەشدا مەودای بە بیرکردنەوەی خۆی دابوو. لاقی، بە ئارەزووی خۆیان بۆ ئەوێیان بردبوو. ڕێک ئەو جۆرە مەترسییە بوو کە بەر لە کڕینی دەفتەرەکە نیازی وا بوو خۆی لێ لادات. سەیری کرد، هێشتا دوکانەکە کراوە بوو هەرچەندە سەعات بیست و یەکیش بوو. بەو خەیاڵەی کە بەژوورکەوتن مەترسی لەوە کەمترە لە سەر شۆستەکە ببیندرێ، وەژوور کەوت. ئەگەر لێی بپرسن، دەتوانێ بیانووی گوێزانکڕین بهێنێتەوە.

دوکاندارەکە، تازە چرا نەوتییەکەی پێ کردبوو. بۆنێکی ناخۆش بەڵام ئاشنای لێ دەهات. پیاوێ بوو، ڕەنگە شەست ساڵ بووبێ. لاواز و چەماوە بوو، و لووتێکی جوان و درێژی هەبوو و چاویلکە درشتەکانی چاوی ئارامییان شێواندبوو. قژی ماشوبرنج و برۆی هێشتا ڕەش بوون. چاویلکەکەی و هەڵسوکەوتی ئارامی و چاکەتە کۆنە ڕەشەکەی، سیمایەکی سەیریان پێ بەخشیبوو. دەتگوت گوایە جۆرە ئەدیب یا مۆسیقاژەنێکە. دەنگی ساف و باریک بوو، شێوەئاخاوتنی بە هی کارگەران نەدەچوو. گوتی: "کە بە سەر شۆستەکەدا ڕەت بووی ناسیتمەوە. ئەو پیاوەی کە دەفتەری یاداشتت لێ کڕیم.



قاقەزەکانی جوان بوون. پێیان دەگوترێ خامەیی. قاقەزی وا... توائهووو! دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم کە پەنجا ساڵیش دەبێ شتی وا دروست نەکراوە". لە پشت چاویلکەکەیەوە سەیری وینستۆنی دەکرد. دوایی گوتی: "ئەگەر فەرمانێکتان هەیە لە خزمەتدام. ڕەنگیشە بتەوێ هەروا چاوێک بگێڕیت" وینستۆن بە شێوەیەکی ئاڵۆز گوتی: "لێرەوە ڕەت بووم، گوتم با تەماشایەک بکەم. بۆ شتێکی تایبەتی نەهاتووم." ئەویش گوتی: "باشتر. باوەڕ ناکەم شتی بەکەڵکم هەبێ." دەستە ناسکەکانی بە جۆرێ بزواند وەک ئەوەی داوای یارمەتی بکا. ئەوسا گوتی:"دەبینی وەزعی دوکانەکە چۆنە. بەتاڵ و حەتاڵ. بەینی خۆمان بێ، فاتیحا بۆ کۆنەفرۆشی خوێندراوە. ڕەواجی نییە و چ داهاتیشی نییە. وردە وردە هەموو چینی و شووشەواتەکان شکان. میتالەکانیش توێندرانەوە. چەند ساڵێکە مۆمدانی مسی ڕاستیم نەدیوە."

ڕاستییەکەی، دەرزیت هەڵدابا بەر زەوی نەدەکەوت. بەڵام چ شتی بە کەڵکی تێدا نەبوو. ئەمسەر و ئەوسەری دیوارەکان چوارچێوەی تۆز لێ نیشتووی بە سەر یەکدا کۆمەڵکراو بوو، و ژوورەکە تەنگتر ببۆوە. قەراغ پەنجەرەکە، تەنەکەیەکی لە سەر بوو و پڕ بوو لە بورغوو و بزماری پەرچ و سەموونەی چەوتوچێڵ و دەرنەفیزی خواروخێچ و قەڵەمبڕی دەم شکاو و سەعاتی ڕەنگگۆڕاوی لە عەمەل کەوتوو و وردەواڵەی دی. لە قوژبنێکی دوکانەکەدا، لە سەر مێزێک، هێندێ شت داندرابوون - کیسە تووتنی ڕەنگگرتوو و بەردی عەقیق و شتی وا - کە پێ دەچوو شتی سەرنجڕاکێشیان تێدا بێ. وینستۆن بەرەو وێ چوو. شتێکی خڕی بەرچاو کەوت کە دەچروسکایەوە. هەڵیگرت. پارچە شووشەیەکی قورس بوو، لایەکی کووڕ و لایەکەی دیکەی تەخت بوو و شێوەی هەرەمی هەبوو. لە شێوە و ڕەنگی شووشەکەدا شتێکی سەیری دەدی. وەک باران ناسک بوو. شتێکی سووری لە ناوەندیدا دی. شتێکی تێکهەڵقژاو کە گوڵی سوور و گولیلکە خاتوونەی بیر دەهێنایەوە. وینستۆن کە حەیرانی ئەو شتە ببوو گوتی: ئەمە چییە؟.

پیرەمێردەکە وەڵامی دایەوە: "ئەوە مەرجانە. بەڵێ مەرجانە. دەبێ لە ئۆقیانووسی هیندییەوە هێندرابێ. لە شووشەیان ناوە. بەر لە سەد ساڵ دروست کراوە. ڕەنگە زیتریش بێ."

- شتێکی جوانە.

دوکاندارەکە، لە ڕووی پێزانینەوە گوتی: "جوانە بەڵام لەم ڕۆژگارەدا قسەی وا نابیستریێ". کۆخەیەکی بۆ کرد و دیسان گوتی:" ئەگەر نیازی کڕینیت هەیە بە چوار

دۆلارت دەدەمێ. کاتی خۆی شتی وا هەشت پاوەنی لە سەر ئاو دەکرد. هەشت پاوەن پارە بوو نە گاڵتە. بەڵام ئێستا کێ – تەنانەت ئەو تاکوتەرایەی ماویشن – بایەخ بە شتی ئەنتیکە دەدا؟."

وینستۆن هەر لەوێ چوار دۆلارەکەی وێ داو ئەو شتەی بوو بە هی خۆی چووە گیرفانیەوە. ئەوەی سەرنجی بۆ ئەو شتە ڕاکێشا جوانییەکەی نەبوو هێندەی سەردەمەکەی بوو کە زۆر لە سەردەمی ئەم جیاواز بوو. تا ئەو دەمە شووشەی وای نەدیبوو. بێکەڵکییەکەی سەرنجی ڕادەکێشا، هەرچەندە دوور نەبوو کاتی خۆی بۆ قاقەزڕاگرتن بەکار هاتبێ. شووشەکە، لە گیرفانیدا قورس بوو بەڵام خۆشبەختانە زۆری لە گیرفانیەوە دەرنەچووبوو. ئەندامی حیزب و ببێ بە خاوەنی شتی وا، شتێکی سەیر و جۆرە سازشکارییەکیش بوو. هەر شتێکی کۆن – و بە هەمان پێوانە – هەر شتێکی جوان، جێی گومان بوو. کابرای پیرە، دوای دەسکەوتنی چوار دۆلارەکە، بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش خۆشحاڵ بوو. گوتی: "ژوورێکی دی لە سەرەوە هەیە ڕەنگە حەز بکەی ببینی. شتی زۆری تێدا نییە. هەر چەند پارچەیەکی لێیە. ئەگەر دەتەوێ بچین چرایەکمان بەسە."

چرایەکی تری پێ کرد. پێش کەوت و بە کۆمەکۆم بە قاڵدرمە ڕژد و داتەپیوەکاندا سەرکەوت. وینستۆنیش دووی کەوت. بە ڕاڕەوێکی تەنگدا ڕەت بوون و چوونە ژوورەکەوە. پەنجەرەکە رووی لە شەقامەکە نەبوو بەڵکو بەرەو رووی گۆڕەپانێکی بەردڕێژ و یەک دارستان دوکەڵکێش دەکرایەوە. ڕێکوپێکی ژوورەکە سەرنجی وینستۆنی ڕاکێشا. دەتگوت بۆ وەی ڕێکخراوە خەڵکی تێدا بژین. ڕایەخێکی گچکەی تێدا بوو، تابلۆیەک بە دیوارەکەوە بوو و کورسیەکیش بەلای زۆپاکەوە دانرابوو. سەعاتێکی شووشەبەندی کۆن لە سەر ڕەفتی زۆپاکە بوو و چرکەچرکی دەهات. ژێر پەنجەرەکەش، تەختەخەوێکی لێ بوو کە چواریەکی هەموو ژوورەکەی داگیر کردبوو و چەرچەفێکیشی بە سەردا درابوو.

پیرەمێردەکە بە پەژارەوە گوتی:" تا ژنەکەم مابوو لێرە دەژیاین. دەمەوێ یەکە یەکە، گشت شتەکان بفرۆشم. ئەو قەنەفەیە جوانە. دەبێ چارەسەرێکی بکرێ چونکە ڕێک ناوێستێ."

چراکەی بەرز ڕاگرتبوو تا هەموو ژوورەکە رووناک بێ. لە بەر رووناکی گەرم و کزی چراکەدا، وا پێ دەچوو ژوورەکە بۆ خۆیت ڕاکێشێ. وینستۆن بە بیریدا هات کە حەفتەی



بە چەند دۆلارێ بەکرێی بگرێ بەو مەرجەی بوێرێ خۆی دووچاری مەترسی وا بکا. بیرکردنەویەکی کێوییانە و ئارەزوویەکی مەحاڵ بوو و دەبوو هەر لەگەڵ بیرلێکردنەوەدا دەسبەرداری بێ. بەڵام تازە، ژوورەکە حەسرەتێکی لە دڵیدا چاندبوو. جۆرە یادگارییەکی کۆن بوو. دەتگوت لە ژووری وادا هەست بە شێوەی ژیان دەکا: لە بەردەم ئاگردانە خۆشکراوەکەدا، لە سەر کورسییەک دابنیشی و قاچت لە بەردەم ئاگردانەکە بێ و کترییە ئاوێکیشی لە سەر بێ، بە هێمنی و بە تەنها، کەس وەڕست نەکات، گیزەگیزی کترییە ئاوەکە و چرکەچرکی کاتژمێرەکە نەبێ هیچ شتێکی تر بێزارت نەکا.

خۆی پێ ڕاگیر نەکرا. بڵمەیەکی کرد: تەلەسکرینی لێ نییە؟.

– نەء، هەرگیز شتی وام نەبووە. گرانە. قەتیش پێویستیم پێی نەبووە. ئەها ئەو مێزەی ئەو قوژبنە، مێزێکی جوانە. بەڵام دەبێ چەکمەجەکانی چاک بکرێنەوە.

گۆشەیەکی تری ژوورەکە ڕەفتی کتێبی لێ بوون. وینستۆن بۆ وێ چوو. هێندێ وردەواڵەیان لە سەر بوون. ئەوەندەی لە گەڕەکە کرێکارنشینەکاندا بە دووی کتێبدا دەگەڕان و دەفەوتێندران، بەو ئەندازەیەش لە هەموو جێیەکی دی وا بوو. زەحمەت بوو لە هەموو ئۆقیانووسیادا، یەک دانە کتێبی چاپکراوی ١٩٦٠ چنگ کەوێ. پیاوە پیرەکە، هێشتا چراکەی بە دەستەوە بوو و لە بەردەم تابلۆیەک وێستابوو کە چوارچێوەکەی عەبەنووس بوو و بە دیوارەکەوە، بەرانبەر قەنەفەکە و لە لایەکەی تری ئاگردانەکەوە هەڵواسرابوو.

بە نەرمییەکەوە گوتی: ئەگەر حەزیش لە تابلۆی کۆن دەکەی ئەوا...

وینستۆن هاتە بەرەوە و بە وردی لە تابلۆکە ڕاما: نەخشکاری پۆڵا بوو. وێنەی قوببەیەک بوو و پەنجەرەکانی سێگۆشە بوون و بورجێکی بچووکیش لە پێشەوە بوو. دەوری بیناکە پەرژین بوو و لەولاتریشەوە شتێ دیار بوو کە بە پەیکەر دەچوو. وینستۆن کەمێ لێی ڕاما. پێی نا ئاشنا نەبوو هەرچەندە پەیکەرەکەشی باش نەدەناسییەوە.

– چوارچێوەکە بە دیوارەکەوە چەسپە بەڵام دەتوانم بۆتی دەربێنم.

– ئەو جێیە دەناسمەوە. ئێستا وێرانەیە. لە ناوەڕاستی شەقامەکە، بەرانبەر کۆشکی دادوەرییە.

– وایە لەوێیە. بۆمباران کرا. لە ناوەڕاستی شەقامەکە، بەرانبەر کۆشکی دادوەری. زەمانێ کڵێسا بوو. ناویشی هەبوو. ناوی (سێنت کلیمانت دەیس) بوو.

پیرەمێردەکە، وەک ئەوەی بیەوێ باسێکی پێکەنینهێنەر بکا بزەیەکی کرد و گوتی: "زەنگەکانی سێنت کلیمانت دەڵێن نارنج و لیمۆین"

– چی؟!.

– ئا، زەنگەکانی سێنت کلیمانت دەڵێن نارنج و لیمۆین. ئاوازێ بوو، ئەو دەمەی منداڵ بووین دەمانگوت. دوایییەکەیم بیر نەماوە بەڵام دەزانم وا کۆتایی دێ: ئەوە مۆمێکە رێی پێ رووناک کە، ئەوە تەورێکە ملت هەڵپاچە. جۆرە سەمایەک بوو. ئەوانی دی باسکیان تێک دەئاڵاند و دەبوو بە نێوانیاندا رەت بیت. کە دەشگەیشتە (ئەوە تەورێکە و ملت هەڵپاچە)، رێگەکەیان دەگرت و دەسگیر دەکرای. گشتی ناوی کڵێساکان بوو. لە بارەی هەموو کڵێسا گەورەکانی لەندەنەوە بوو – بە هەرحاڵ، کڵێسا گرینگەکان.

وینستۆن دەیویست بزانێ داخۆ کڵێسا لە چ سەردەمێکدا بووە. زەحمەت بوو تەمەنی خانووبەرەی لەندەن بزانی. هەموو بینایەکی تازە و جوان بۆ سەردەمی شۆرش دەگەڕێندرایەوە. بینا کۆنەکانیش بۆ سەردەمی تاریک و سەدەکانی ناوەڕاست. باوەڕ وا بوو کە لە سەردەمی سەرمایەداریدا شتی چاک نەکراوە. لە بارەی مێژووەوە، نە لە بیناکاندا شتێ چنگ دەکەوت نە لە کتێبدا. پەیکەر، نووسین، بەردتاشی، ناوی شەقام – هەر شتێ پەیوەندی بە رابردووەوە بووبێ، بە پێی بەرنامەیەکی ورد دەگۆڕدرا.

– نەمدەزانی ئەوێ کڵێسا بووە.

– لە راستیدا، زۆر کڵێسا لە جێی خۆیاندا ماوون، بەڵام بۆ مەبەستی دی بەکار دەهێندرێن.

ڕاوەستە بزانم ئاوازەکە چۆن چۆنی بوو. ئا بیرم کەوتەوە:

زەنگەکانی سێنت کلیمانت دەڵێن نارنج و لیمۆین

زەنگەکانی سێنت مارتین دەڵێن سێ شاهیمان وێ دەوە.

هیچی ترم بیر نەماوە. شاهی، سکە پارەیەکی گچکەی مس بوو. وەک سەنت وابوو.

– سێنت مارتین لە کوێ بوو؟.

– سێنت مارتین؟. هەر لە جێی خۆی ماوە، لە مەیدانی سەرکەوتن بە لای پێشانگای تابلۆوە. بینایەکە، بانەکەی بە سەر رێڕەوەکەدا سێگۆشەییە و ستوونەکانی لە پێشەوەن. پلەکانیشی گەورەن.

وینستۆن چاک ئەوێ شارەزا بوو. مۆزەخانەی پێشاندانی شتی هەمەجۆر بوو – مۆدێلی



بۆمبای موشەک و وێنەی قەڵای سەراو و تابلۆی رۆنیی کە دەسدرێژی دوژمنی دەردەخست.

پیرەمێردەکە لە سەر قسەی خۆی رۆیشت: سێنت مارتین بە کێڵگەش ناوی دەبرا ئەگەرچی لە بیرم نییە ئەو ناوە کێڵگەی لێ بووبێ.

وینستۆن تابلۆکەی نەکڕی. هەرچەندە ئەوە لە شووشە بلوورەکە گرینگتر بوو بەڵام مەگەر لە چوارچێوەکەی دەرهێنابا. پێشی نەدەبرایەوە. کەمێ داما، پاشان لە گەڵ پیرەمێردەکەدا کەوتە قسە. بۆی دەرکەوت ناوی ئەو وەک بە رووی دوکانەکەیەوە نووسراوە، وێکس نییە بەڵکو چارینگتۆنە. چارینگتۆن تەمەنی ٦٣ ساڵ بوو و سیی ساڵی تەمەنی لەو دوکانەدا بەسەر بردبوو. لە هەموو ئەو ماوەیەدا هەوڵی داوە ناوەکە بگۆڕێ بەڵام بۆی نەلواوە. لە مەودای دەمەتەقێکەدا، وینستۆن هەر بیری لای شیعرەکە بوو. زەنگەکانی سێنت کلیمانت دەڵێن نارنج ولیمۆین! زەنگەکانی سێنت مارتین دەڵێن سێ شاهیمان وێدەوە. شتێکی سەیر بوو. کە ئەوەت دەخوێند، ئەو هەستەت لە لا دروست دەبوو کە گوێت لە دەنگی زەنگەکانە. زەنگە لە ناوچوەکانی لەندەن داپۆشرابوون و بیر چووبوونەوە. بەڵام بوونیان هەبوو. دەتگوت سەدای زەنگ لە دنیای ئەوانگەلەوەڕا دێ. لە گەڵ ئەوانەشدا، بیری نەبوو رۆژێ لە رۆژان گوێی لە دەنگی ئەو زەنگانە بووبێ.

لە چارینگتۆن دابڕا و بە تەنێ بە پلەکاندا داگەڕا تا بە دزییەوە و بەر لەوەی دەرکەوێ تەماشایەکی شەقامەکە بکا. بڕیاری دابوو لە دەرفەتێکی لە باردا – بۆ نموونە مانگێکی دی، ئەگەر سەریشی تێدا چووبێ سەرێکی دوکانەکە بداتەوە. دیارە مەترسییەکە لەوە گەورەتر نەبوو خۆی لە کۆبوونەوەی حیزب بدزێتەوە. هەر لە یەکەم ساتەوە دوای کڕینی دەفتەری یاداشتەکەی، گەڕانەوە بۆ ئەوێ و باوەڕکردن بەو کابرایە بێ عەقڵیی بوو. وەک ئێستا...

دیسان لە بەر خۆیەوە گوتی: "دەگەڕێمەوە. هێندێ وردەواڵە دەکڕم. وێنەی کڵێسای سێنت کلیمانت دەکڕم، لە چوارچێوەکەی دەردەهێنم و دەیخەمە ژێر چاکەتەکەم و دەیبەم. گشت شیعرەکە، لە هۆشی چارینگتۆن دێنمە دەرێ." تەنانەت نەخشەی بەکرێگرتنی ژوورەکەش لە مێشکیدا بلاچەی دا. دەوری پێنج چرکە ئاگای لەخۆ نەما. بێ ئەوەی تەماشای دەوروبەر بکا، بەرەو دەرەوە هەنگاوی نا. لێوی، هەر لەخۆڕا، بۆ گوتنی شیعرەکە دەبزووتن:

زەنگەکانی سێنت کلیمانت دەڵێن نارنج و لیمۆین
زەنگەکانی سێنت مارتین دەڵێن دوو..

لە پڕێکدا، دەتگوت ئاوی ساردی پێدا کرا. یەکێ بە جلوبەرگی شینەوە، دە مەترێ لێوەی دوور بوو، بە سەر شۆستەکەدا بەرەو ڕووی دەهات. کچە قژڕەشەکە بوو. ئەو کچەی کە لە بەشی هەڵبەستندا کاری دەکرد. تیشکی ڕووناکایی کەم بوو بەڵام ناسینەوەی گران نەبوو. ڕێک سەیری چاوی ئەمی دەکرد. دوایی، ڕێی خۆی گرتەبەر و وەک ئەوەی ئەمی نەدیبێ، ڕۆیی.

تاوێ توانای ڕێکردنی نەما. بە لای دەستەڕاستدا وەرچەرخاو بێ ئەوەی بیر لە گۆڕینی ڕێیەکەی بکاتەوە بە نارەحەتی ڕۆیی. بە هەرحاڵ، شتێ ئاشکرا بوو. لەوە دەرچووبوو گومان لەوە بکرێ کە ئەو کیژە جاسووسێتی بە سەر ئەمەوە دەکا. دەبێ تا ئەوێ دووی کەوتبێ. بە عەقڵەوە نەدەچوو بە ڕێکەوت، بەو تاریکە، لە هەمان شەقامدا پیاسە بکا کە چەند کیلۆمەترێ لەو ناوچەیەوە دوورە کە ئەندامانی حیزبیان لێ دەژیان. بینینی لەوێ، شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو. دەبێ بە ڕاستی ئەو کچە سەر بە پۆلیسی خەیاڵ بێ یا خەفیەی خۆتەرخانکەری بەلاشە کە لە هەردوو بارەکەدا ئەنجام هەر یەکێکە. هێندە بەس بوو ناوی بدا. لەوانەیە ئەو دەمەش دیبێتی کە چووە مەیخانەکەوە.

بە نارەحەتی ڕێی دەکرد. شووشەکەی گیرفانی، لەگەڵ هەموو هەنگاوێکدا بەر لاڕانی دەکەوت. ویستی دووری بهاوێ بەڵام نەیکرد. لە هەمووی ناخۆشتر ئازاری زگی بوو. ترسی ئەوەی لێ نیشت ئەگەر تا یەک دوو دەقیقەی دی خۆی نەگەیەنێتە ئاودەستێ، لێی بقەومێ. بەڵام گەڕەکی وا، ئاودەستی گشتی لێ نەبوو. پێچەکانی زگی نەما بەڵام ئازارێکی قورس گرتی.

شەقامەکە بنبەست بوو. وینستۆن تاوێ وێستا و بیری کردەوە داخۆ چی بکا. وەرچەرخا و بەرەو دواوە گەڕایەوە. هەمووی سێ دەقیقە دەبوو کیژەکەی تووش ببوو. بە بیریدا هات، پێ هەڵگرێ و دووی کەوێ. پاشان کە پێی گەیشت، وردە وردە بە دوایدا بڕوا تا دەگەنە جێیەکی چۆڵ. ئەوسا لەوێ، بە گابەردێ مێشکی بهاڕێ. شووشەکەی گیرفانی بۆ ئەم کارە قورس بوو. لە هەمان کاتدا، لەو کارە ژیوان بووەوە، چونکە کاری وا لە دەستی ئەم نەدەهات. نەیدەتوانی ڕابکات و نەشیدەتوانی دەست بوەشێنێ. کیژەکەش گەنج و بەهێز بوو و لە دەستی دەهات بەرگری لە خۆی بکات. ویستی بە پەلە خۆی بگەیەنێتە مەکۆی



کۆبوونەوە و تا دادەخرێ لەوێ بێ و بیانوویەک بۆ ئەم ئێوارەیەی پەیدا کات. ئەمەش نەدەکرا. بێهێزییەکی مەرگبار دایگرتبوو. هەموو ئاواتێکی ئەوە بوو بگاتەوە ماڵێ و بە کەیفی خۆی پشوو بدا. کە گەیشتەوە ئەپارتمانەکە، سەعات لە ۲۲ لایدابوو. سەعات بیستوسێ و نیو کارەبا لە سەعاتەکەوەڕا دەبڕدرا. چووە مەتبەخەکەوە. کوپێ چایە و جنی خواردەوە. دوایی چووە پشت مێزەکە و لە سەر سەکۆکە دانیشت. دەفتەرەکەی دەرهێنا بەڵام یەکسەر نەیکردەوە. لە تەلەسکرینەکەوە، دەنگێکی ژنانە، بە گەرمی ئاوازی وڵاتپارێزی دەخوێند. لە بەرگی مەڕمەڕی دەفتەرەکە ڕاما. ویستی دەنگی ژنەکە لە سەر تەختی هۆشی خۆی نەهێڵێ بەڵام بێ سوود بوو.

بە شەوان خەڵکیان دەبرد، هەر بە شەوان. چاک وابوو بەر لەوەی بگیرێی خۆت بکوژیت. دیارە هێندێ کەس وایان دەکرد. زۆر کەس ون بوون، لە ڕاستیدا خۆکوشتن بوو. بەڵام دەسکەوتنی چەکی تەقە یا ژەهری کوشندە، کاری حەزرەتی فیل بوو. خۆکوشتن ئازایەتی دەویست. بە سەرسامییەوە هەستی لە ئازار و کاریگەرێتی بایۆلۆژیانەی ترسی خۆی ڕاگرت کە ڕێک لە کاتی خۆیدا ڕوو دەدا و جەستە خیانەت دەکا. دەیتوانی ئەو کچە قژڕەشە قڕەبڕ بکا تەنها بەوەی خێرا بهاتبایەتە دەست. بەڵام ڕێک لەو دەمەدا کە مەترسییەکە گەورە بوو ئەمیش هێزی لە بەر بڕا و نەیتوانی هیچ بکا. بە بیریدا هات کە لە کاتی تەنگانەدا دوژمنی دەرەکی بوونی نامێنێ تا شەڕی لەگەڵدا بکرێ بەڵام هەموو دەمێ، جەستە بەخۆی دوژمنە. ئێستاش، لەگەڵ ئەوەشدا کە (جن)ی خواردەوە، ئازاری زگی لێ نەدەگەڕا بە چاکی بیر بکاتەوە. بیری کردەوە: هەموو بارودۆخێکی قارەمانێتی یا تراژیدی لە کاتی وادا دەبێ. لە شەڕگەدا، لە ڕۆژی ئەشکەنجەدا، لە ناو کەشتی نقومبوودا، ئەوەی بە بیردا دێ و هەوڵی بۆ دەدرێ لە بیر دەچێ، چونکە جەستەی بنیادەم هێند با دەکا دنیای پێ پڕ دەبێ. ئەگەر مرۆ لە ترسان یا لە بەر هاوار گۆجیش نەبێ، ژیانی شەڕگەی سات بە سات لەگەڵ برسێتی و ترس و بێ خەوی و دڵەکزێ و ددانهێشەدا دەبێ.

دەفتەری یاداشتەکەی کردەوە، بەلایەوە گرینگ بوو شتێ بنووسێ. ژنی سەر تەلەسکرینەکە ئاوازێکی تری دەست پێ کردبو. دەنگەکە، وەک کەرتە شووشە لە مۆخی دەچەقی. هەوڵی دا بیر لە ئۆبراین بکاتەوە چونکە ئەو دەفتەرەی هەر بۆ ئەو و لە پێناوی ئەودا دەنووسی. بەڵام لە بری ئەوە، بیری لەوە کردەوە کە دوای ئەوەی پۆلیسی خەیاڵ دەیگرن چی لێ دێ. ئەگەر یەک جار بیانکوشتبای گرینگ نەبوو. چاوەڕێی کوشتن بووی.

بەر لە مەرگ (هەموو کەس دەیزانی و کەسیش باسی نەدەکرد) دەبوو بە پلەی دانپێدانانندا بڕۆی: هەڵپلکان و داد و هاوار، خـرمـەی ئێسکی شکاو، ددانی وردبوو، ڕنینەوەی تووکەسەر و ئەوسا پەڵەخوێن. بۆ دەبوو بەرگە بگریت ئەگەر ئەنجامەکەی یەکێ بێ؟. چما کورتکردنەوەی تەمەنت چەند ڕۆژێ یا چەند حەفتەیەک کارێکی نەکردەیە؟. کەس لە چنگی لێکۆڵینەوە نەدەخەلەساو کەسیش بە بێ دانپێدانان دەرنەدەچوو. لەو ڕۆژەوەی کە خۆت دەدایە دەست "تاوانی خەیاڵ"ەوە، بێ گومان عزرائیلت لێ دانەدەبڕا. ئەدی ئەو ترسە بۆ کە هیچیش نەگۆڕێ و لە هەناوی پاشەڕۆژدا بێ؟.

لەگەڵ کەمێ پێشکەوتندا لە چاو جارانەوە، داوای یارمەتی لە یادی ڕوخساری ئۆبراین کرد. ئۆبراین پێی گوتبوو: "لەو جێیە یەکتر دەبینین کە تاریکی لێ نییە". واتاکەی دەزانی یا وایدەزانی کە دەیزانێ. ئەو جێیەی کە تاریکی لێ نییە داهاتوویەکی خەیاڵییە، ئایندەیەکە کە هەرگیز مرۆ نایبینێ بەڵام پێشەکی، بەشی ئاڵۆزکاوی خۆی تێدا دەدی. بە هۆی دەنگی تەلەسکرینەکەوە کە جاروبار بەر گوێی دەکەوت، نەیتوانی لە سەر ڕشتەی خەیاڵی خۆی بڕوا. جگەرەکەی خستە سەر لێوی و یەکسەر نیوەی تووتنەکەی هەڵڕژایە سەر زمانی و گەردێکی تاڵ بوو و پێی نەدەتفێندرایەوە. سیمای (ڕێبەری گەورە)ی بەخەیاڵدا هات و جێی ئۆبراینی گرتەوە. ڕێک وەک چەند ڕۆژێ لەوەوبەر کە سکە پارەیەکی لە گیرفانی، هەر بە ڕێکەوت دەرهێنا و لێی ڕاما. وێنەکە سەیری ئەمی دەکرد. گران و سەنگین و پشتوپەنا: بەڵام ئەو بزە شاردراوەیەی ژێر سمێڵە ڕەشەکەی چ جۆرێ بوو؟. وشەکان، وەک زرینگەی زەنگ هاتنەوە خەیاڵی:

شەڕ ئاشتییە

کۆیلایەتی ئازادییە

نەزانیی هێزە

# بەشی دووەم

## ١

چێشتان بوو و وینستۆن بۆ مەبەستی چوونە سەر پێشاو ژوورەکەی جێ هێشت. لەو سەری ڕێڕەوە درێژ و ڕووناکەکەوە یەکێ بە تەنها، بەرەو ڕووی دەهات. کچە قژ ڕەشەکە بوو. چوار ڕۆژ بوو لە بەردەم دوکانی کۆنەفرۆشەکەدا تووشی ببوو. کە کەمێ لێی نزیک کەوتەوە، بۆی دەرکەوت باسکی ڕاستی بە ملیەوە هەڵپەساردووە. لە دوورەوە دیار نەبوو چونکە ئەوەی کە باسکی پێ پێچابوو بە ڕەنگی بەدلەکەی دەچوو. ڕەنگە لەو کاتەدا کە بە دەوری سلندەرە گەورەکانی (ئامێری وێنە)دا – کە وێنەی هەڵبەستراوی دەکێشا – سوڕابێتەوە، دەستی بەر شتێ کەوتبێ. ڕووداني وا، لە بەشی هەڵبەستندا ئاسایی بوو.

مەودای نێوانیان چوار مەتر نەدەبوو، کیژەکە بە لادا هات و بەدەم هاواری ئازارەوە بەربووەوە. دیارە کە بە سەر بازووە پێچراوەکەیدا ڕما. وینستۆن هەڵوێستەیەکی کرد. کیژەکە کەوتە سەر چۆک و ڕەنگی وەک شیر سپی هەڵگەڕا. لێوی، خۆیان سوورتر دەنواند. چاوی پڕ لە پاڕانەوەی لە وینستۆن بڕی کە جگە لە ئازار، ترسیشیان تێدا بەدی دەکرا.

هەستێکی سەیر لە دڵی وینستۆندا پەیدا بوو. ئەوەی بەردەمی، دوژمنی بوو و هەڕەشەی لە ژیانی دەکرد. لە لایەکی تریشەوە مرۆڤێ بوو و ئازاری هەبوو و پێ دەچوو ئێسکی شکابێ. هەر لەخۆڕا بۆی نوشتایەوە تا یارمەتی بدا. زانی بە سەر دەستە پێچراوەکەیدا کەوتووە، ئەم لە لای خۆیەوە هەستی بە ئازار دەکرد.

– ئازارت پێ گەیی؟.

– زۆر جێی مەترسی نییە. بازوومە، زوو چاک دەبێ.

دەنگی بە هی کەسێک دەچوو نەخۆشی دڵی هەبێ. ڕەنگی بە تەواوی بزڕکابو.

– خۆ جێیەکت نەشکاوە؟.

دەستە ساغەکەی بۆ درێژ کرد. ئەمیش یارمەتی ڕاستبوونەوەی دا. ڕەنگی هاتەوە سەر خۆ و پێ دەچوو کەمێ خۆی گرتبێتەوە.

– هیچ نەبوو، کەمێ ئازارم پێ گەیشت. سوپاس هاوڕێ.



دوای ئەوە بە ڕێی خۆیدا ڕۆیی. هێند ڕێک ڕێی دەکرد دەتگوت هیچ نەبووە. هەموو ڕووداوەکە، نیو دەقیقە پتری نەبرد. شاردنەوەی هەست و نەست لە سیمادا، کارێکی خۆڕسک بوو. لە کاتی ڕووداوەکەدا، هەردووکیان ڕێک بەرانبەر تەلەسکرینێک بوون. هەرچۆنێ بێ، زۆر گران بوو سەرسامیی یەکەم سات پەنهان بکرێ، چونکە لە ماوەی ئەو چەند چرکەیەدا کە دەستی کیژەکەی بۆ ڕاستکردنەوە گرت، شتێکی خزاندە ناو لەپیەوە. ئەوەش وای لێ کردبوو کە گومان بکات بە ئانقەست خۆی خستبێ. شتێکی بچکۆلە و تەنک بوو. کە گەیشتە ئاودەستەکە، هاویشتییە گیرفانی و بە نووکی پەنجەکانی تاوتوێی کرد. پارچە قاقەزێکی قەدکراو بوو.

بە دەم میزکردنەوە، توانی قاقەزەکە هەر لە گیرفانیدا یەکالا بکاتەوە. پێ دەچوو پەیامێ بێ. دوودڵ بوو لەوەی بیکاتەوە و بیخوێنێتەوە. دەیزانی کاری وا شێتییە چونکە جێیەک نەبوو لە چاوی تەلەسکرین شاردراوە بێ.

گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی و لێی دانیشت. پارچە قاقەزەکەی خستە نێوان قاقەزی ترەوە. چاویلکەکەی لە چاو کرد و بێژە و بنووسەی هێنایە پێشێ. لە بەر خۆیەوە گوتی: "پێنج دەقیقە، بە لای کەمەوە پێنج دەقیقە!". دڵی وەک کۆتری بێ دەرفەت سەری بە دیواری سینگیدا دەکوتا. خۆشبەختانە، ئەو کارەی کە خەریکی بوو، کارێکی ڕۆتینی ژمارە ڕێکخستن بوو و بیرکردنەوەی زۆری نەدەویست.

ئەوەی لە پەیامەکەدا نووسرابوو دەبێ ناوەڕۆکی سیاسییانەی هەبێ. بیری تەنها بۆ دوو شت دەچوو. یەکەمیان ئەوە بوو (ئەمەیان زیاتر ڕێی تێ دەچوو) کە کیژەکە خەفیەی پۆلیسی خەیاڵ بێ. نەشیدەزانی بۆ دەبێ پۆلیسی خەیاڵ بەم شێوەیە پەیامی بۆ بنێرێ. بەڵام دەبێ هۆی خۆی هەبێ. یا دەبێ فەرمانێ، پەیامێ، بانگکردنێ یا شتێکی لەو بابەتانە بێ و داوای خۆکوشتنی لێ بکەن. ئیحتیمالێکی تریش هەبوو کە زوو زوو بە مۆخیدا دەچەقی هەرچەندە خۆشی لێ دەدزییەوە. ئەوەش ئەوە بوو کە پەیامەکە لە پۆلیسی خەیاڵەوە نەبێ، بەڵکو لە ڕێکخراوێکی نهێنییەوە بێ. دوور نەبوو برایەتی بوونی هەبێ!. لەوانەیە ئەو کیژە سەر بەوان بێ. بیرکردنەوە بێ هوودە بوو. بە هەست و دەست و زەینی درکی بە قاقەزەکە کردبوو. گەیشتە ئەوەی کە یەکەم بۆچوونی بە سەردا زاڵ بێ. هەرچەندە هۆشی پێی دەگوت کە ناوەڕۆکی پەیامەکە مەرگە – بەڵام باوەڕی نەدەکرد وا بێ. ئەو هومێدە ناعەقڵانییە گەشەی دەکرد و دڵی، خۆی بە قەفەسی سینگیدا دەکێشا و بە زەحمەت دەیتوانی دەنگی لە ناو دەنگی ئامێری بێژە و بنووسەدا ون بکا.

دەستە کاغەزێکی تەواوی لوول دا و کردی بە گەرووی لوولەی ڕەوانکردنەوە. هەشت دەقیقەی پێ چوو. چاویلکەکەی لە سەر چاوی ڕێک خست و هەناسەیەکی هەڵکێشا. دەستە کاغەزێکی تری هێنایە پێشێ کە پەیامەکەی لە سەر بوو. ڕێکی خست. بە خەتێکی درشت و ناڕێک نووسرابوو:

خۆشم دەوێی.

ماوەیەک وا سەرسام بوو، بیری چوو ئەو قاقەزە مەرگهێنەرە بهاوێتە چاڵی خەیاڵەوە. بەر لەوەی بشیهاوێ، هەرچەندە دەیزانی چ مەترسییەکی تێدایە، خۆی پێ ڕانەگیرا و جارێکی تریشی خوێندەوە. دەیویست بە تەواوی لە وشەکان دڵنییا بێ.

ئەو ڕۆژەی تا بڵێیی ناخۆش بوو. هەوڵی حەشاردانی شڵەژانی خۆی لە تەلەسکرینەکە، لە مێشکگوشین بۆ ئەنجامدانی کارێک ناخۆشتر بوو. هەستی بە ئاگرێک، لە ناو دڵی خۆیدا دەکرد. نانخواردنی، لە کانتینە گەرم و قەرەبالغ و پڕهەراکەدا، لە عەزابی قەبر پێ ناخۆشتر بوو. حەزی دەکرد لە کاتی خواردندا تەنها بێ. بەڵام بەختی نەیهێنا و پارسۆنزە کەری لێ پەیدا بوو. هاتە لایەوە و لە کاتێکدا بۆن عارەقەی تێکەڵاوی بۆنی ژەنگی شۆرباکە دەبوو، بە گەرمیەوە باسی حەفتەی ڕقی دەکرد. بەو هەویرە قاقەزە شاگەشکە بوو کە ئەنجومەنی خەفیەتی (کیژەکەی خۆشی ئەندامی بوو)، بە پانایی دوو مەتر، وێنەی ڕێبەری گەورەیان پێ دروست کردبوو. کارەسات ئەوە بوو کە وینستۆن لە ناو ئەو قیژە و هەرایەدا، هیچی وای لێ حاڵیی نەدەبوو و دەشبوو بۆ قسە بێ سەروبەرەکانی ڕەزامەندی دەربڕێ. تەنها یەک جار چاوی بە کچە قژڕەشەکە کەوت کە لەوسەری کانتینەکە، لەگەڵ دوو کچی تردا دانیشتبوو. پێ نەدەچوو ئاگای لەم بێ. وینستۆنیش چی دی سەیری لای ئەوی نەکردەوە.

دوای نیوەڕۆی ناخۆشتر بوو. هەر لە پاش نانخواردن، کارێکی گرینگ و لە ڕادەبەدەر ناڕەحەتی بۆ پەیدا بوو و چەند سەعاتێکی دەویست تا تەواو بێ. دەبوو هەموو کارێکی تری بۆ وەلا نێ. ئەو کارە، پەیوەندی بە کالایەکی بەرهەمهێندراوی پێش دوو ساڵەوە هەبوو و دەبوو بە شێوەیەک ڕێکخرێ کە ئەندامێکی پلەداری حیزب - کە دەمێ بوو کەس نەیدەزانی چی بە سەر هاتووە - بە هۆیەوە ڕیسوا بێ. وینستۆن لە کاری وادا بلیمەت بوو و توانی بە هۆیەوە ماوەی دوو سەعات کیژەکە لە بیری خۆی بەرێتەوە. کە ڕوخساریشی بیر دەهاتەوە، ئارەزوویەکی ئازاراوی، بەرەو تەنهایی ڕایدەکێشا. تا بە تەنێ نەبوایە دەرفەتی بیرکردنەوەی بۆ ئەو ڕووداوە تازەیە نەدەبوو. ئەو شەوە، یەکێ بوو لەو شەوانەی



کە دەبوو بچێتە کۆبوونەوە. خواردنێکی بێ تامی تری لە کانتینەکە خوارد و بە پەلە بەرەو جێیی کۆبوونەوە چوو. لە دەمەتەقێی گاڵتەجاڕیدا بەشدار بوو. دوو دەست تێنسی کرد. چەند پەرداخێ (جن)ی خواردەوە. نیو سەعاتیش گوێی لە گوتارێ گرت بە ناوی: پەیوەندی سۆسینگ بە شەترەنجەوە. بێتاقەتی وەک خۆرە لە گیانی دابوو بەڵام ئەم جارە نەیدەویست کۆبوونەوە جێ بهێڵێ. بە دیتنی (خۆشم دەوێی) ئارەزووی ژیان لە ناخیدا چەسپ ببوو و پێی بێ عەقڵیی بوو دەست لە کاری بچووکی پڕمەترسی وەردا. کاتێ گەڕایەوە و چووە سەر تەختەکەی، سەعات بیست و یەک بوو. ئەو دەمە لە پەنای تاریکیدا بوو - لە ناو تاریکیدا و بە بێ دەنگیی، لە چاوی تەلەسکرینەکە دوور بوو - توانی خەیاڵی خۆی وەگەڕ بخات.

پەیوەندیکردن بە کیژەکەوە و دیتنی، تاکە کێشەیەک بوو کە دەبوو چار بکرێ. چی دی بیری لەوە نەدەکردەوە داوی بۆ نرابێتەوە. دەیزانی وا نییە. بەڵگەشی ئەوە بوو کە کاتێ پەیامەکەی وێ دا، زۆر شڵەژا بوو. ئەوەشی بە بیردا نەدەهات کە داواکەی ڕەت کاتەوە. پێنج شەو لەوەو بەر، بیری لەوە دەکردەوە بە گابەردێ کەللەی بهاڕێ. بەڵام چی دی ئەوە واتای نەمابوو. بیری لە جەستە ڕووتە جوانەکەی دەکردەوە کە لە خەونیدا دیبووی. ئەویشی وەک هەر بێعەقڵێکی دی، بە کەللەی پڕ لە درۆ و ڕق و هەستی وەک شەختە دەهاتە بەرچاو. دەترسا ئەگەر زوو پەیوەندی پێوە نەکا، ڕای خۆی بگۆڕێ. بینینی، مەترسی زۆری تێدابوو. بەوە دەچوو (کش مات)ت لێ کرابێت و بتەوێ لە یاریی بەردەوام بیت. ڕووت لە هەر جێیەک دەکرد تەلەسکرینێکت بە دیارەوە بوو. لە ڕاستیدا، دوای پێنج دەقیقە لە خوێندنەوەی پەیامەکە، بیری لە هەموو شتێ کردبۆوە تا بچێتە ژوان. بەڵام ئێستا کاتی ئەوەی هەبوو پێیاندابچێتەوە و یەکەیەکە بە سەریاندا چووەوە. دەتگوت کەرەسەی کارکردن لە سەر مێزێکدا ڕێک دەخات.

دیار بوو دەرفەتی دیدارێکی تری وەک ئەو بەیانییە، جارێکی دی هەڵناکەوێ. ئەگەر کیژەکە لە بەشی ئەرشیفدا کاری کردبا هاسانتر بوو. ئەو لە بەشی هەڵبەستدا کاری دەکرد و ئەمیش شتێکی ئەوتۆی لێ نەدەزانی تا بیانوویەک بدۆزێتەوە و بچێتە ئەوێ. ئەگەر بیزانیبا کەنگێ لە کار دەبێتەوە و لە کوێ دەژیا، دیسان خەمێکی دەخوارد. بەڵام دووکەوتنی نەفامانە بوو چونکە دەبوو لە دەرەوەی وەزارەتەکە چاوەڕێی بێ، کە ئەمەش سەرنجڕاکێشە. نەشدەکرا بە بەریدا نامەی بۆ بنێرێ - هەموو نامەیەک دەکرایەوە و گشت کەسێ بەوەیان دەزانی - کەم کەسیش نامەیان دەنارد. ناردنی پەیام، ئەگەر پێویست بوایە

دەبوو کارتێکی ئامادەکراو بێ کە ڕستەی درێژی لە سەر چاپ کرابوو. دەبوو خەت بە سەر ڕستە ناپێویستەکانەدا بهێنی. خۆ ناوی کیژەکەشی نەدەزانی چجای ناونیشانی. لە ئەنجامدا باوەڕی هێنا کە کانتینی وەزارەت چاکترین جێیە گەر بتوانێ لە ناوەڕاستی سالۆنەکەدا و لە ناو دەنگوهەرای خەڵکدا تووشی بێ، بەو مەرجەی لە چاوی تەلەسکرین دوور بێ و ئەو ڕێکەوتانە دەوری سیی چرکە بخایەنن تا چەند ڕستەیەک پێکەوە بڵێن.

ماوەی حەفتەیەک، بوونی وینستۆن بە خەونێکی بێ سەروبەر دەچوو. ڕۆژی دوایی، هەتا لە کانتینەکە دەرنەچوو کیژەکەی نەدی. دوور نەبوو کاتی کارکردنی گۆڕابێ. بێ ئەوەی تەماشای یەک بکەن بە لای یەکدا ڕەت بوون. ڕۆژی سێیەم، کیژەکە لە کاتی نانخواردندا پەیدا بوو و سێ کیژی تری لەگەڵدا بوون و ڕێک لە بەردەم تەلەسکرینەکە دانیشتن. دوای ئەوە، تا سێ ڕۆژی تەواو، هەر لە بنیی دەرنەکەوت. هۆش و جەستەی وینستۆن دوچاری حەساسیەتێکی تەواو ببوون. وای لێ هاتبوو هەموو بزووتن و دەنگ و خەڵک بینینێک و وشەیەک کە ناچاری گوتنی یا بیستنی دەبوو ئازاری دەدا. تەنها ئارامیەکی ئەگەر دیبێ لە کارەکەیدا دەیدی کە بۆ چەند دەقیقەیەک خۆی لە بیر دەکرد. چ هەواڵێکی کیژەکەی نەدەزانی و نەیدەزانی چی بە سەر هاتووە. نەدەکرا پرسیاری بکا. دوور نەبوو کرابێتە هەڵم. لەوانە بوو خۆی کوشتبێ یا بۆ ئەوسەری ئۆقیانووسیا ڕاگوێزرابێ. لەوانەش خراپتر، دوور نەبوو ڕای خۆی گۆڕیبێ و بڕیاری دابێ خۆی لێ لادات.

بۆ ڕۆژی دوایی دەرکەوت. باسکی بە ملیەوە هەڵنەپەساردبوو بەڵام بەسترابوو. بینینی هێند کاریگەر بوو، تا چەند چرکەیەک چاوی تێ بڕی و نەیتوانی سەیری نەکا. ڕۆژی دواتر، زۆری نەمابوو دەرفەتی دواندنی بۆ بڕەخسێ. کە وەژوور کەوت دیتی وا لە سەر مێزێک، دوور لە دیوارەکەوە دانیشتووە. هەر بە تەنها بوو. هێشتا زوو بوو و جارێ خەڵک نەهاتبوون. سەرە، وردە وردە پێش دەکەوت و وینستۆن زۆری نەمابوو بیگاتێ. پاش چەند دەقیقەیەک، سەرەکە وێستا. یەکێ بۆڵەبۆڵی ئەوەی بوو کە قەندی وەرنەگرتووە. کاتێ وینستۆن سینییە خواردنی وەرگرت و گەڕایەوە کیژەکە هێشتا تەنها بوو. ڕۆیی و چاوی لە جێیەکەی لای ئەو بڕیبوو. سێ مەتری مابوو بیگاتێ... دوو چرکەی دی خەمی دەخوارد. بەڵام یەکێ لە دواوە گازی کرد :" وینستۆن!". خۆی کەڕ کرد. دەنگەکە بڵندتر بانگی کرد: "سمیت!". ئیدی هیچ نەدەکرا. وەرچەرخایەوە. گەنجێکی سیما ناشرین بوو کە کەمێ دەیناسی. ناوی ویلشەر بوو. بە بزەوە داوای لێ کرد کە لە



سەر مێزەکەی ئەو دانیشێ. نەدەکرا داواکەی ڕەت کاتەوە. دوای ئەوەی ناسرایەوە ئیدی نەدەبوو بە تەنێ لە سەر مێزی کیژەکە دانیشێ. بە بزەیەکی دۆستانەوە دانیشت. ڕوخسارە ناشرینەکەش بزەی بۆ کرد. وینستۆن بە دەستی بوایە، تەورێکی بەفەساڵیدا دەکێشا. دوای چەند دەقیقەیەک مێزی کیژەکەش گیرا. دیارە کچەکە هەستی بەوە کردبوو کە وینستۆن بەرەو لای ئەو دەچوو. ڕەنگە لە مەبەستیشی تێگەیشتبێ. ڕۆژی دواتر وزە و ورەی خۆی گورج کردنەوە تا زوو بچێ. ڕێکەوتی چاک بوو. ئەو ڕۆژەش کیژەکە بە تەنێ هەر لەوێ دانیشتبوو. پیاوێکی کورتەبنەی ڕوخسار سیسرک، لە پێش وینستۆنەوە، لە سەرەدا بوو. وینستۆن کە سەرەی گەیشتێ، چاوی لێ بوو ئەو پیاوە، بەرەو سەر مێزی کچەکە دەچێ. دیسان هیوابڕاو بوو. جێیەکی چۆڵ لەولای کچەکەوە بوو و ڕۆیشتنی کابرا وای پێشان دەدا کە بیەوێ بۆ ئاسوودەیی ئەوێ هەڵبژێرێ. وینستۆن بە دڵی لەرزۆکەوە چاوی بە دوایەوە بوو. ئیللا و بیللا دەبێ بە تەنێ لەگەڵ کیژەکەدا بێ دەنا هیچ ناکرێ. هەر ئەو دەمە گرمەیەک هات. کابرای کورتەبنە لە زەوی کەوتبو و سینییەکەی لە دەست پەڕیبوو و شۆربا و قاوە بەو ناوەدا ڕژابوون. بە دەم تەماشایەکی ڕقاوییەوە کە ئاراستەی وینستۆنی کرد، هەستایەوە. دیار بوو ئەوی بە خەتابار زانیبوو. بەڵام بە سەلامەتی بڕایەوە و پاش پێنج چرکە وینستۆن بە دڵی پڕ خورپەوە بەرانبەر کیژەکە دانیشتبوو.

تەماشای نەکرد. هەرچی لە سینییەکەدابوو، لە سەر مێزەکەی دانا و کەوتە خواردن. بێ ئەوەی کات بە فیڕۆ بدا و کەسی بە سەردا بێ کەوتە قسان. دوور نەبو کیژەکە ڕای خۆی گۆڕیبێ. بێ گومان دەبێ گۆڕابێ. نەدەبوو ئەو مەسەلەیە بە خۆشی کۆتایی بێ!. شتی وا لە ژیانی واقعیدا ڕووی نەدەدا. ئەگەر لەو دەمەدا ئەمپلفۆرد، شاعیری گوێ کوڵکنی نەدیبا کە بە سینییەکەوە چاوی بۆ جێیەکی چۆڵ دەگێڕا، لەوانە بوو قسە نەکا. ئەمپلفۆرد ئولفەتی لەگەڵ وینستۆندا هەبوو. بیدیبا، بێ گومان لە لایەوە دادەنیشت. مەودای ئاخاوتن یەک دەقیقە زیاتر نەبوو. وینستۆن و کیژەکە، هەردووکیان بێ پشوو خەریکی خواردن بوون. خواردنەکەیان شۆربای لۆبیای سەوز بوو. وینستۆن بە دەنگێکی نەوی کەوتە دوان. هیچیان سەریان هەڵنەبڕی. کەوچکە شۆربایان دەخستە دەمیانەوە و لەو کاتەدا کە کەوچکەکانیان دەردەهێناوە، چەند وشەیەکیان بە نزمیی دەگوت.

– کەی لە کار دەبییەوە؟.

– هەژدە و نیو.

– لە کوێ دەتوانین یەکتر ببینین ؟.

– مەیدانی سەرکەوتن، لای بینای یادگاری.
– تەلەسکرینی زۆری لێ هەن.
– ئەگەر خەڵک لەوێ زۆر بن گرینگ نییە.
– ئیشارەتمان؟.
– هیچ. لێم نزیک مەبەوە. تاماشاشم مەکە. بەڵام دووریش مەبە.
– سەعات چەند؟.
– نۆزدە.
– زۆر باشە.

ئەمپلفۆرد وینستۆنی نەدی و لە جێیەکی دی دانیشت. هیچی تریان نەگوت. دەکرا دوو سێ کەسی نائاشنا، هەر یەکە و لە جێی خۆی، لە سەر یەک مێز بن. تەماشای یەکتریان نەکرد. کیژەکە، بە پەلە خواردنەکەی تەواو کرد و ڕۆیشت. وینستۆنیش لەوێ مایەوە تا جگەرەیەک پێ بکا.

وینستۆن، بەر لە کاتی دیاریکراو گەیشتە جێ ژوان. خولێ بە دەوری بناغە گەورە سواخدراوەکەدا خولایەوە کە پەیکەری (ڕێبەری گەورە) ڕێک لە سەری ڕاوێستابوو و بەرەو ئاسمانی لای باشووری دەڕوانی کە لەوێ، چەند ساڵێ لەوەبەر، بە سەر هێزی ئاسمانی ئەوروئاسیادا سەرکەوتبوو. شەقامەکەی ئەوبەرەوە، پەیکەری سوارێکی لێ بوو کە هی (ئۆلیڤەر کرۆموێل) بوو. پێنج دەقیقە لە کاتەکە ڕەت بوو بەڵام کچەکە دیار نەبوو. دیسان ترسێکی مەرگبار جەستەی وینستۆنی داگرت. نایات. ڕای خۆی گۆڕیوە!. لە سەرخۆ بەرەو سەرەوەی مەیدانەکە چوو. بە ناسینەوەی کڵێسای سێنت مارتین کە زەنگەکانی – ئەو عەیامەی زەنگی هەبوو – گوتبوویان " سێ سەنتمان وێدەوە " خۆشییەکی پێدا هات. کیژەکەی دیت کە بە لای پای پەیکەرەکەوە وێستابوو و شریتی ستوونی و بە پێچی هەواڵی دەوری پەیکەرەکەی دەخوێندەوە یا وای پێشان دەدا کە دەیخوێنێتەوە. نەدەکرا بەر لەوەی دەوری قەرەباڵغ بێ لێی نزیک بکەوێتەوە. هەموو جێیەک تەلەسکرینی لێ بوو. لەو دەمەدا، لەلای دەستە چەپەوە، گوێی لە هاڕەهاڕی ئۆتۆمبیلی گەورە بوو. کیژەکە، بە پەلە کەوتە ناو خەڵکەکە و ئەمیش دوای کەوت. کە دەڕۆیشتن، هەواڵ بڵاو بووەوە کە دەستەیەک لە یەخسیرەکانی ئەوروئاسیا ڕەت دەکرێن.

حەشاماتێکی زۆری تێکهەڵقژاو لای باشووری مەیدانەکەی تەنیی بوو. وینستۆن کە لە



کاتی ئاساییدا خۆی لە هەموو خۆتێهەڵقورتانێک دەپاراست، بە دەست و ئانیشکی، ڕێی خۆی بە ناو خەڵکەکەدا کردەوە. بە زوویی لە کیژەکە نزیک بووەوە و دەستی بردبا دەیگەیشتێ. بەڵام کرێکارێکی دێوئاسا و ژنێکی لە چەشنی خۆی کە وێ دەچوو هاوسەری بێ، دیوارێکی گۆشتیان لە نێوانیاندا پێک هێنا. کەوتە تەقەللا و جێی خۆی لە نێوانیاندا کردەوە. هەستی دەکرد هەناوی لە نێوان ئەو دوو بەربەستەدا دەهاڕدرێ. بەڵام لە ئەنجامدا، دوای چینێ عارەقە دەردان بە نێوانیاندا ڕەت بوو و گەیشتە تەنیشتی کیژەکە. شانبەشانی یەک وێستان و تەماشای پێش خۆیان دەکرد.

ڕیزێ لۆری، بە چاودێری بێ سیمای ڕەشاشبەدەستەوە کە ئامادە وێستابوون، لە سەر خۆ بە شەقامەکەدا ڕەت دەبوون. لە ناو لۆرییەکانیشدا، خەڵکێکی وردیلەی ڕەنگزەرد، بە جلی سەوزی بەڵەکەوە لە سەر چنچکان دانیشتبوون و وەک دەنکە هەنار پێکەوە نووسابون. بە سیمای مەغۆلی خەمبارەوە، تەماشای کتوپڕی حەشاماتەکەیان دەکرد. کە لۆریەکان زیاد نزیک بوونەوە، زرە زرِ دەبیسترا: هەموو دیلەکان پێوەند کرابوون. بڕ بڕ سیمای خەمبار ڕەت دەبوون. وینستۆن دەیزانی ئەو لۆرییانە دیلیان تێدان وسیمای خەمباریانی دەدی. هێند بە کیژەکەوە لکابوو هەستی بە گەرمایی جەستەی دەکرد. کیژەکە، وەک لە کانتینەکەدا دەرفەتی قۆستەوە، لەوێش وای کرد. دوگمەی لێوی بزواند. بە بڵمەیەک کە لە ناو هاتوهاوار و نەڕەی لۆریدا گوم بوو، هاتە گۆ :
– گوێت لە دەنگم دەبێ؟.
– بەڵێ.
– دەتوانی دوانیوەڕۆی یەکشەممە مۆڵەت وەرگری؟.
– بەڵێ.
– باشە گوێ بگرە. دەبێ بیرت تیژ بێ... بچۆرە ویستگەی پەدینگتۆن.

بە دیقەتێکی سەربازانە کە وینستۆنی پێ سەرسام بوو، باسی ئەو ڕێیەی بۆ کرد کەپێیدا دەچوو: بە قەتار نیو سەعات دەبا؛ بەلای دەستەچەپدا دابەزە؛ دوو کیلۆمەتر ڕێ دەبڕی دەروازەیەکت دێتە پێش کە سەرەوەی چارچێوەکەی نەماوە، ڕچەڕێیەک بە چەمەنزارێکدا، کوێرەڕێییەکی گیا لێ ڕواو ؛ خەتێک بە نێوان پنچکەکاندا؛ درەختێکی هیشک، قەوزەی لە سەر ڕواوە. ئەوجا بە چپە گوتی: هەمووت بیر دەمێنن ؟.
– ئا.

– بە لای چەپدا پێچ کەرەوە، دوایی بەلای ڕاستدا، دیسان بە چەپدا. دەروازەیەک سەرەوەی لاچووە.

– باشە. کەی؟.

– سەعات پانزە. دوور نییە کەمێ چاوەڕوانی بکێشی. من بە ڕێیەکی تردا دێم. گشتیت لە بیر دەمێنێ؟.

– بەڵێ.

– دەی جا تا زووە لێم دابڕێ.

پێی نەدەویست ئەوەی پێ بڵێ. تا ماوەیەک نەیاندەتوانی خۆیان لە یەک دوور بخەنەوە. لۆرییەکان هێشتا ڕەت دەبوون. هێشتا خەڵکەکە بە زاری بەشەوە ڕاوەستابوون. دەنگی هەلهەلە و هوتاف لە لایەن ئەندامانی حیزبەوە دەهات کە لە ناو خەڵکەکە بوون، بەڵام زوو بڕایەوە. خەڵک بۆ ئەوە خرۆشابوون تا بزانن چ باسە. ئەو بێگانانە، ئەوروئاسیایی بوون یا ڕۆژهەڵاتی ئاسیایی؟. جۆرە گیانلەبەرێکی سەیر بوون و بە دیلی نەبوایە نەدەبیندران، ئەوەش لە بارودۆخی کتوپڕدا. کەمێکیان نەبێ کە بە ناوی (تاوانبارانی جەنگ)ەوە هەڵدەواسران، ئەوانی دی کەس نەیدەزانی چارەنووسیان چی لێ دێ. هەر وا ون دەبوون. لەوانەبوو بۆ ئۆردوگای زۆرەملێی بێگاریان بەرن. سیمامەغۆلییە خڕە تۆزاوییەکان، جێیان بۆ سیما ئەوروپاییەکان چۆڵ کرد – چڵکن و ڕیشن وماندوو. لە سەر گۆنای قوپاویانەوە، چاویان لە وینستۆن دەبڕی و دایاندەخستنەوە. ڕیزی قافڵە بەرەو تەواو بوون دەچوو. لە دوا لۆریدا، پیاوێکی بە تەمەنی دی کە ڕوخساری بە پنچکی کوڵکنی بۆر دەچوو. مەچەکی لە سەر سینگی وەک خاچ تێکپەڕاندبوون و دەتگوت دەقی پێوە گرتووە. کاتی لێکدابڕانی وینستۆن و کیژەکە هاتبوو. لە دوادەرفەتدا کە خەڵکەکە تێکهەڵقژان و بەر یەک دەکەوتن، دەستی وینستۆنی گرت و گوشی.

ئەو دەستگوشینە دە چرکەی نەبرد، بەڵام دەتگوت زەمانێکی دوور و درێژە. فریای ئەوە کەوت بزانێ دەستی چۆنە. پەنجەی درێژ و نینۆکی قەڵەمکراوی تاوتوێ کرد. ناولەپی بە هۆی کارەوە زبر بوو و مەچەکی نەرم. لەو کاتەدا بیری کەوتەوە کە نازانێ ڕەنگی چاوی چۆنە. لەوانەیە قاوەیی بن. بەڵام گەنمڕەنگ، هێندێ جار چاویان شینە. وەرچەرخان و سەیرکردن بێ عەقڵیی بوو. بە دەستی تێکپەڕاو و جەستەی پێکەوە نووساوەوە تەماشای پێش خۆیان دەکرد و چاوی دیلە بەتەمەنەکەش لە ناو تووکەکانی ڕوخساریەوە، لە بری چاوی کیژەکە، لە چاوی وینستۆنیان دەڕوانی.



## ٢

وینستۆن بە ڕچەکەدا، بە نێوان پەڵە سێبەر و پەڵەهەتاودا هەنگاوی دەنا و لە هەر جێیەک درەختەکان مەودای خۆریان بدابا، دەتگوت ئەم پێ دەنێتە چاڵە زێڕەوە. بن دارەکانی لای چەپی، ڕایاخی (گوڵە زەنگوڵە)ی شین بوو. کزەبا، دەتگوت ماچی دەکا. دووەمی مایس بوو. لە ناو قووڵایی دارستانەکەوە گمەی قومری دەهات. کەمێ زوو بوو. سەفەرەکە بە بێ بچووکترین کێشە دوایی هات. کیژەکەش هێندە بەڵەد بوو کە وینستۆن ترسی کەم بێ. بۆ وەدەستهێنانی پەناگەیەکی چەپ، دەبوو پشتی بە کیژەکە قایم بێ. لەوە دڵنیا نەبوو کە لادێ لە لەندەن ئەمینتر بێ، بەڵام دەیزانی تەلەسکرینی لێ نیە هەرچەندە گومان دەکرا مایکرۆفۆنی لێ شاردرابێتەوە و دەنگیان تۆمار بکرێ و بناسرێنەوە. سەفەریش بە تەنها سەرنجڕاکێش نەبوو. سەفەرێک لە سەد کیلۆمەتر کەمتر بوایە پەساپۆرتیشی نەدەویست. هێندێ جار مەفرەزەی پۆلیسی گەڕۆک لە وێستگەکاندا سۆراغی پسوولەی ئەندامێتی حیزبیان دەکرد و پرسیاری بێ سەر و بەریشیان دەکرد. بەڵام ئەم جارە سەروسەکوتی پۆلیس دیار نەبوو. هەر کە دابەزی، بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە ملی ڕێی گرت. دڵنیا بوو کە تاقیب ناکرێ. شەمەنەفەرەکە پڕبوو لە کرێکاران کە بە هۆی گەرمای هاوین ئاساوە میزاجیان بەوە دەچوو پشوویان هەبێ. وینستۆن لە ژوورێکی فارگۆنێکدا دانیشتبوو کە یەک تاکە خێزان هەموویان داگیرکردبوو. هەر لە نەنکە گەورەی بێ ددانەوە بگرە تا دەگاتە منداڵی شیرەخۆرە، هەر ئەوان بوون. دەچوونە گوند تا ئەو دوانیوەڕۆیە لەگەڵ خزم و کەسدا بەسەر بەرن و– چی لە وینستۆن پەنهان بێ – بە قاچاغ، هێندێ کەرەش لەگەڵ خۆیاندا بهێننەوە.

ڕێیەکە، گیای زۆری لە سەر ڕوابوو. پانتر بووەوە و هێندەی نەبرد گەیشتە ڕچەکەی ناو بنچکەکان. سەعاتی پێ نەبوو بەڵام دەیزانی هێشتا پانزە نەبووە. گوڵەزەنگوڵەکان وا تێکهەڵقژابوون، چار نەبوو، هەر دەبوو بیانشێلێ. داچەمییەوە و کەوتە گوڵچنین. لە لایەکەوە، دەیویست وەخت بکوژێ و لە لایەکی تریشەوە بە چەپکە گوڵێکەوە پێشوازی لە کیژەکەبکا. چەپکێکی گەورەی چنی و بۆنە سووکە خۆشەکەی هەڵدەمژی. دەنگێک لە دوایەوە هات. لە جێی خۆی وشک بوو. لە سەر گوڵچنین بەردەوام بوو. ئەوەی پێ چاکترین کار بوو کە دەبوو ئەو دەمە بیکا. لەوانەیە کیژەکە بێ و هاتبێ. لەوانەشە تاقیب

کرابێ. ئاوڕدانەوە و سەیرکردن لە پلەی تاواندا بوو. گوڵێکی تر و گوڵێکی تری چنی. دەستێک بە عاستەم بە شانی کەوت.

ئاوڕێکی کتوپڕی دایەوە، و کیژەکەی دی. سەری ڕاوەشاند و هێمای بێدەنگی بۆ کرد. بە دەم وەلانانی درەختەکانەوە، بە پەلە بە ڕچەکەدا، بەرەو ناو دارستانەکە کەوتە ڕێ و وینستۆنیش دووی کەوت. دیار بوو پێشتریش ئەوێی دیبوو بۆیە کە بە جێی ناڕەحەتدا ڕەت دەبوو، بە پێی عادەت خۆی گورج دەکرد. وینستۆن، بە چەپکە گوڵەکەوە هەر بە دوایەوە بوو. سەرەتا، هەستێکی ئارامی هەبوو بەڵام کە تەماشای لەشولاری توندوتۆڵی کیژەکەی کرد و پشتێنە سوورەکەی دەوری کەمەری دەدی کە سمتی دەرپەڕاندبوو، هەستی بە شەرمەزاری دەکرد. ئەو دەمەش بە دووری نەدەزانی کیژەکە ئاوڕێکی لێ بداتەوە و لەوەی کە کردویەتی ژیوان بێتەوە. هەوای خۆش و درەختە سەوزە جوانەکان حەیرانیان کردبوو. هەر لە وێستگەکەشەوە تا ئەوێ، هەتاوی مایس وای لێ کردبوو هەست بە پۆخڵی و بێ ڕەنگی خۆی بکا کە خۆی لە ماڵێ دەپەستێ و هیسی لەندەن دەگرێ. بیری کەوتەوە کە تا ئەو دەمە کیژەکەی لە ڕووناکایی تەواو و دنیای کراوەدا نەدیوە. گەیشتە ئەو دارە ڕماوەی کە کیژەکە باسی کردبوو. کیژەکە داچەمی و ئەو بنچکانەی بەملا و ئەولادا چەماندەوە کە پێ نەدەچوو بەتاڵاییان لە نێواندا هەبێ. وینستۆن بە دوویدا چوو. دیتی کە لە جێیەکی چۆڵ و سروشتیدایە: تەپۆڵکێکی گچکە، کەمێ گیای لە سەر ڕوابوو و دەوری بە درەخت تەندرابوو. کەنیشکەکە لە جێی خۆیدا وێستا. ئاوڕێکی لە وینستۆن دایەوە و گوتی: "گەیشتین".

وینستۆن چەند هەنگاوێکی مابوو بیگاتێ، بەرانبەری وێستا. زاتی نەدەکرد لێی نزیک بکەوێتەوە. کچەکە، لە سەر گوتەی خۆی ڕۆیشت:"نەمویست بە دەم ڕێوە قسانت لە گەڵدا بکەم. گوتم نەبادا مایکرۆفۆنی لێ شاردرابێتەوە. باوەڕ ناکەم، بەڵام ڕێشی تێ دەچێ. قەت بە دووری مەبینە یەکێ لەو بەرازانە دەنگی خەڵک بناسنەوە. لێرە، لە هەموو بەڵایەک دوورین.

هێشتا نەیدەوێرا لێی نزیک بێتەوە. ئەمیش بۆی سەندەوە: "لێرە لە هەموو بەڵایەک دوورین".

"- بەڵێ!. تەماشای درەختەکان بکە". درەختەکان تازەنەمام بوون. لە بنەوەڕا بڕدرابوونەوە و دیسان ڕسکابوون. هێندەی مەچەکێ ئەستوور دەبوون و دارستانێکی



نەمامیان پێک هێنابوو: " مایکرۆفۆن لێرە داناندرێ. با پێشت بڵێم کە پێشتریش هاتوومەتە ئێرە".

قسەکان ئاسایی بوون. وینستۆن لێی نزیک ببۆوە. کەنیشکەکە، بە دەم بزەیەکەوە کە گەمە پێکردنی پێوە دیار بوو، ڕێک بەرانبەری ڕاوێستا. دەتگوت گەمەی بە ساوەساوی وینستۆن دێ. گوڵە زەنگوڵەکان، دەتگوت لە خۆڕا بەربوونەتەوە سەر تەپۆڵکەکە. دەستی کیژەکەی گرت.

– باوەڕ دەکەی تا ئێستا نەمزانیوە چاوت چ ڕەنگن؟

چاوی بینی. قاوەییەکی کاڵ بوون و برژانگی تۆخ. ئەوجا گوتی:

– ئێستا کە بە ڕاستی دەمبینی، هەر دەتوانی سەیرم بکەی؟.

– بەوپەڕی خۆشییەوە.

– تەمەنم سیی و نۆ ساڵە، ژنێکم هەیە و لە ملم نابێتەوە. نەخۆشی ڕەگکشانم هەیە. پێنج ددانم عەمەلین.

– چ گوێ بەو شتانە نادەم.

دوای تاوێ کیژەکەی لە ئامێزدا بوو و کەس نەیزانی کامیان دەسپێشکەری کرد. لە سەرەتاوە، هەستی ناباوەڕی نەبێ چ هەستێکی تری تێدا نەبوو. ئەو جەستە خرتە خۆی پێوە لکاندبوو. ئەو قژە ڕەش و پڕە بە ڕوخساری دەکەوت و ئا! بە ڕاستی سەری هەڵبڕی و ئەو لێوە گۆشتنە سوورانەی ماچ کرد. باسکی لە ملی وینستۆن ئالاندبوو. پێی دەگوت خۆشەویستەکەم، ئەوینەکەم. لەگەڵ خۆیدا بە زەویدا دا. چ بەرگری نەکرد. هەرچییەکی بویستبا دەیتوانی لەگەڵیدا بکا. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە جگە لە لێک کەوتنی دوو جەستەی شێدار، هەستی بە هیچ نەدەکرد. جگە لەوەش، جۆرە شانازییەک لە دڵیدا چەکەرەی کردبوو. هەرچەندە حەزی نەدەبزوا، دڵی بەو ڕووداوانە خۆش بوو. مەسەلەکە کتوپڕ بوو و لاوێتی و تەرووپڕی جەستەی کچەکە گەشکەداریان کردبوو و لەگەڵ بێ ژنیشدا ڕاهاتبوو – ئا، لە هۆیەکان دڵنیا بوو. کیژەکە ڕاست بووەوە و گوڵە زەنگوڵەیەکی لە قژی کردەوە. خۆی بە وینستۆنەوە نووساندو باوەشی پێدا کرد. پاشان گوتی:

– گوێ مەدەرێ ئازیزم. چ پەلەمان نییە و هەموو ئەم تاقەمان بە دەستەوەیە. ئەرێ ئەم جێیەت پێ چاک نییە؟. جارێکیان لە مەشقدا ڕێم هەڵە کرد و ڕێم کەوتە ئێرە. ئەگەر یەکێ بۆ ئێرە بێ، لە دوورەوەڕا، لە دووری سەد مەترەوە پێی دەزانین.

– ناوت چییه؟.
– جولیا. من ناوی تۆ دەزانم. ناوت (وینستۆن سمیت)ە.
– چۆنت زانی؟.
– گیانەکەم، پێم وایە من لە تۆ چاکتر پەی بە شت دەبەم. پێم بڵێ، بەر لەوەی پەیامەکەت وێدەم چۆنت بیر لێ دەکردمەوە؟.

درۆی بە پێویست نەزانی. باسکردنی خراپترین باری سەرەتا، دیاری دڵداری بوو.

– توانای بینینتم نەبوو. حەزم دەکرد زۆرگێت بکەم، ئەوسا بتکوژم. پێش دوو حەفتە، هەر بە ڕاستی ویستم بە گابەردێ کەللەت بهاڕم. ڕاستت دەوێ، پێم وا بوو پەیوەندیت بە پۆلیسی خەیاڵەوە هەیە.

کیژەکە بە گەرمی پێکەنی. ئەو گوتانەی بە بەڵگەنامەی ڕووپۆشی خۆی دانان.

– پۆلیسی خەیاڵ!. بە ڕاستی پێت وابوو؟.
– ئا... ڕێک وا نا. بەڵگەم شێوەت... هەر بەو بەڵگەیەی کە جوان و ساغ و تەڕ بووی دەمگوت دوور نییە...
– پێت وابوو ئەندامێکی چاکی حیزبم. بە ڕەفتارمدا ئەوەت دەزانی. ئەهلی لافیتە و دروشم و یاری و مەشقی گشتیم. وات دەزانی لە یەکەم دەرفەتدا ملت بە شکاندن دەدەم.
– ئا، شتێکی لەو بابەتانە. خۆت دەزانی گەلێ کیژی گەنجی وا هەن.

کیژەکە پشتێنەسووری دژە سێکسی کردەوە و گوتی:"هەموو هۆیەکە ئەم شتە قۆڕەیە" و هاویشتییە سەر چڵە دارێک. وەک ئەوەی کتوپڕ شتێکی بیر کەوتبێتەوە، دەستی بە بەرکیدا کرد و شوکلادێکی دەرهێنا و کردیە دوو لەتەوە و یەکێکیانی دایە وینستۆن. بەر لەوەی لێی وەرگرێ، بە بۆنەکەیدا زانی شتێکی دەگمەنە. قاوەییەکی درەوشەدار بوو و بە قاقەزی زیوین پێچرابۆوە. شوکلادی ئاسایی قاوەییەکی تاریک بوو و تامەکەی، ئاگری زبڵی بیردەهێنایەوە. جاروبارێ تامی شوکلادی وەک ئەمەی کیژەکەی کردبوو. بۆنەکەی، یادگارییەکی تەماوی، بەڵام پڕ لە دڵەخورپەی لێ زیندوو کردەوە.

– ئەمەت لە کوێ بوو؟.

ئەویش بە بێ مبالاتی گوتی: – بازاڕی ڕەش. لە ڕاستیدا من لەو بابەتە کچانەم کە لە شت ورد دەبنەوە. دەستی وەرزشم هەیە. کاتی خۆی، ڕێبەری دەستەیەکی ئەنجومەنی خەفیەگەری بووم. حەفتەی سێ ئێواران لە ئەنجومەنی لاوانی دژی سێکسدا هەرەوەزی



دەکەم. سەعاتەها و سەعاتەها توڕڕەهاتی ئەوانم بە دیوارەکانی لەندەنەوە هەڵواسیوە. لە هەموو خۆپێشاندانێکدا بەشدار دەبم و لافیتە هەڵدەگرم. هەمیشە خۆم بە بەختەوەر پیشان دەدەم و هەرگیز بێزاری دەرنابڕم. بۆچوونی من وایە: لەگەڵ ئەو عەلەمەدا بقیژێنە. ئەوە تاکە ڕێگای خۆپاراستنە.

یەکەم لەتی شوکلادەکە لە سەر زمانی وینستۆن توایەوە. تامی زۆر خۆش بوو. هێشتا بیرەوەرییەکەی ناخی دەیوروژاند. بیرەوەرییەک بوو، هەستی پێ دەکرد بەڵام بۆی نەدەچووەوە سەر یەک. دەتگوت شتێکە وا بەسەر برژانگییەوە بەڵام نایبینێ. هەوڵی لەبیربردنەوەی دا، حەزی دەکرد زیندوو بێتەوە بەڵام نەدەکرا.

– تۆ زۆر گەنجی. دە پانزە ساڵ لە من منداڵتریت. چت لە پیاوێکی وەکوو من داوە؟.
– شتێکی ڕوخسارت. حەزم کرد تاقی بکەمەوە. بۆ ئەوە دەشێم خەڵکی ناجۆر هەڵبژێرم. هەر کە چاوم پێت کەوت، زانیم دژی (ئەوان)یت.

دیار بوو مەبەستی لە (ئەوان)، حیزب بوو. زیاتریش مەبەستی کۆمیتەی ناوەندی بوو کە بە زەقی، بە گەمەپێکردن و قینەوە باسی دەکردن. هەرچەندە وینستۆن دەیزانی ئەو جێیە دوورە بەڵایە، لە گەڵ ئەوەشدا شڵەژا. ئەوەی دەیشڵەژاند ئاخاوتنی بێ پەردەی کیژەکە بوو. کەس بۆی نەبوو بە خراپە باسی کۆمیتەی حیزب بکا. خودی وینستۆنیش، کەم جار بە دەنگی بڵند خراپەی گوتبوون. بەڵام جولیا، دەتگوت بە بێ بەکارهێنانی ئەو وشانە کە بە دار و دیوارەوە نووسرابوون، ناتوانێ ناوی حیزب، بە تایبەتی کۆمیتەکان بهێنێ. وینستۆن ئەوەی پێ ناخۆش بوو. نیشانەی یاخیگەرێتی کیژەکە بوو بەرانبەر حیزب و هەموو شتێکی حیزب. ئەوەش، وەک پڕمەی ئەسپ، کە بۆن بە ئالیکی خراپەوە بکا، سروشتیی بوو. جێیە کراوەکەیان جێ هێشت و بە بەر سێبەر و پەڵە هەتاوەکاندا ڕۆیشتن و لە هەر جێیەک مەودا بوایە، دەستیان دەخستە ناوقەدی یەک. وینستۆن، ناوقەدی کچەکەی بە بێ پشتێن پێ ناسکتر بوو. بە چپە قسانیان دەکرد. جولیا گوتبووی کە لە جێی بێ پەنادا بێدەنگی چاکە. زوو گەیشتنە ڕووتەڵانێکی کەمی دەوەنەجاڕێک.

جولیا پێشی لە وینستۆن گرت و گوتی : "مەچۆرە جێی کراوە. دوور نییە یەکێ بتبینێ. پەنای نەمامەکان بێ وەیە".

لە بەر سێبەری داربادەمەکەدا وێستابوون. تیشکی هەتاو، بە نێوان گەڵا زەردەکاندا گەرمایی پێ دەبەخشین. وینستۆن ڕوانییە ئەوسەری چەمەنزارەکە و سووکە لەرزێکی سەیر گرتی. ئەو جێیەی دیبوو. کۆنە لەوڕگەیەکی داخراو، ڕچێکی بە نێواندا دەڕۆیی. لێرە و

لەوێ، تەپۆڵکەی ڕووتی تێدا بوون. لە پشتی پەرژینە خواروخێچەکانەوە، لەوبەرەوە، چڵی دارەبەند، با دەیهێنان و دەیبردن و گەڵاکان بە قژی ئافرەت دەچوون. لەو دەورە، لە جێیەکی پەنهاندا دەبوو گۆماو هەبێ و چاڵاوە سەوزەکانی قەراغی، ماسییان تێدا بن. لە سەرخۆ گوتی:

– ئەم ناوە گۆماوی لێیە؟.

– بەڵێ. لە دەم ئەو چەمەنە گۆماو هەیە و ماسی گەورە گەورەی تێدان. لە ناو چاڵاوی بن دارەکاندا دیارن. وەک شێت مەلە دەکەن و دەم دادەبچڕن.

– ئێ دە بڵێ سەرزەمینی زێڕینە و ئەها!

– سەرزەمینی زێڕین؟.

– نەء، هیچ. هێندێ جار لە خەونما دەیبینم.

جولیا بە چپە گوتی: – تەماشا کە!.

مریشکە کێوییەک پێنج مەتر لەولایانەوە، لە سەر چڵەدارێک هەڵنیشتبوو. لە بەر خۆرەکە بوو و وێ دەچوو ئەمانی لەبەر سێبەرەکە نەدیبێ. باڵی فش کردنەوە. پاشان بە وریایی جووتی کردنەوە. وەک ئەوەی سوپاسی خۆر بکا کەمێ سەری خوار کرد. ئەوجا دەستی بە چڕین کرد. لەو بێدەنگی دوانیوەڕۆیەدا، وای دەخوێند گوێگری حەیران دەکرد. وینستۆن و جولیا، بە سەرسامییەوە لە یەکیان ڕوانی. ئاوازێکی مۆسیقا بوو و هێواش هێواش بەرز دەبووەوە. دەتگوت ئەو پەلەوەرە، دەیەوێ پسپۆریی خۆی بنوێنێ. جاروبارێ دەبیبڕییەوە. سەرلەنوێوە باڵەکانی گورج دەکردنەوە و قورگی پڕ لە با دەکردەوە. ئەو پەلەوەرە، بۆ چی و بۆ کێی دەخوێند؟. جووتەکەی سەیری نەدەکرد یا دوژمنێک ؟. چی وای لێ کردبوو بە تەنێ، بە لێواری ئەو درەختەوە هەڵنیشێ و ئاواز لە ناخی نەبوونەوە دەربهێنێ ؟. وینستۆن دوودڵ بوو لەوەی مایکرۆفۆنێ لەوناوە حەشار نەدرابێ. ئەو و جولیا هەر بە چپە داخاوتن ومایکرۆفۆن دەنگی وەرنەدەگرتن. بەڵام دەنگی ئەو مەلە وەردەگیرا. دوور نەبوو لەولا، یەکێکی کورتەبنەی چارە سیسرک دانیشتبێ و گوێ لەو پەلەوەرە بگرێ. لافاوی ئاوازی مۆسیقا، هێواش هێواش دەڕژایە سەر جەستەی و لەگەڵ تیشکی هەتاوەکەدا کە لە نێوان گەڵاکانەوە دەهات، تێکەڵاو دەبوو. خۆی لە دەستی بیرکردنەوە ڕەها کرد و تەسلیمی دەستی هەست بوو. ناوقەدی کیژەکە لە نێوان بازوویدا نەرم و گەرم بوو. بەرەو لای خۆی ڕایکێشا و هەردووکیان، هەناسەی قووڵیان هەڵکێشا. پەلەوەرەکە هەراسان ببوو و باڵی پێکدا دەدان.



وینستۆن، دەمی خستە پەناگوێی جولیا و گوتی:" دەی!"

ئەویش بە چپە وەڵامی دایەوە و گوتی:" لێرە نا. با بچینەوە پەناکە. ئەوێ ئەمینترە". بە دەم شکاندنەوەی گژوگیای ژێر پێیانەوە، بەوێدا گەڕانەوە کە پێیدا هاتبوون. گەیشتنە ناو بازنەی نەمامەکان وکیژەکە بەرانبەر وینستۆن ڕاوێستا. هەردووکیان هەناسەبڕکەیان بوو. بەڵام بزەی گەمەئامێز لێوی کیژەکەی گرتبوو. کەمێ تەماشای وینستۆنی کرد. دەستی بۆ زنجیری بەدلەکەی خۆی برد. بەڵێ، لەگەڵ خەونەکەی وینستۆندا ڕێک دەهاتەوە. بەو خێراییە جلەکانی لە بەر خۆی داماڵاندن کە وینستۆن بیری لێ دەکردەوە. بە نازێکی واوە جلەکانی تووڕدان دنیایەکی فەنا دەکرد. جەستەی ڕووتی، لە بەر تیشکی هەتاوەکە وەک ئەڵماسی سپی دەدرەوشایەوە. وینستۆن تا ماوەیەک سەیری نەکرد چونکە مەلی چاوی لە سەر ڕوخسارە بە بزە نەخشێندراوەکەی هەڵنیشتبوو. بەرانبەری کەوتە سەر چۆک. دەستی گرت و گوتی:

– پێشووتر ئەم کارەت کردووە؟.

– بێ گومان. سەدان جار – یا، بە هەرحاڵ، بیست سیی کەڕەت.

– لەگەڵ ئەندامانی حیزبدا؟.

– بەڵێ، هەموو جارێ لەگەڵ ئەندامی حیزبدا.

– ئەوانەی ناوەندی حیزبیش؟.

– نەء، لەگەڵ ئەو بەرازانەدا نا. هەرچەندە بچووکترین دەرفەتیان هەبێ ئاوی لێ ناخۆنەوە. هێندە پیرۆز نین وەک لە خۆیان گەیشتوون.

تەپپە لە دڵی وینستۆنەوە هات. بیست سیی جار کردوویەتی: حەزی دەکرد سەد جاری کردبا – هەزاران کەڕەت بوایە. هەر هێندەی نیشانەی فەسادی لە خۆی دەرخست، دەتگوت دنیایەک هیوای دوورەدەست بە سەر وینستۆندا داباری. خەڵک چوزانن؟. لەوانەیە حیزب لە ناوەوە کلۆر بووبێ و ئەو هەموو ملهوڕی و وریاییە ڕووپۆشی بۆشییان بێ. بیتوانیبا هەموویانی دووچاری نەخۆشی سیفلس و گەڕبوون دەکرد. بە شادییەوە دەیکرد. هەموو شتێکی دەکرد بەو مەرجەی بۆگەنیان بکا و لاوازیان بکا و هەڵیانتەکێنێ!. ڕایکێشا و ئەویشی خستە سەر چۆک. ڕووبەڕووی یەک بوون.

– گوێ بگرە، چەندت پیاو سواری خۆت کردبێ، هێندە زیاترم خۆش دەوێی. تێدەگەی؟.

– ئا، بە تەواوی.

– لە پاکژی بێزارم. لە چاکە بێزارم. حەز ناکەم تۆزقاڵێکیان لە هیچ کوێ هەبێ. حەز دەکەم گشت کەسێ لە ژێر باری فەسادیدا نقەی بێ.

– کەوابێ من بۆت دەشێم گیانەکەم. لە فەسادیی بارکراووم.

– حەزی لێ دەکەی؟. مەبەستم هەر من نییە: مەبەستم ئەوەیە ئەم کارە بکەی؟.

– شێتیم.

بیستنی ئەوەی لە هەموو شتێ زیاتر مەبەست بوو. تەنها ئەوین بۆ بنیادەمێک نا، بەڵکو خودی کارە ئاژەڵییەکە و حەزی بەرەڵایی: ئەو هێزە دەیتوانی حیزب هەڵتەکێنێ. لە سەر گیایەکە، لە ناو گوڵە زەنگوڵەکاندا درێژی کرد. ئەمجارە چ بەرهەڵستێک نەما. بە زوویی هەناسەبڕکەیان نیشتەوە و هەناسەیان ئاسایی بووەوە. بە بێ تاقەتی لێک ترازان. پێ دەچوو هەتاوەکە گەرمتری کردبێ. خەواڵوو بوون. وینستۆن دەستی برد و جلە توورڕدراوەکانی بە کیژەکەدا دا و تا پێی کرا جەستەی پێ داپۆشین. دەمودەست خەویان لێ کەوت. دەوری نیو سەعات نوستن.

لە پێشا وینستۆن وەئاگا هاتەوە. دانیشت و لەو سیما بە وردەخاڵە ڕاما کە هێشتا لە ئامێزی خەونێکی هێمندا، لە سەر لەپێکی ئارامی گرتبوو. تەنها دەمی نەدەکرا بڵێی جوان بوو. کە بە وردی سەرنجت دەدا، یەک دوو لۆچ لە دەوری چاوی بوون. قژە ڕەشە کورتەکەی تا بڵێی پڕ و خاو بوو. وەبیری هاتەوە کە تا ئەو دەمەش نازناوی نازانێ و نازانێ لە کوێ دەژێ.

ئەو جەستە توندوتۆڵ و بەهێزە کە لە ئامێزی خەوندا بوو، هەستی دڵسۆزی و لێپرسراوی تێدا دروست کرد و ئەو سۆزە بێ غەلوغەشەی تێدا زیندوو بووەوە کە لە ژێر داربادەمەکەدا، لە گەڵ دەنگی پەلەوەرەکەدا هەستی پێ کردبوو. جلەکانی لەسەر لابردن و کەوتە تەماشای زگی سپی و لووسی. لە دڵی خۆیدا گوتی: ڕۆژانی زوو، پیاو بەدەنی ژنی دەدی و ئارەزووی تێ دەچوو و بڕایەوە. بەڵام ئێستا، ئارەزووی پاک و ئەوینی پاک نابێ بێن. هەستی خاوێن لە ئارادا نییە چونکە هەموو شتێ تێکەڵاوی ترس و ڕقە. لە ئامێزگرتنی یەکتر خەباتە و ڕەحەتبوون سەرکەوتنە... جۆرێکە لە بەربەرەکانیکردنی حیزب. خەباتی سیاسییە.



### ۳

جولیا گوتی: "جارێکی تریش دەتوانین بێینەوە ئێرە. قەیدی نییە ئەگەر دوو جاران کەڵک لە یەک پەناگە وەرگرین. بەڵام تا یەک دوو مانگی دی نا."

جولیا هەر کە وەئاگا هاتەوە، ڕەفتاری گۆڕا. شێوەی بەرپرسیی و سڵکردنەوەی بە خۆی دا. جلەکانی لە بەرکردنەوە و پشتێنە سوورەکەی بەست و بۆ گەڕانەوە کەوتە خۆئامادەکردن. ئەو ڕەفتارانەی پێوە ئاسایی بوون. سیمای لەبار و ئاسایی بەخۆی دا کە ئەوە لە وینستۆندا نەبوو. پێ دەچوو لە ڕێی مەشقەوە، شارەزای دەوروبەری لەندەن بووبێ. ئەو ڕێیەی کە بە وینستۆنی پێشان دا و دەچووەوە وێستگەکە، لەو ڕێیەوە دوور بوو کە پێیدا هاتبوو. دەتگوت مەبەستی گرینگ و سەرەکی پێ ڕادەگەیەنێ کە گوتی: "هەرگیز بەو ڕێیەدا مەڕۆ کە پێیدا هاتی". دەبوو ئەو لە پێشەوە بڕوا و دوای نیو سەعات ئەوسا وینستۆن بەرێ کەوێ.

جولیا، جێیەکی دەسنیشان کرد کە پاش چوار ڕۆژی دی، دوای تەواوبوونی کار، یەکتری لێ ببینن. کۆڵانی گەڕەکێکی هەژارنشین بوو و بازاڕەکەی جمەی دەهات. پلانیان دانا کە لە لای وردەفرۆشە دەسگێڕەکان، وا پێشان بدا کە تاقیبی قەیتانی پێڵاو یا دەزوو دەکا. ئەگەر لە بارودۆخەکە دڵنیا بوو لێی دەچێتە پێشێ ئەگەر نا، وەک نائاشنا بەلای یەکدا ڕەت دەبن. ئەگەر بەختیش یار بێ، ئەوا ماوەی چارەکێ دەدوێن و پلان بۆ ژوانی دی دادەنێن.

کە ئەوانەی بۆ وینستۆن ڕوون کردەوە ئەوسا گوتی:" دەبێ بڕۆم. سەعات نۆزدە و نیو دەبێ لەوێ بم. دوو سەعاتی تەواو بۆ لاوانی دژی سێکس بە خەرج دەم. دەبێ بەیاننامە بڵاو بکەمەوە و ئیدی شتی لەو بابەتانە. عەزیزم، پیسایی لێ دەبارێ!. دەکرێ دەستێکم پێدا بهێنی؟. پرووپووشم بە قژەوە نییە؟. دڵنیاییت؟. دەی جا خواحافیز ئەوینەکەم".

خۆی لە ئامێزی نا و ماچێکی توندی کرد. ملی ڕێی گرت و بە بێ چپە، لە چاوتروکانێکدا ون بوو. هێشتا ناونیشان و نازناوی لێ وەرنەگرتبوو. بەڵام چ جیاوازی نەبوو چونکە نەدەبوو لە ماڵەوەی ببینێ یا نامەی بۆ بنێرێ.

وەک ڕووی دا، بۆ دارستانەکە نەهاتنەوە. لە مانگی مایسدا تاکە یەک دەرفەتی تریان بۆ ڕەخسا تا پێکەوە جووت بن. ئەوەش لە پەناگەیەک بوو کە جولیا پێی دەزانی. بورجی

کڵێسایەکی وێرانەی چۆڵاییەکی قەراغ شار بوو کە بەر لە سیی ساڵ بۆمبای ئەتۆمی بەر کەوتبوو. کە دەیگەیشتێتێ پەنا بوو نە گاڵتە. بەڵام ڕێی بەرەو ئەوێ جێی مەترسیی بوو. جگە لەوە، هەر لە سەر شەقامەکان یەکیان دەدی و هێندێ ئێواران، هەر جارە و لە جێیەک ماوەی نیو سەعات پێکەوە دەبون. لە سەر شەقامەکان دەدوان بەڵام دەبوو مەودایان لە نێواندا بێ و سەیری یەکتریش نەکەن ولە ناو قەرەباڵغیدا بن. باسەکانیان بچڕبچڕبوون و بە چرای دەریا دەچوو کە بەردەوام پێ دەبێ و دەکوژێتەوە. لە ناوەڕاستی قسەاندا و لە پڕێکدا، بە دیتنی بەدلەی شینی حیزبی یا دەرکەوتنی تەلەسکرین بێدەنگ دەبوون. دوای چەند دەقیقەیەک، ڕستە پچڕاوەکانیان تەواو دەکرد. لە کاتی دابڕاندا ڕستەی براویان بۆ دیداری داهاتوویان هەڵدەگرت و ئەوسا تەواویان دەکرد. دەتگوت جولیا ئولفەتی لەگەڵ ئەو جۆرە ئاخاوتنەدا - کە ناوی ئاخاوتنی (تەقسیت)یان لێ نابوو - گرتووە. لە نەبزواندنی لێودا، لەکاتی قسەکردندا، شارەزا بوو. لە مەودای یەک مانگی تەواودا، یەک شەو توانییان لە جێیەکی وادا یەک ببینن کە چەند ماچێکی یەک بکەن. بە کۆڵانێکی بێدەنگ و لاچەپدا ڕەت دەبوون (ئەگەر لە شەقامە گشتییەکاندا نەبوونایە جولیا قسەی نەدەکرد). گرمەیەک هات و زەوی لەگەڵدا هەژی و دنیا تاریک داهات. وینستۆن، لە سەر لا کەوتبو و حەپەسابوو. دیار بوو بۆمبایەک لەو نزیکانە کەوتبۆوە. کتوپڕ ئاگاداری سیمای جولیا بووەوە کە چەند سانتیمەترێ، بەلای سەری خۆیەوە بوو. ڕەنگی مردووی لێ نیشتبوو و وەک گەچ سپی هەڵگەڕابوو. تەنانەت لێویشی سپی بوون. مردبوو؟!. لە ئامێزی گرت و کەوتە ماچبارانی ڕووی زیندوو و گەرمی. بەڵام شتێکی وەک پۆدرە دەکەوتە نێوان لێویانەوە. هەردووکیان تەپوتۆزی خانووی ڕووخاویان لێ نیشتبوو.

ئێوارەی وا دەبوو دەچوونە ژوان، بەڵام بێ ئەوەی چ هێما بۆ یەک بکەن، بە لای یەکدا ڕەت دەبوون، چونکە یا مەفرەزەی گەڕۆکی پۆلیسیان تووش دەهات یا هێلیکۆپتەر بە حەواوە ئێشکی دەگرت. خۆ ترسیش کەمتر بوایە، دەرفەتی دیداریان هەر کەم بوو. وینستۆن، حەفتەی شێست سەعات کاری دەکرد و جولیاش پتر. ڕۆژانی پشوو، بە گوێرەی ڕۆژەکانی دی کەمتریان فشار بۆ دەهات و بە عادەت لەو ڕۆژانەدا یەکیان دەدی. کەم جار جولیا، بە ئێواران دەستی بەتاڵ دەبوو. زۆرترین کاتی خۆی، لە ئاخاوتنی دژە سێکس و خۆپێشاندان و بڵاوکردنەوەی بەیان و ئامادەکردنی لافیتەی حەفتەی ڕق و کۆکردنەوەی پوڵ بۆ پاشەکەوت و چالاکیی لەو بابەتانە بە سەر دەبرد. ئەگەر یاسای بچووکت بپاراستبا دەکرا یاسای گەورە پێشێل بکەی. جولیا کاری کردە سەر وینستۆن و وای لێ کرد کە لە



نیو دەوامی کاری چەکسازیدا بەشدار بێ کە بۆ ئەندامە چالاکەکانی حیزب بوو و بەوە، ئێوارەیەکی بە فیڕۆ دەچوو. بەو پێیە، حەفتەی ئێوارەیەک، وینستۆن چوار سەعاتی بە کاری بێزارکەر بە خەرج دەداو پارچە میتالی پێکەوە دەبەستن کە پێ دەچوو تەرەقەی ڕاکێت بن. ئەوەشی لە کارگەی ساردوسڕ و مەیلەو تاریکدا دەکرد کە دەنگی چەکوش و زیڕەی مۆسیقای تەلەسکرین پیاویان کاس دەکرد.

کە لە بورجی کلێسەکەدا یەکیان دەدی، بۆشایی نێوان ڕستەکانی پێشایان پڕ دەکردنەوە. دوای نیوەڕۆ خۆرەتاو بوو. ژووری چوارگۆشەکەی زەنگەکان گەرم بوو و بۆنی ڕیخنەی کۆتری لێ دەهات. لە سەر پووش و پەڵاش و خۆڵی ناو ژوورەکە، چەندین سەعات دانیشتن و قسەیان کرد. جاروبارێ یەکێکیان بۆ دڵنیایی، لە درزێکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد.

جولیا تەمەنی بیست وشەش ساڵ بوو. لەگەڵ سیی کیژی تردا، پێکەوە لە ماڵێکدا دەژیان. "هەموو دەمێ لە ناو بۆگەنی ژناندا!. چەندم ڕق لە ژنە!" جولیا بەو ڕستەیە باسەکەی گۆڕی. وەک ڕێی تێ دەچوو، لە سەر ئامێری (نووسین)[١٧]ی بەشی هەڵبەست کاری دەکرد و حەزی لە کارەکەی خۆی بوو. سەرپەرشتی ئامێرێکی بەهێز و لە هەمان کاتدا سەیروسەمەرەی دەکرد. هێندە لە کارەکەیدا لێهاتوو نەبوو بەڵام حەزی لە کاری دەست بوو و بەوەش هەستی دەکرد وا لە ماڵێیە. دەیتوانی باسی سەرلەبەری شێوەی بەڕێوەبردن و ئەنجامدانی (هەڵبەستن) بکا، هەر لە کۆمیتەی پلاندارشتنەوە بگرە کە بەڕێوەبەرایەتی گشتی بوو، تا دەگاتە دوا تیفتیفەی لیژنەی داڕشتنەوە. بەڵام دوابەرهەم چ سەرنجی ڕانەدەکێشا. دەیگوت کە زۆر گوێ بە خوێندنەوە نادا. کتێب، وەک قەیتانی قۆندەرە و موورەبا کاڵایەک بوو و دەبوو وەبەرهەم بێ.

چ یادگارییەکی بەر لە سەرەتای شێستەکانی بیر نەمابوو. تاکە کەسێکیش کە ئاگاداری ئەو سەردەمانە بوو و لێوەی نزیک بوو، باپیری بوو کە لە تەمەنی هەشت ساڵی ئەمدا ون بوو. لە قوتابخانەدا، ببوو بە سەرتیپی شەقێن و دوو ساڵ لە سەر یەک، خەڵاتی یەکەمی وەرزشی وەرگرتبوو. لە ئەنجومەنی خەفێتیدا سەردەستە بوو و لە یەکێتی لاوانیشدا بەر لەوەی بچێتە ئەنجومەنی دژی سێکسەوە، سکرتێری بەشەکەی خۆیان بو. ناوبانگی بلیمەتیی دەرکردبوو. تەنانەت خرایە بەشی(پۆرنووسێک)یش کە بەشێکی دەزگای

١٧ - تألیف.

هەڵبەستن بوو و بەرهەمی ساکار و ئاشکرای بۆ کرێکاران بڵاو دەکردەوە. فەرمانبەرەکان، نازناوی بەشی پیسایی خانەیان لێ نابوو. ساڵێکی تەواو لەوێ مابۆوە و لە وەبەرهەمهێنانی کتێبۆکەی ناو پاکەتی داخراوی وەک (بە قووندا کێشان) یا (شەوێک لە قوتابخانەی کچاندا) بەشدار ببوو کە بە دزییەوە بە ناو کرێکاراندا بڵاو دەکرانەوە گوایە قاچاخن.

– وینستۆن پرسی: – ئەو کتێبانە چۆنن؟.

– ئێح!. قسەی قۆڕن. تا بڵێی بێزارکەرن. تەنها شەش بابەتیان تێدان کە هەموو جارێ کەمێ دەگۆڕێن. هەرگیز لە لیژنەی نووسیندا نەبووم و ئەدیب نیم و بە کەڵکی ئەدەبییش نایەم عەزیزم.

وینستۆن بیری لە بەشی(پۆڕنووسێک)کردەوە کە هەموو کچ بوون لێپرسراوەکەیان نەبێ. نهێنی ئەوەش لەوەدا بوو کە پیاو کەمتر غەریزەی خۆیان پێ زەوت دەکرێ و لە ژنان زیاتر مەترسی خزانیان بەرەو فەسادیی لێ دەکرێ.

جولیا لە سەر قسەی خۆی ڕۆیشت :" لەوێ، تەنانەت ژنی لێهاتووشیان پێ چاک نییە. هەمیشە وا بیر دەکەنەوە کە ژن پاکژن. بە هەرحاڵ، من پاکژ نیم."

یەکەم کاری سێکسیی لە شانزە ساڵیدا، لەگەڵ ئەندامێکی شەست ساڵەی حیزبدا کردبوو کە دوایی لە ترسی گرتن خۆی کوشت. جولیا گوتی: "چ کارێکی چاکی کرد. وای نەکردبا ناوی منیشیان لە گەرووی دەردەهێنا." دوای ئەوە، لەگەڵ گەلێ کەسی تردا ئەو کارەی کردبوو. ژیانی بە لاوە سادە بوو. دەیویست ژیانێکی خۆش بگوزەرێنێ ؛ ئەوانیش، واتە (حیزب) دەیانویست خۆشی لە خەڵک زەوت کەن. تا پێت دەکرا ئەو یاسایانەت دەشکاند کە هەبوون. بە لای جولیاوە سروشتی بوو کە ئەوان هەوڵی نەهێشتنی خۆشیی تۆ بدەن و تۆش هەموو هەڵپەیەک بۆ وەدەستهێنانی خۆشی بکەی. قینی لە حیزب بوو و ئەو ڕاستییەی بە ڕەقترین شێوە دەردەبڕی بەڵام ڕەخنەی ئاشکرای ئاراستە نەدەکرد. هەر شتێکی حیزب پەیوەندی بە ژیانی خۆیەوە نەبوایە ئەمیش پەیوەندی پێوە نەبوو. وینستۆن هەستی کرد جولیا گوتەی نوێی حیزب نەبێ هیچی وای لێ نازانێ. ناوی (ئەنجومەنی برایەتی) نەبیستبوو و باوەڕیشی نەدەکرد شتی وا، هەر لە بنیی هەبێ. هەموو یاخیگەرییەک دژی حیزب، بە لایەوە بێ عەقڵی بوو و ئەنجامیشی تێکشکان بوو. یاساشکاندن و نەمردن پێکەوە نەدەگونجان. سەیر بوو، وەچەی نوێ، ئەو وەچەیەی کە لە زەمانی شۆڕشدا ڕسکا بوو، هیچیان نەدەزانی ئەوە نەبێ کە حیزب وەک ئاسمان



دیاردەیەکی نەگۆڕە. کەسی لێ ڕاست نەدەبۆوە، بەڵکو وەک کەروێشکیان دەکرد کە خۆی لە بەلای سەگ لا دەدا.

باسی هاوسەرێتی خۆیان نەدەکرد. هاوسەرێتییان لەوە نەگونجاوتر بوو بشێ و بیری لێ بکرێتەوە. ئەگەر وینستۆن کاترینیشی لە مل بوایەتەوە، هیچ کۆمیتەیەک قایل نەدەبوو ئەم بخوازێ. بێ هومێدی و زیندەخەون بوو.

– ژنەکەت چۆن بوو؟.

– ژنەکەم؟. جا بڵێم چۆن بوو؟. ناوەڕۆکی وشەی (بیرچاک)ی گوتەی نوێت بیستووە؟. واتە: کەسێ نەتوانێ بیری خراپ بە هۆشی خۆیدا بهێنێ. وا بوو.

– نەء، ئەو وشەیەم نەبیستووە بەڵام دەزانم ئەو بابەتە کەسانە چ ماڵێکن.

وینستۆن کەوتە باسکردنی ژنەکەی. بەڵام دیار بوو جولیا ئاگای لە لایەنە سەرەکییەکانی هاوسەرێتییان بوو. جۆرێ دەدوا وەک ئەوەی ئاگای لە ژیانیان بووبێ یا هەر نەبێ هەستی پێ کردبێ. شێوەی باسەکەی سڵەمینەوەی لە وینستۆندا دروست نەکرد. بە هەرحاڵ دەمێ بوو یادی کاترین ئازاری نەدەدا و هەر وەک یادگارێکی ناخۆشی لێ هاتبوو: "لە بەر یەک هۆ نەبوایە لەگەڵیدا ڕامدەکێشا". باسی ئەو ئاهەنگە ساردوسڕەی کرد کە کاترین ناچاری کردبوو هەموو ئێوارەیەکی دیاریکراوی حەفتە تێیدا بەشدار بێ: "کاترین لەو ئاهەنگە وەڕس بوو بەڵام هیچ هێزێکیش نەبوو دەستی پێ لێ هەڵگرێ. ناوی نابوو – هەرگیز پێت هەڵنایە چ ناوێکی لێ نابوو."

جۆلیا گوتی: – ئەرکی حیزبایەتی.

– ئەوە چۆنت زانی؟.

– ئازیزم، ئاخر منیش چوومەتە قوتابخانە. باسی سێکس مانگی جارێک بۆ هەموو شانزە ساڵییەک و بزووتنەوەی لاوان هەیە. ساڵەهای ساڵە دەپەسترێتە گوێچکەوە. دڵنیام کە لە گەلێ بواردا کاریگەرێتی خۆی هەیە بەڵام دیارە ناکرێ دڵنییا بیت چونکە بنیادەم دووڕوون.

جولیا، قووڵتر بە باسەکەدا ڕۆچوو. ئەو هەموو شتێکی بە هەوەسی سێکسی خۆیەوە گرێ دەدا. وەستایانە و بە وردیی لەو باسانە دەدوا. بە پێچەوانەی وینستۆنەوە، درکی بە واتای شاراوەی سێکسی ناوەوەی حیزب کردبوو. مەسەلەکە لەوەدا نەبوو کە وزەی جنسی جیهانێکی تایبەتی، لە دەرەوەی جغزی دەسەڵاتی حیزبدا پێک دەهێنێ و دەبێ لەناو

ببرێ. مەسەلەکە لەوەدا بوو کە بێبەشبوون لە سێکس تۆوی هیستیریا دەخاو ئەوەش مەبەستەکە بوو. دەتواندرا ئەو وزەیە بۆ بەرژەوەندیی حیزب ئاراستە بکرێ و بکرێ بە ئارەزووی شەڕ و ڕێبەر پەرستن. جولیا وای ڕوون کردەوە: "لە کاتی جووتبووندا وزە لە دەست دەدەی. جگە لەوەش ئاسوودە و دڵخۆش دەبیت. بەوەش هەموو شتێ پشتگوێ دەخەی. ئەوان قایل نابن خەڵک وابێ. ئەوان دەیانەوێ هەموو دەمێ پڕ بیت لە وزە و بۆ تەقینەوە لە سەر پێ بیت. هەموو ئەم مەشق و هوتاف و ئاڵاڕاوەشاندن و بەزموڕەزمە، لە هێزی کپکراوی جنسییەوە نەبێ لە هیچی ترەوە نییە. کە ناخت ئاسوودە بێ کوا پێی دەوێ بۆ ڕێبەری گەورە و پرۆژەی سێ ساڵە و ئاهەنگی دوو دەقیقە ڕق و قوززەڵقورتەکانی دی بکەویتە هەڵەکەسەما؟.

وینستۆن گوتەکانی جولیای پێ دۆغری بوون. لە نێوان پاکژی و هەڵوێستی سیاسییانەدا پەیوەندی بەهێز و ڕاستەوخۆ هەیە. ترس و ڕق و خۆشباوەڕی شێتانەی ئەندامانی حیزب لە بەربەستکردنی وزەی غەریزەوە نەبێ کە پاشان وەک دینەمۆ بە گەڕ دەخرێ لە کوێوەیە؟. وزەی جنسیی خەڵکی، بۆ حیزب جێی مەترسیی بوو بەڵام بۆ بەرژەوەندی خۆیان وەگەڕیان دەخست و کەڵکیان لێ وەرگرت. کەتنێکی لەو بابەتە بە دایکایەتی و باوکایەتیش کراوە. نە دەکرا خێزان نەهێڵدرێ و لە ڕاستیدا خەڵکیش دەیانویست پەیوەندییان بە نەوەی خۆیانەوە وەک بەرێ بێ. لە لایەکی تریشەوە، منداڵیان بە پێی بەرنامەی دیاریکراو پەروەردە دەکرد و بۆ جاسوسێتی بە سەر داک و بابی خۆیانەوە هانیان دەدان تا لەڕێلادانیان لێ لە قاو بدەن. بە ڕاستی خێزان ببوو بە بەشێکی سەر بە پۆلیسی خەیاڵ. هونەر بوو کە هەموو کەسێ، لە هەموو دەمێکدا بە جاسووسی ورد ورد دەورە درابێ کە شەو و ڕۆژ لەگەڵیاندا بن و چاکیان بناسن.

خەیاڵی وینستۆن گەڕایەوە لای کاترین. ئەگەر گێلێتی لە ڕادەبەدەری کاترین نەبوایە کە بە هۆیەوە ئاگای لە نا هەماهەنگی بیری وینستۆن نەبوو، بێ چەند و چۆن، لە لای پۆلیسی خەیاڵ خەبەری لێ دەدا. کاترینی وەبیر هاتەوە: دوانیوەڕۆیەکی گەرم بوو و نمێ عارەقەی بە هەنیەوە بوو. کەوتە باسی ڕووداوێک کە بەر لە یازدە ساڵ، لە دوانیوەڕۆیەکی گەرمی هاویندا ڕووی دا، یا ڕاستتر، ڕووی نەدا.

سێ و چوار مانگێ بە سەر هاوسەرێتییاندا ڕەت ببوو، لە مەشقی گشتیدا، لە شوێنێکی (کێنت)دا ڕێیان هەڵە کرد. هەروا چەند دەقیقەیەک دوا کەوتن، بەڵام ڕێیەکی هەڵەیان گرتە بەر و لە پڕێکدا خۆیان لە (کان)ێکی گەچدا دیتەوە. چاڵی کانەکە، دە تا



بیست مەتر قووڵ دەبوو و بنەوەی گابەردی گەورەی لێ بوون. کەس نەبوو پرسیاری ڕێیەکەی لێ بکەن. کە کاترین زانی ڕێیان لێ هەڵە بووە شڵەژا. دابڕان لە ڕیزی بە هاتوهاوار، بۆ یەک چرکەش بوایە، هەستی تاوانبارییی لە کاتریندا پێک دەهێنا. دەیویست بە پەلە، بەو ڕێیەدا بگەڕێنەوە کە پێیدا هاتبوون و لە لایەکی دی بە دوایاندا بگەڕێن. لەو ساتەدا، وینستۆن هێندێ گوڵە هێرۆی دیتن کە لە خواریانەوە، لە ناو بەردەکاندا ڕوابوون. بنچکەکان، گوڵی سووری کاڵ و سووری هەنارییان گرتبوون. وینستۆن پێی وا نەبوو شتی وا جوانی دیبێ. کاترینی گاز کرد تا بێتە سەیری.

– کاترین سەیر کە!. سەیری ئەو گوڵانە بکە. چاووت لێیە دوو ڕەنگی جیاوازیان گرتووە؟.

کاترین لە سەر ڕۆیشتن بوو بەڵام بە بێ تاقەتی گەڕایەوە. کەمێ داما تا بزانێ وینستۆن بەرەو کوێ دیادری بۆ دەکا. وینستۆن لە پشتیەوە بوو. توند ناوقەدی گرت تا وریای بێ. لە پڕێکدا هەستی تەنهایی تێدا وروژا. تاک و تەنها بوون و کەسی تری لێ نەبوو و پەلەوەری خواسایی بە حەواوە نەبوو. جێی وا، ترسی مایکرۆفۆنیشی زۆر کەم بوو و ئەگەر لێشی بووبێ هەر دەنگی وەردەگرت. گەرمترین و خەوهاوەرترین کاتی دوای نیوەڕۆ بوو. تیشکی خۆریان بە سەردا دادەباری و عارەقە، هەنیەی وینستۆنی ختووکە دەدا. حەزی کرد...

جولیا گوتی: – بۆ پاڵێکت پێوە نەنا؟. من بوومایە وام دەکرد.

– بەڵێ گیانەکەم وات دەکرد. منیش وەک ئێستا بوومایە وام دەکرد. لەوانەشە... نازانم!.

– پەشیمان نیت؟.

– با. زۆر پەشیمانم.

لە سەر عەردە خۆڵاویەکە، بە لای یەکەوە دانیشتبوون. جولیای زیاتر بە لای خۆیدا ڕاکێشا و سەری کەوتە سەر شانی. بۆنی قژی، بە سەر بۆنی ڕیخنەی کۆتردا زاڵ بوو. بیری لە گەنجێتی جولیا کردەوە کە هێشتا دڵی بە ژیان خۆشە و نازانێ کوشتنی خەڵکی بێ دەسەڵات چ دەردێ دەرمان ناکا. گوتی:

– لە ڕاستیدا، هیچی نەدەگۆڕی.

– ئەدی بۆ پەشیمانیت؟.

– هەر لە بەر ئەوەی (کردە)م لە (نەکردە) پێ چاکترە. ناتوانین بەرەندەی ئەم گەمەیە بین کە دەیکەین. هەر هێندەیە کە هێندێ بەخت لە هێندێ بەختی دی یارترە.

هەستی کرد شانی جولیا بە نارازییەوە بەرز بووەوە. هەر باسێکی لەو بابەتانە بهاتبایەتە پێش، ئەو دژی دەوێستایەوە. باوەڕی وا نەبوو کە بە پێی یاسای سروشت، تاکە کەس دۆڕاو بێ. ئاگای لە چارەنووسی خۆی بوو و دەیزانی درەنگ یا زوو دەکەوێتە بەر دەستی پۆلیسی خەیاڵ و دەکوژرێ. بەڵام قوژبنێکی هۆشی ئەو هیوایەشی تێدا بوو کە دەتوانێ دنیایەکی نهێنی بۆ خۆی پێک بێنێ و بە کەیفی خۆی تێیدا بژی. پێی وابوو کە مرۆ پێویستی تەنها بە بەخت و فێڵ و نەترسان هەیە. باوەڕی نەدەکرد کە شتێ بە ناوی بەختەوەرییەوە بوونی نەبێ و سەرکەوتنی تاکە کەسیی لە داهاتووی دووردا، زەمانێکی دوور و درێژی دوای مەرگ نەبێ. لەو کاتەوە کە جەنگ بەرانبەر حیزب ڕادەگەیەنیت، دەبێ خۆت بە مردوو دابنێیت.

– ئێمە مردووین.

جولیا بە توندی بەرپەرچی دایەوە: – هێشتا نەمردووین.

– بە جەستە نا، شەش مانگی دی، یەک ساڵی دی – برۆ پێنج ساڵی دی. لە مردن دەترسێم. تۆ گەنجیت و ڕەنگە کەمتر لێی بترسیت. تا بتوانین مردنمان پێ دوا دەخرێ. بەڵام زۆر فەرق ناکا. مادام بنیادەم بە بنیادەمی بمێنێ، ژیان و مردن هەر یەکێکە.

– هێیێی هێیێی! قسەی توڕەهات!. لەگەڵ مندا دەنوی یا هەیکەلە ئێسقان؟ حەز ناکەیت هەست بکەی کە ئەمە منم، ئەمە دەستی منە، ئەمە پێمە، من هەم، جەستەم هەیە و زیندووم؟. حەز لەمە ناکەی؟.

هەڵسوڕایەوە و خۆی بە وینستۆنەوە نووساند. دەتگوت دەیەوێ بەشێکی لاوێتێ خۆی بڕژێنێتە ناو وینستۆنەوە. گوتی: – ئەی چۆن؟. حەزی لێ دەکەم.

– دەی سا پێی ناوێ باسی مەرگ بکەی. ئێستا گوێ بگرە ئازیزم. دەبێ پلانی دیداری داهاتوو دانێین. دەتوانین بچینەوە ناو درختەکانی گۆرین. پشوویەکی چاکمان پێ داون. بەڵام ئەم جارە دەبێ لە ڕێیەکی ترەوە بچیت. نەخشەی چوونتم داناوە. سواری شەمەنەفەر دەبیت... ڕاوێستە نەخشەکەت بۆ دانێم.

کۆمەڵە خۆڵێکی کردە تەپۆلکێکی چوارگۆشە و بە چیلکەیەکی هێلانە کۆترەکان، کەوتە خەتکێشان.



٤

وینستۆن چاوێکی بە ژوورە شڕە گچکەکەی قاتی سەرەوەی دوکانی مستەر چارینگتۆندا گێڕا. لە لای پەنجەرەکەوە تەختە خەوێکی قەبە داندرابوو و پەتووی شڕ و سەرینی نزم و بێ بەرگی لە سەر بوون. سەعاتە مۆدێل کۆنەکە، بە دوانزە ژمارەکەیەوە، هەر چکەچکی بوو. لە گۆشەیەکی نیوە تاریکی ژوورەکە، ئەو پارچە بلوورەی کە زووتر کڕیبووی، لە سەر مێزێک دەدرەوشایەوە. لێواری زۆپاکە قودیلە قوپاوێک وقابلەمەیەک و دوو کووپی لە سەر بوون کە چارینگتۆن پەیدای کردبوون. وینستۆن تەباخەکەی پێ کرد و قابلەمە ئاوێکی بۆ گەرمکردن لە سەر دانا. پاکەتێ قاوەی سەرکەوتن و هێندێ قەندی لەگەڵ خۆیدا هێنابوون. میلی سەعاتەکە حەوت و بیستی پێشان دەدا کە لە ڕاستیدا نۆزدە و بیست دەقیقە بوو. دەبوو جولیاش سەعات نۆزدە و نیو بێت.

جار و بارێ لە دڵی خۆیدا دەیگوت: کەرایەتییە کەرایەتی، کەرایەتییەکی ئانقەست و بێ مزەی لە بابەتی خۆکوشتن. لە نێو هەموو ئەو تاوانانەدا کە ئەندامی حیزب ئەنجامیان دەدا، چاوپۆشی ئا ئەلەمەیان ناکرێ. ئەم بیرکردنەوەیە لە سەرەتادا وەک ڕۆشنایی پارچە شووشەکە وا بوو کە دەیدایە سەر مێزەکە. ڕێک چۆنی بیر لێ کردەوە وا دەرچوو. مستەر چارینگتۆن هیچ بەرهەڵست نەبوو ئەو ژوورەی بە کرێ بداتێ. لە ڕواڵەتدا خۆشحاڵیش دیار بوو کە بە هۆی ئەو ژوورەوە چەند دۆلارێکی چنگ دەکەوت. کە زانیشی وینستۆن ئەو ژوورەی بۆ ژوان دەوێ، نە سەرسام بوو نە خەمبار، بەڵکو لە مۆلەقی ڕوانی و دەستی کرد بە قسەی گشتی کە بەهۆی قسە نەرمەکانیەوە خۆشی نیوە بیندراو دەهاتە بەر چاو. گوتی خەڵوەت شتێکی بەنرخە. هەمووان جێیەکیان پێ دەوێ کە جاروبار بە تەنێ لێی بن. ئەگەر کەسێکیش پێی زانی، ئەوا ڕەوشتی لێی دەخوازێ دەمی خۆی بگرێ. کاتێکیش ڕۆیی وەک ئەوەیە لە سەر پەڕەی ڕۆژگار بسڕدرێتەوە. تەنانەت کە گوتیشی خانووەکە دوو دەرگای هەن و یەکێکیان بەرەو حەسارێکی چۆڵ دەکرێتەوە و دەچێتەوە سەر کۆڵانێکی باریک، دەتگوت لە غەیبەوە قسان دەکا.

یەکێ لە خوار پەنجەرەکەوە گۆرانی دەچڕی. وینستۆن لە پەردە تەنکەکەوە ڕوانی. هەتاوی حوزەیران هێشتا بە عاسمانەوە بوو. لە حەسارە خۆرەتاوەکەی خوارەوەدا، ژنێکی لە تارمایی چوو و وەک ستوونی کەشتی (نۆرمان) پتەو و بازوو خۆرگەستە، پاشۆلێکی بە پشتی خۆیەوە کردبوو و بە هەنگاوی مەحکەم، بە نێوان تەشتەکولێک و تەنافێکدا

دەهات و دەچوو و هێندێ پارچەی سپی و چوارگۆشەی – کە وینستۆن بە پەڕۆی منداڵی زانین – هەڵدەخست. هەر کاتێ قولابی جلگری لە زار نەبوایە، بە دەنگێکی باریک و بەهێز، گۆرانی دەچڕی:

تەنها هەر خەیاڵێکی بێ سەروبەر بوو
وەک ڕۆژێکی مانگی نیسان بەسەر چوو
بەڵام نیگا و وشە و خەون و خەیاڵیان وروژاندم و
دڵیان ڕفاندم و چوون

چەند حەفتەیەک بوو ئەو ئاوازە لەندەنی گرتبۆوە. یەکێ بوو لەو ئاوازە لە ژماردن نەهاتوە لێکچووانەی کە بەشی ئاواز بۆ سوودی کرێکاران بڵاوی دەکردنەوە. وشەی ئەو گۆرانیانە، بە بێ هیچ دەستێوەردانێکی بنیادەم، دەزگای (ئاوازساز) وەبەرهەمی دەهێنان. بەڵام ئەو ژنە، هێند بە سۆزەوە دەیچڕی، ئاوازێکی خۆشی لێ پێک هێنابوو. وینستۆن گوێی لە گۆرانیەکە و دەنگی پێی دەبوو کە بە سەر حەوشە بەردڕێژەکەدا دەهات. دەنگی منداڵانی کۆڵان و ئامێری هاموشۆی دوور دەهاتن کەچی ژوورەکە، چونکە تەلەسکرینی لێ نەبوو، کپ بوو.

دیسان لە بەر خۆیەوە گوتی:"کەرایەتی، کەرایەتی، کەرایەتی!". لە ماوەی چەند حەفتەیەکدا نایەن و دەسگیری ناکەن؟. عەقڵ نایبڕێ!. لەگەڵ ئەوەشدا، ئارەزووی پەناگەیەکی تایبەتی بۆ هەردووکیان، ختووکەی دەدا. ماوەیەک دوای ژوانی ناو کڵێساکە، دیداریان مەحاڵ بوو. ماوەی کار، پێش حەفتەی ڕق بە جۆرێکی پشتشکێن زیادی کردبوو. بۆ هەفتەی ڕق هێشتا مانگێکی مابوو بەڵام خۆ ئامادەکردنی مەزن و پەرەسەندوو، ئەستۆی هەمووانی گرتەوە.

ئاخرێکەی توانییان، پاش نیوەڕۆیەک دەرفەتێکیان چنگ کەوێ – بڕیاریان دا بچنە ناو درەختەکانی گۆڕین. بەڵام ئێوارەی پێش ژوانەکەیان، بۆ ماوەیەکی کەم، لە سەر شەقامەکان یەکیان دی. بە ناو خەڵکەکەدا بەرەو ڕووی یەک دەهاتن و وینستۆن وەک جاران، چاوی خۆی لێ دەدزییەوە. لە گەڵ ئەوەشدا زانی جولیا ڕەنگی پەڕیوە. کە جولیا دەرفەتی ئاخاوتنی دی، بە بڵمەبڵم گوتی:

– مەسەلەکە بڕایەوە، سبەی نایەم.

– چیی؟!.



– ئۆهووو!. لە بەر هەمان هۆی ئاسایی. ئەمجارە زوتر دەستی پێ کردووە.

ماوەی چاوتروکانێک، وینستۆن هەرەسی هێنا. لە ماوەی ئەو مانگەدا کە ئاشنایەتییان پەیدا کردبوو، ئارەزووەکانی وینستۆن گۆڕابوون. لە سەرەتاوە، ئارەزووی جووتبوون لە نێوانیاندا بەهێز نەبوو. بەڵام لە دووەم جار بەدواوە جۆرێکی دی بوو. بۆنی قژی جولیا، تامی دەمی، هەستی پێستی، دەتگوت لە ناو ناخی وینستۆن و هەوای دەورووبەردان. مەسەلەکەی لە لا ببوو بە پێداویستی جەستە، و هەر ئەوە نەبوو حەزی لێ بکا و تەواو بەڵکو بە مافێکی خۆی دەزانی. کاتێ جولیا پێی ڕاگەیاند کە نایات، هەستی بە فریودان کرد. بەڵام شەپۆلی خەڵکەکە لێکی نزیک خستنەوە و پێکیدا دان، و ڕێکەوت دەستی بە یەکدا دان. جولیا، لەو دەرفەتەدا بە نووکی پەنجەکانی، دەستی وینستۆنی گوشی. ئەو دەستگوشینە هەر بایی ئەوە بوو سۆزێکی پێ دەربڕێ. وینستۆن پێی وابوو کاتێ پیاو لەگەڵ ژنێکدا دەژی، ئەو بابەتە ڕەفتارانە، ڕۆژانە و سروشتیی دەبن. ئەو دەسبازییە، خۆشییەکی قووڵی وای پێ گەیاند کە قەت پێشتر هەستی پێ نەکردبوو. لە دڵی خۆیدا خۆزگەی دەخواست کە هاوسەری دە ساڵە بوونایە: خۆزگەی دەخواست کە وەک ئەو دەمە، بەڵام بێ ترس و لەرز، و بە ئاشکرا پێکەوە دەگەڕان و داخاوتن و پێداویستی ماڵەوەیان دەکڕی. لە هەمووی گرینگتر، خۆزگەی بۆ جێیەک دەخواست کە پێکەوە لێیی بن و هەر کاتێ لەوێ بە تەنێ بن، بە دەرفەتی نەزانن تا پێکەوە جووت بن. لە ڕاستیدا هەر ئەو دەمە نەبوو کە بیری لەوە کردەوە ژوورەکەی مستەر چارینگتۆن بە کرێ بگرێ بەڵکو ڕۆژی دوایی بوو. جولیا، بە ئامادەبوونێکی چاوەڕواننەکراوەوە، بەو پێشنیارە ڕازی بوو. هەردووکیان دەیانزانی کە کارێکی شێتانەیە. دەتگوت بە ئانقەست دەیانەوێ لە دەمی گۆڕ نزیک بکەونەوە. لە سەر لێواری قەرەوێڵەکە دانیشتبوو و بیری لە ژێرخانی وەزارەتی ئەوین دەکردەوە. جێیی سەرسوڕمان بوو کە ئەو ترسە بەو شێوەیە خۆی بە دەریای نائاگایی بنیادەمدا دەکرد. ئەو جێیە لە کونجێکی ئایندەدا خۆی مەڵاس دابوو و وەک چۆن دوای نەوەد و نۆ، سەد دەهات ئاوهاش ئەو جێیە بەر لە مردن دەهات. ڕێگەی خۆ لێ لادانی نەبوو بەڵام دەکرا دوابخرێ. لەگەڵ ئەوەشدا، پیاو بە ئاگاوە یا بێ ئاگایانە هەوڵی کورتکردنەوەی ئەو مەودایەی دەدا. دەنگی هەنگاوی پەلە، بە سەر قالدرمەکاندا هات. جولیا خۆی بە ژووریدا کرد. هەمان جانتای قاوەیی زبری وردەواڵەی بە دەستەوە بوو کە جار و بارێ لە وەزارەت پێیی دەدی. وینستۆن بەرەو ڕووی چوو تا لە ئامێزی بگرێ بەڵام ئەو بە پەلە خۆی وەلا نا و گوتی: "کەمێ ئۆقرەت بێ. ڕاوێستە بزانە چیم هێناوە. تۆ،

(قاوەی سەرکەوتن)ی پیست لەگەڵ خۆتدا هێناوە؟.زانیم. فرەی دە پێوستمان پێی نییە. تەماشای ئەمە بکە!."

یەکەم پاکەتی دایە دەستی، ڕەفتاری سەیر و لە هەمان کاتدا ئاشنای هەبوو. شتێکی قورسی تێدا بوو کە بە لم دەچوو و پەنجەی پێدا نابا چاڵ دەبوو. وینستۆن گوتی: - ئەمە شەکر نییە؟.

- شەکری ڕاستەقینە نەک ساکەرین[١٨]. ئەمەش نان - نانی سپی نەک ئەو هەویرە دوابڕاوەی کە دەیخۆین - ئەمە قۆدییە مورەبایەک و ئەمەش قۆدوە شیرێک. بەڵام تەماشا!. ناچار بووم باشی بپێچمەوە...

پێی نەدەویست هۆی پێچانەوەی بڵێ. تازە بۆنەکەی بڵاو ببۆوە. بۆنێکی تیژ و توند کە دەتگوت لە سەردەمی منداڵیی وینستۆنەوە سەر هەڵدەدا یا بەر لە داخستنەوەی دەرگا بە کۆریدۆرەکەدا پەرت دەبێ، یا بە شێوەیەکی سەیر بە شەقامە جەنجاڵەکاندا بڵاو دەبێتەوە و لە پڕێکیشدا نامێنێ.

وینستۆن بە دوودڵییەوە گوتی: - قاوەیە، قاوەی ڕاستەقینە.

- قاوەی ناوەندیی حیزبە. کیلۆیەکی تەواوم هێناوە.

- ئەو هەمووەت چۆن چنگ کەوت؟.

- هەموو شتەکان هی ناوەندیی حیزبن. شتێ نییە ئەو بەرازانە نەیانبێ، هیچ شتێ. دیارە خزمەکار و دەرگاوان و خەڵکی لەو بابەتانە و... تەماشا!. پاکەتە چایەکی بچووکیشم پێیە.

وینستۆن چوارمشقی بە لایەوە دانیشتبوو. قوژبنێکی پاکەتەکەی دڕی.

- ئەمە چای ڕاستییە نەک گەڵا توو.

جولیا لە سەرخۆ گوتی: - بەینێکە چای زۆر بووە. هندستان یا شوێنێکی دی گیراوە. بەڵام ئازیزم، ئێستا دەمەوێ سێ دەقیقە پشتم تێ بکەی. بڕۆرە ئەوسەری قەرەوێڵەکە و دانیشە. زۆر لە پەنجەرەکە نزیک مەبەوە. تا پێت نەڵێم ئاوڕ نەدەیتەوە.

کەوتە سەر چۆک و جانتاکەی کردەوە. هێندێک کلیلی بە پێچ وەدەرنەفیزی دەرهێنان کە لە سەرەوە بوون. چەند پاکەتە کاغەزێکیش لە ژێرەوە بوون.

وینستۆن، بە خەیاڵی پەرتەوە، لە پەردە تەنکەکەوە تەماشای دەرەوەی دەکرد. لە حەوشە

١٨- Sackarin جۆرە شەکرێکە ئەو کەسانە بەکاری دێنن کە نەخۆشی شەکریان هەیە. - وەرگێڕ



بەردرێژەکەدا، ژنە مەچەک سوورخنەکە، هێشتا لە نێوان تەشتەکە و تەنافەکەدا دەهات و دەچوو. جووتێ قولابی جلگری لە زاری دەرهێنان و بە هەستێکی قووڵەوە گۆرانی دەگوت:

دەڵێن زەمانە چارەی دەرد دەکا
و هەموو ئازارێ بیر دەچێتەوە
بەڵام فرمێسک و بزەی ساڵانم
ئێستاش کەتانی دڵ دەڕزێنن

پێ دەچوو هەموو ئاوازەکەی لە بەر بێ. دەنگی، لەگەڵ هەوای خۆشی هاویندا ساف و بە سۆزەوە هەڵدەقولا. پیاو هەستی دەکرد کە ئەگەر ئەو دەمەو ئێوارەیەی حوزەیرانە کۆتایی نەیات و پارچە پەڕۆی شۆراویش تەواو نەبێ، ئەو ژنە، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە، هەزاران ساڵ لەوێ دەمێنێ، پارچە پەڕۆی منداڵ هەڵدەخات و گۆرانی دەچڕێ. وەک ڕاستییەکی زەق بە بیریدا هات کە هەرگیز گوێی لە ئەندامی حیزب نەبووە لە بەر خۆیەوە و لەخۆڕا گۆرانی بچڕێ. کاری وا تا ڕادەی ناهەماهەنگی ڕەنگی دەدایەوە و وەک لەبەر خۆوە ئاخافتن جێی مەترسیی بوو. ڕەنگە خەڵکی، لە دەم سنووری قاتوقڕیشدا شتێکیان هەبێ گۆرانی بۆ بچڕن.

ئاوڕی دایەوە. ماوەی چاوتروکانێک نەیناسییەوە. لە ڕاستیدا چاوەڕوانی ئەوە بوو کە بە ڕووتی بیبینێ. بەڵام گۆڕانێکی سەرسوڕهێنەری لەوە گەورەتربوو. جولیا خۆی ئارایش کردبوو. دەبێ خۆی بە کۆگایەکی گەڕەکی کرێکاراندا کردبێ و یەک جانتا تاخمی ئارایشی بۆ خۆی کڕیبێ. لێوی سوورێکی تێر بوون و گۆناکانی سوراو کرابوون و لووتی پۆدرەی پێوە بوو. تەنانەت سێبەرێکی بۆ دەوری چاویشی کردبوو تا چاوی گەشتر دیار بن. بە شارەزایی ئەو کارەی نەکردبوو. وینستۆنیش، سەری لەو بەزمە دەرنەدەکرد. هەرگیز، نە لە خەیاڵدا ژنی لە ئەندامانی حیزبی بە ئارایشەوە دیبوو نە بە ڕاستی. گۆڕانی سیمای جولیا جێی سەرسوڕمان بوو. بە ڕەنگکردنی جێی گونجاو، نەک هەر جوانتر ببوو بەڵکو ژنانەتریش ببوو. قژە کورتەکەی و بەدلە کوڕانەکەی، جوانیەکەیان بۆ تەواو دەکرد. کە لە ئامێزی گرت، بۆنێکی وەک بۆنی وەنەوشەی بۆ هات. چێشتخانە تاریکەکەی ژێرزەمینەکە و چاڵی دەمی ژنەکەی بیر کەوتنەوە. هەمان ئەو بۆنە بوو کە ئەو ژنە لە خۆی دابوو، بەڵام گوێی نەدایێ. گوتی:

- عەتریش؟.

– بەڵێ ئازیزم، عەتریش. دەزانی دەمەوێ جاری داهاتوو چی بکەم؟. دەمەوێ دەستێ جلی ژنانەی ڕاستی وەگیر بهێنم و لە بری ئەم بەدلە دوابڕاوە بیپۆشم. بیرلەوە دەکەمەوە گۆرەوی ئاوریشم و پێڵاوی پاژنەبلندیشم هەبن. دەمەوێ لەم ژوورەدا ژن بم نەک هاوڕێی حیزبی. جل و بەرگیان لە بەر داڕنین و خۆیان خزاندە ناو پێخەفی سەر قەرەوێڵە گەورەکەوە. ئەوە یەکەم جار بوو وینستۆن، خۆی لە بەر چاوی جولیا ڕووت بکاتەوە. تا ئەو دەمە شەرمی بە جەستەی تەڵخ و لاوازی خۆی و دەمارە زەقەکانی و برینەکەی پێی و پەڵەی بێ ڕەنگی مەچەکی دەهاتەوە. لێفەی لێ نەبوو بەڵام ئەو پەتووەی خۆیان بە سەردا دا، نەرم ولووس بوو، و بە قەوارە وقایمی قەرەوێڵەکە خۆشحاڵ بوون. جولیا گوتی: "پڕە لە ئەسپێ. بەڵام چ قەیدی دەکا؟." ئەو سەردەمە لە ماڵی کرێکاران نەبوایە، تەختەی دوو نەفەریی دەگمەن بوو. وینستۆن بە منداڵی، جاروبارێ لە سەر تەختەی دوو نەفەریی نوستبوو بەڵام جولیا، هێندەی لە بیری بێ، هەرگیز!.

زوو، ماوەیەکی کەم خەویان لێ کەوت. کە وینستۆن وەئاگا هاتەوە، میلی کاتژمێرەکە لە نۆ نزیک دەبووەوە. خۆی نەبزواند چونکە جولیا لە سەر دەم، لە سەر باسکی ئەم نوستبوو. ڕەنگەکانی ڕوخساری جولیا بە سەرینەکە و ڕوخساری وینستۆنەوە لکابوون. سووراوێکی کەمیش، هێشتا ناسکی ئێسکی گۆنای دەردەخست. تیشکی زەردی خۆری دەم کەل، بە تەختەی نوستنەکە دەکەوت و ئەو جێیەی کە ئاوەکەی بە بڵقەبڵق لێ دەکوڵا، ڕووناک کردبوو. لە حەوشەکەی خوارێ، ژنەکە لە گۆرانیچڕین کەوتبوو بەڵام دەنگی منداڵان لە کۆڵانەکەوە دەهات. بە دوودڵییەوە بیری دەکردەوە: دەبێ لە زەمانی سڕدراوەی ڕابردوودا ئاشنایەتی ئاسایی لەگەڵ ئەم شێوە پاڵکەوتنەی سەر قەرەوێڵەدا بووبێ؟. ئێوارەی فێنکی هاوین، ژن و پیاو، بە ڕووت و قووتی کەی بیانویستبا دەسلەملان بن و باسی هەر شتێ بکەن کە خۆیان بیانەوێ، هیچ شتێ نەبێ ناچاری هەڵسانیان بکا. پاڵ بکەون و گوێ بۆ دەنگی ئارامی دەرێ شل کەن. دەبێ هەرگیز کاتێ نەبووبێ شتی وا ئاسایی بووبێ؟. جولیا وەئاگا هاتەوە. چاوی هەڵگلۆفتن و کەوتە سەر ئانیشک تا بڕوانێتە تەباخەکە.

– ئاوەکە کوڵاوە و نیوەی ڕۆیشتوە. هەڵدەستم قاوەیەک لێ دەنێم. سەعاتێ کاتمان بە دەستەوە ماوە. کەی لە ئەپارتمانەکەی ئێوەدا کارەبا دەکوژێتەوە؟.

– سەعات بیستوسێ و نیو.

– لە بەشی ناوخۆدا، سەعات بیستوسێ دەکوژێتەوە. بەڵام دەبێ زووتر لەوێ بم



چونکە... هێی!!... لاکەوە هەی پیس!.

لە پڕ، بە سەر پێخەفەکەدا وەرچەرخایەوە و لنگە پێڵاوێکی هەڵگرت و بە گورجیی بەرەو قوژبنێکی ژوورەکەی هاویشت. ڕێک وەک ئەو بەیانییەی کرد کە لە دوو دەقیقەی ڕقدا، فەرهەنگی زمانی، بەرەو گۆڵدستەین هاویشت.

وینستۆن بە پەشۆکاوی پرسی: – ئەوە چی بوو؟!.

– جرج. چاوم لێ بوو لووتە ناشرینەکەی لەوێوە دەرهێنابوو. کونێ لەوێ هەیە. باش بوو چاکم تۆقاند.

وینستۆن بە سەرسامییەوە گوتی: – جرج؟!. لەم ژوورەدا؟!.

جولیا ڕاکشایەوە و بە کاوەخۆ گوتی: "جرج لە هەموو جێیەک هەیە. لە مەتبەخی بەشی ناوخۆیی ئێمەشدا هەیە. هێندێ شوێنی لەندەن جرج شەپۆلی تێدا دەدا. دەزانی جرج پەلاماری منداڵان دەدەن؟. لەو جۆرە شوێنانەدا، ژنان ناوێرن بۆ یەک دەقیقە چاویان لە منداڵی خۆیان خافڵ بێ. جرجی قاوەیی زل، ئە ئاوا دەکەن. بەزم لەوەدایە کە هەمیشە... "

وینستۆن بە چاوی داخراوەوە گوتی: "بەسە بیبڕەوە!."

– گیانەکەم ڕەنگت خراپ تێک چوو. چی بووە؟. تەبیعەتت پێیان تێک دەچێ؟!.

– لە هەموو ترسی ئەم دنیایەدا – یەک جرج!.

جولیا خۆی پێوە لکاند و باسک و هەردوو لنگی لە دەوری ئالاند. دەتگوت دەیەوێ بە گەرمایی جەستەی خۆی ورەی بەرز بکاتەوە. وینستۆن، یەکسەر چاوی نەکردنەوە. تاوێ هەستی کرد پێبەندی ئەو (مۆتەکە)یە کە بە درێژایی هەموو تەمەنی، جاروبارێ دووچاری دەبێ و هەموو جارێکیش هەر هەمان بابەتە. بەرانبەر دیوارێکی تاریکیی دەبووەوە کە ئەو دیوی، شتێکی تۆقێنەری لێ بوو. شتێ بوو کە نەدەکرا بەرەوڕووی بێتەوە. قووڵترین هەستی ناخی، خۆی لە خۆفریوداندا دەنواند چونکە دەیزانی چی لەودیو دیوارە تاریکییەکەدا هەیە. ئەگەر خۆی بهاوێتە ناو تالوکەی مەرگەوە، بۆ نموونە، کەرتێ لە مۆخی خۆی ببڕێ، ئەوا دەشتوانێ ئەو شتە ڕاکێشێتە بەر ڕووناکایی. هەموو جارێ، بە بێ ئەوەی ئاشکرای کات دەهاتەوە سەر خۆ. بەڵام بە شێوەیەک لە شێوەکان لەگەڵ ئەوەدا ڕێک دەهاتەوە کە تازە جولیا باسی کرد و ئەم پێی بڕی. گوتی:

– ببوورە هیچی وا نییە. هەر ئەوەیە کە ڕقم لە جرجە.

– نیگەران مەبە ئەوینەکەم. ناهێڵین ئەم گیانلەبەرە پیسە لێرە بمێنێ. پێش

ڕۆیشتنمان، بە تۆپەوانەیەک کونەکەی لێ دەگرم. کە جارێکی تریش هاتینەوە، کەمێ گەچ لەگەڵ خۆمدا دەهێنم و ڕێک کونەکەی لێ سواخ دەدەم.

ساتی ڕەش و ترس نیوەفەرامۆش کرا. وینستۆن جۆرە شەرمێکی بە خۆیدا هات و پشتی دایەوە. جولیا هەستا و بەدلەکەی لە بەر کرد و قاوەیەکی ساز دا. ئەو بۆنەی کە لە قابلەمە دەسکدارەکەوە بەرز دەبووەوە، هێند تیژ و ئارەزووبزوێن بوو، ناچار پەنجەرەکانیان داخست نەبادا یەکێ لە دەرەوەڕا هەست بکات و حەز بکا بزانێ چ باسە. لە تامی قاوەکە کاریگەرتر ئەو پێکهاتە ئاوریشمییە بوو کە شەکرەکە پێیی دابوو، ئەو شتەی کە وینستۆن دوای ساڵەهای ساکەرین خواردن بیری چووبوو. جولیا، دەستێکی لە گیرفانی نابوو و نان و مورەبای بە دەستەکەی ترەوە بوو، لە ڕەفتی کتێبەکان ڕادەما. بیری لە ڕێکخستنی مێزەکە، بە گونجاوترین شێوە دەکردەوە. لە سەر کورسییەکە دانیشت تا تاقی بکاتەوە. بە کاوەخۆ، سەعاتە کۆنەکەی تاوتوێ کرد. پارچە بلوورەکەی هێنایە سەر قەرەوێڵەکە تا لە بەر ڕووناکایی تەماشای بکا. وینستۆن کە ئەو شووشەیەی پێ شیرین بوو، لێی وەرگرت. جولیا گوتی:

– پێت وایە ئەمە چییە؟.

– پێم وا نییە هیچ شتێ بێ... مەبەستم ئەوەیە: باوەڕ ناکەم بە کەڵکی هیچ شتێ بێ. هەر لە بەر ئەوەیە حەزی لێ دەکەم. پارچەیەکی بچووکی مێژووە و بیریان چووە بیگۆڕن. ئەگەر پیاو شارەزای خوێندنەوەی بێ، پەیامێکی سەد ساڵەیە.

جولیا، بە سەری هێمای بۆ دیوارەکە کرد و گوتی:

– ئەی ئەو وێنەیە... سەد ساڵ دەبێ؟.

– زیاتریش. دەتوانم بڵێم دوو سەد. بڕیار لە سەر شتی وا نادرێ. لەم ڕۆژگارەدا مەحاڵە تەمەنی شت بزاندرێ.

جولیا لێی چووە پێشێ تا بە وردی لێی ڕامێنێ. لەقەیەکی بە تەختەکەی ژێریدا کێشا و گوتی: ئەو شتە پیسە لێرەوە سەری دەرهێنابوو. ئەم جێیە کوێیە؟. پێشتر لە شوێنێکم دیوە.

– کڵێسایە. یا کڵێسا بوو. ناوی سێنت کلیمانت بوو.

ئەو پارچە شیعرەی بیرکەوتەوە کە مستەر چارینگتۆن فێری کردبوو. بیری کەوتەوە و بە ئاوازێکی پڕحەسرەتەوە دەستی پێ کرد:



زەنگەکانی سێنت کلیمانت دەڵێن نارنج و لیمۆین

بە دەم سەرسوڕمانی وینستۆنەوە، جولیا شیعرەکەی تەواو کرد:

زەنگەکانی سێنت مارتین دەڵێن سێ شاهیمان وێدەوە

زەنگەکانی بیلی پیر دەڵێن کەی قەرزت دەدەیتەوە؟.

پاشان گوتی:

– ئەوانی دیم بیر نەماون. بەڵام دەزانم ئاوها تەواو دەبێ:

ئەوە مۆمێکە ڕێی پێ ڕووناک کە

ئەوە تەورێکە ملت هەڵپاچە

وەک مۆری بەڵگەنامەی بێ بایەخ وا بوو. بەڵام دوای "زەنگی بیلی پیر" دەبوو دێڕێکی تریش هەبێ. دوور نەبوو ئەوەش لە ناو هۆشی مستەر چارینگتۆنەوە دەربهێندرێ.

– کێ فێری کردی؟.

– باپیرم. کە منداڵ بووم، ئەوەی بۆ دەگوتم. کە کرایە هەڵم من تەمەنم هەشت ساڵان بوو. بە هەر حاڵ، ون بوو. شێوەی لیمۆم بیر نەماوە بەڵام نارنجم دیوە. جۆرە میوەیەکی خڕ و زەردە و توێکڵێکی ئەستووری هەیە.

– من لیمۆم دیوە. لە پەنجاکاندا، لە هەموو جێ دەست دەکەوت. هێند ترش بوو تەنانەت بۆنەکەشی ددانی ئاڵ دەکرد.

– گرەوێت لەگەڵ دەکەم کە پشتی ئەو تابلۆیە سیسرکی لێیە. ڕۆژێ دایدەگرم و چاکی پاک دەکەمەوە. پێم وایە کاتی ڕۆیشتنمان هاتووە. دەبێ ئارایشی ڕوخسارم بشۆم. چەند ناخۆشە!. دوایی ئەو ڕەنگە لە تۆش دەکەمەوە.

وینستۆن، ماوەی چەند دەقیقەیەکی دی لە جێیی خۆیدا مایەوە. ژوورەکە تاریک داهات. بەرەو لای ڕووناکییەکە ڕۆیشت و سەرنجی دایە پارچە بلوورەکە. جوانییەکەی لە مەرجانەکەی ناویدا نەبوو بەڵکو لە خودی شووشەکەدابوو. قووڵایی هەبوو و لە هەمان کاتدا وەک هەوا سافیش بوو. دەتگوت شووشەکە قوببەی ئاسمانە و دنیایەکی گچکەی لە ئامێزی خۆی ناوە. وای هەست دەکرد کە ئەویش دەتوانێ بچێتە ناویەوە و، لە ڕاستیدا، خۆی و سەعات و مێز و قەرەوێڵەکە لە ناویدابوون. پارچە بلوورەکە ژوورێ بوو و ئەمی تێدا بوو؛ مەرجانەکە، ژیانی جولیا و خۆی بوو کە لە ناوەندیدا ئۆقرەی گرتبوو.

## ٥

سایم دیار نەما. بەیانییەک نەهاتە کار و چەند کاڵفامێک باسی دیارنەبوونیان کرد. ڕۆژی دوایی، باسیشی نەما. ڕۆژی سێیەم، وینستۆن چووە هۆڵی بەشی ئەرشیف و تەماشای تەختەی ڕاگەیاندنی کرد. ڕاگەیاندنێک ناوی ئەندامانی لیژنەی شەترەنجی لە سەر چاپ کرابوو کە سایمیش یەکێکیان بوو. خەت بە سەر هیچ ناوێکدا نەهاتبوو بەڵام ناوێک کەمی کردبوو. هەر ئەوەندە بەس بوو. سایم لە سەر تەختەی هۆش سڕدرایەوە. سایم لە بوون کەوت: هەرگیز بوونی نەبوو.

دنیا گەرم بوو. پێچ و پەنا بێ پەنجەرەکانی وەزارەت، کۆندیشنیان تێدا بوو و پلەی سروشتی خۆیان مابوو. بەڵام سەر شۆستەکان پێی پیادەیان دەبرژاند و بۆگەنی ناو شەمەنەفەری ژێر زەوی لە کاتی قەرەباڵغیدا، لە وزە بەدەر بوو. خۆ تەیارکردنی پێشەکی بۆ حەفتەی ڕق بە ڕێکوپێکی دەڕۆیشت و گشت فەرمانبەرانی وەزارەت لە کاتی دیاریکراو پتر کاریان دەکرد. ڕیزی خۆپێشاندان و کۆبوونەوە، مەشقی سەربازانە، گوتارخوێندنەوە، پەیکەری مۆم، فلیمی سینەما، بەرنامەی تەلەسکرین، دەبوو هەموو ئامادە بکرێن. دەبوو زۆر جێ بڕازێتەوە، پەیکەر داتاشرێن، دروشم داڕێژرێن، سروود بنووسرێن، پڕوپاگەندە بڵاو بکرێنەوە، وێنە دەسکاریی بکرێن. لە بەشەکەی جولیا، لە بەڕێوەبەرایەتی هەڵبەستندا، بەرهەمهێنانی چیرۆک ڕاگیرابوو و زنجیرەیەک نامیلکە لە بارەی بێدادییەوە وەبەرهەم دەهات. وینستۆن، هەموو ڕۆژێ دوای کارەکەی خۆی ماوەیەکی زۆر دەمایەوە و بە ژمارەکانی تایمزدا دەچووەوە و ئەو نووسینانەی چاک دەکردن و دەگۆڕین کە لە ئاخاوتنەکاندا بەکار دەبران. شەو درەنگان، ئەو دەمەی کرێکاران بە شەقامەکاندا، بە هەرا و هوریا پەرت دەبوون، شار دەکەوتە بارێکی سەیری (تا)هێنەرەوە. مووشەک لە جاران زیاتر دەتەقینەوە. جاروبارێ لە دوورەوە دەنگی تەقینەوەی یەکجار مەزن دەبیسترا و کەس نەیدەزانی چ باسە. ئەو تەقینەوانە ببوونە هۆی بڵاوبوونەوەی پڕوپاگەندەی بێ سەر و بەر.

ئەو ئاوازە تازەیەی کە دەبوو ببێ بە ئاوازی حەفتەی ڕق ناوی ئاوازی ڕق بوو، تەواو ببوو و لە تەلەسکرینیشەوە بە نیوەچڵی بڵاو کرابۆوە. دەنگێکی کێویانەی بە نەڕەنەڕ بوو و نەدەکرا ناوی ئاوازی لێ بندرێ. بە دەنگی دەهۆڵ دەچوو و شیرە شیرێ بوو و لە هەزاران گەرووەوە هەڵدەستا و لەگەڵ شڵپەی پێڵاودا کە بە زەویدا دەدران تێکەڵاو دەبوو و



دەنگێکی پێک دەهێنا، پیاوی لێ دەتۆقی. کرێکاران حەزیان لێ دەکرد و شەوان لەگەڵ ئاوازی (تەنها هەر خەیاڵێکی بێ سەروبەر بوو)دا کە هێشتا باوی مابوو پێشبڕکێی دەکرد. منداڵەکانی ماڵە پارسۆنز، شەو و ڕۆژ، بە پارچە قاقەزی ئاودەست و کوتە شانە لێیان دەدا. وینستۆن، بە ئێواران لە هەموو کاتێ زیاتر سەرقاڵ بوو. مەفرەزەی هەرەوەزی کە خێزانی پارسۆنز سازیان کردبوو، کۆڵانەکەیان بۆ حەفتەی ڕق دەڕازاندەوە. لافیتەیان هەڵدەواسی، پۆستەریان ڕەنگ دەکرد، داربەیداغیان لە سەربانان دەچەقاند و وایەریان بۆ گڵۆپ ڕایەڵ دەکرد. پارسۆنز بە شانازییەوە دەیگوت: ئەپارتمانی سەرکەوتن، بە تەنێ، چوار سەد مەتر قوماشی پێ دەوێ تا پێوە بشەکێتەوە. لە سەر هەوا و هەوەسی خۆی بوو و وەک قومارباز دڵی خۆش بوو. گەرما و کاری زیادەی ئێواران، بیانووی پانتۆڵی کورت و کراسی کراوەیان پێ دابوو. لە یەک کاتدا، لە هەموو جێیەک بوو: ڕایدەکێشا، پاڵی دەنا، (بەڵێ)ی دەگوت، بزماری دادەکوتا، شیعری دەخوێند، لەگەڵ هەمووان‌دا دەدوا و لە هەموو بارێکیشدا، خوڕخوڕ عارەقەی لێ دادەچۆڕا و بۆنی کەسکوونی، بە هەوادا بڵاو دەبووەوە. لە ناکاو، سەروسەکوتی وێنەیەکی تازە لە لەندەن پەیدا بوو. هیچی لێ نەنووسرابوو. وێنەی سەربازێکی ئەوروئاسیایی بوو و سێ و چوار مەتر بڵند بوو. سیمای بزرکاوی مەگۆلی و پۆستاڵ لە پێ و ڕەشاش بەدەست و پەنجە لە سەر پەلەپیتکە ڕاوێستابوو. لە هەر لایەکەوە تەماشات دەکرد، ڕووی ڕەشاشەکەی لێت بوو. ئەو وێنەیە، بە هەموو جێیەکی بەتاڵ و قەد دیوارێکەوە هەڵواسرابوو و ژمارەیان تەنانەت لەوانەی ڕێبەری گەورەش زۆرتر بوو. کرێکاران کە بە تەبیعەتی حاڵ لە شەڕدا بێلایەن بوون، بەرەو شێتییەکی کاتی وڵاتپارێزی دەبران. وەک گۆڕانکارییە گشتییەکان، مووشەکیش خەڵکی لە جاران پتر دەکوشت. یەکێ لەو مووشەکانە بەر سینەمای (ستێپی) کەوت و چەند سەد کەسێ کەوتنە ژێر وێرانەکەیەوە. هەموو دانیشتوانی دەوروبەری سینەماکە کەوتنە ناشتنی قوربانییەکان و چەندین سەعات پێوە خەریک بوون. ئەو کارە خۆی لە خۆیدا دەربڕینی ناڕەزایی بوو. بۆمبایەکیش بەر گۆڕەپانێکی چۆڵ کەوت کە منداڵان بۆ کایە سوودیان لێ دەدی، لەوێش زۆر منداڵ لەتوپەت کران. خۆپێشاندانی ناڕازیی ساز کرا، پەیکەرۆکەی گۆڵدستەین سووتێندران، سەدان وێنەی سەربازە ئەوروئاسیاییەکە دڕێندران و دەرخواردی ئاگر دران. لە گەرمەی ئەو هەڵچوونەدا، چەندین کۆگا هێرشیان کرایە سەر. پڕوپاگەندە بڵاو بووەوە کە گوایە جاسووس، بە بێسیم ئەو مووشەکانە ڕێنمایی دەکەن. پیرەمێردێک و پیرەژنێک، گومانی سیخوڕییان لێ کرا، ماڵەکەیان گڕ درا و مردن.

وینستۆن و جولیا، هەر هێندەی دەرفەتیان بوایە دەچوونە ژوورەکەی مستەر چارینگتۆن و بەرانبەر پەنجەرە کراوەکە، لە سەر تەختەخەوەکە، بە ڕووتی پاڵیان دەدایەوە و خۆیان فێنک دەکردەوە. چی دی جرجەکە دەرنەکەوت بەڵام بە هۆی گەرماوە، سیسرک لە زۆربووندابوون. گرینگ نەبوو، ژوورەکە پاک بێ یا نا. بۆ ئەوان بەهەشتێ بوو بۆ خۆی. هەر کە دەگەیشتنە ئەوێ بیبەریان - لە بازاڕی ڕەش چنگیان کەوتبوو - بە هەموو شتێکەوە دەکرد و بە پەلەپەل خۆیان ڕووت دەکردەوە و بە جەستەی عارەقاوییەوە بەر دەبوونە گیانی یەک و دوایی خەو دەیبردنەوە. کە وەئاگا دەهاتنەوە، سیسرکەکان، بۆ هێرشبردن لەشکری خۆیان گرد کردبۆوە.

لە مانگی حوزەیراندا چوار، پێنج، شەش، حەوت کەڕەت یەکتریان دی. وینستۆن دەستی لە خواردنەوەی جن هەڵگرتبوو کە کردبووی بە پیشەی شەو و ڕۆژی و چی دی پێویستی پێ نەمابوو. ڕەوتی ژیانی، لەوە دەرچووبوو لە وزە بەدەر بێ. چی دی ناچار نەبوو سیمای خۆی بۆ تەلەسکرین بلوێنێ یا بە هەموو توانای خۆی بقیژێنێ. کە کونجێکی وەکوو ماڵیان هەبوو، ژوانی چەند سەعاتیی (بێ ئەوەی کاتەکەی دیاری بکرێ) کێشە نەبوو. گرینگ ئەوە بوو ژووری سەرەوەی کۆنەفرۆشەکە هەبێ. هەستکردن بە بوونی، وای لێ دەکردن خۆیان بە بەشێکی دانێن. ژوورەکە جیهانێک بوو، قوژبنێکی سەردەمی بەسەرچوو بوو و گیانداری لەناوچووی تێدا دەگەڕان. وینستۆن، مستەر چارینگتۆنیشی بە یەکێ لەو گیانداره لەناوچووانە دەهاتە پێش چاو. هەموو جارێ بەر لەوەی بە پلەکاندا سەرکەوێ، ماوەی چەند دەقیقەیەک قسەی لەگەڵدا دەکرد. پێ دەچوو ئەو پیرەمێردە بە دەگمەن لەوێ دەرچێ یا هەر لەبنیی دەرنەچێ. لە لایەکی تریشەوە، کڕیار ڕوویان تێ نەدەکرد. لە نێوان چوار دیواری دوکانە گچکە تاریکەکەی و مەتبەخی بچوکتری پشتەوە کە خواردنی لێ لێدەنا، و لە ناو وردەواڵەی هەمە چەشنە کە قەوانێکی بە (بۆقی)ی کۆنیشی تێدا بوو، ژیانی جنۆکە ئاسایی بە سەر دەبرد. حەزی لە دەمەتەقێ دەکرد. بە خۆ و لووتی درێژ و چاویلکەی ئەستوور و پشتی کۆمەوە و بە چاکەتە مەخمەلیەکەیەوە، بە ناو وردەواڵەکاندا دەهات و دەچوو. ئەوەندەی بە کۆکەرەوەی شڕە و پڕە دەچوو بە فرۆشیار نەدەچوو. بە جۆش و خرۆشەوە، ئەم یا ئەو کۆمەڵە کەرەسە کۆنەی بەتاڵ دەکرد. قەپاغە شووشەی چینی، قەپاغی ڕەنگاوڕەنگی قوتووی تووتن، قوتووی گچکەی ڕەنگ زێڕین کە چەند داوە موویەکی قژی منداڵێکی تێدا بوو کە دەمێ بوو مردبوو - بە دەستەوە دەگرتن و هەرگیز لە وینستۆنی نەدەویست بیانکڕێ.



مەبەستی هەر ئەوە بوو سەرنجی ڕاکێشن. ئاخاوتن لەگەڵیدا وەک ئەوە بوو گوێ لە قەوانە شکاو بگری. وینستۆن، توانی هێندێ لە شیعرە بیرچووەکان لە کۆگای هۆشیەوە دەربێنێ. یەکێ لەوانە دەربارەی بیست و چوار ڕیشۆڵە بوو، یەکێکی تریش لە سەر گای شاخ چەماوە بوو و یەکێکی تریش لە بارەی مەرگی (کۆن ڕۆبین)ی هەشبەسەرەوە بوو. هەر جارێکیش کە یەکێ لەوانەی دەگوت بزەیەکی دەکرد و دوایی دەیگوت: "گوتم ڕەنگە حەز لە بیستنی بکەی". بەڵام لە هەر یەکێکیان، چەند دێڕێ زیاتری لە بیر نەمابوو. وینستۆن و جۆلیا چاکیان دەزانی کە ئەو بارودۆخە زۆر ناخایەنێ. هێندێ جار هێند مەرگیان لێ نزیک دەبووەوە، وەک تەختە خەوەکەی لێ دەهات کە لە سەری پاڵ دەکەوتن. وەک کەسێ خۆیان پێکەوە دەنووساند کە دەرفەت لە پێنج دەقیقەی پێش مردن، بۆ ئارەزووی هیوابڕاوانەی خۆی ببینێ. بەڵام کاتی واش هەبوو کە نەک هەر دڵنیا بوون بەڵکو هەستیان بە نەمریش دەکرد. پێیان وا بوو تا لەو ژوورە بن بێ وەی دەبن. تا دەیگەیشتنێ، تا بڵێی جێی مەترسیی بوو بەڵام خودی ژوورەکە میحرابێ بوو بۆ خۆی. بە شووشە بلوورینەکە دەچوو کە وینستۆن پێی وابوو ڕێگەی چوونەژوورەوەی هەیە و هەر وەژووریش کەوێ ئیدی دەتوانێ زەمان ڕاگرێ. زۆر کاتی خۆی بە زیندەخەون بەسەر دەبرد. تا ڕۆژی حەشر بەختیان یار دەبێ و پاشماوەی تەمەنی ئاسایی خۆیان لە ئامێزی یەکتردا بەسەر دەبەن. یا کاترین دەمرد و وینستۆن و جولیا لە ئاهەنگێکی قنجیلەدا زەماوەندیان دەکرد. یا پێکەوە خۆیان دەکوشت. یا خۆیان ون دەکرد؛ سیمای خۆیان دەگۆڕی و خۆیان فێری ئاخاوتنی کرێکاران دەکرد و کاریان لە کارگەیەکدا پەیدا دەکرد. ئەوسا بە ئاسوودەیی لە کارگەیەکی قەراغ شاردا، ژیانیان دەبردە سەر. دەیانزانی ئەو خەیاڵانە نایەنە دی. ئەوەی ڕاستی بێ، ڕێی دەربازبوون نەبوو. حەزیان بە خۆکوشتنیش نەدەکرد کە لەوانی دی گونجاوتر بوو. لە ڕۆژێکەوە بۆ ڕۆژێکی دی، لە حەفتەیەکەوە بۆ حەفتەیەکی دی، چنگیان لەو ساتە گیر دەکرد کە تێیدا دەژیان و پێ نەدەچوو شتێکی تری بە دوادا بێ. ڕێک وەک سیپەلک کە تا با هەبێ دەمژێ.

جارێکیان باسی ئەوەیان کرد کە لە حیزب یاخی بن، بەڵام نەیاندەزانی چۆن دەست پێ بکەن. تەنانەت ڕێکخراوی برایەتیش، ئەگەر هەبێ، ڕێی دۆزینەوەی هاسان نەبوو. ئەو ئاشنایەتییە سەیرەی کە لە نێوان خۆی و ئۆبرایندا هەبوو، یا پێی وابوو هەبێ، وای لێ دەکرد بچێتە لای و پێی ڕاگەیەنێ کە دوژمنی حیزبە و یارمەتی لێ دەخوازێ. ئەوەی بە جولیا دەگوت و پێشی وا نەبوو ڕازی بێ. جولیا، لە سەر ئەوە ڕاهاتبوو کە بڕیاری خۆی لە

سەر سیمای خەڵک بدا. بەوەدا دەیزانی کە وینستۆن بە هۆی یەک تیلە سەیرکردنەوە ئەو باوەڕەی بە ئۆبراین هەیە و ئەوەشی پێ سروشتی بوو. لەو باوەڕەدا بوو کە هەموو یا زۆربەی هەرە زۆری خەڵکەکە ڕقیان لە حیزبە و هەر هێندەی زانییان بێ وەی دەبن یاساکانی پێشێل دەکەن. بەڵام باوەڕی نەدەکرد بەرهەڵستییەکی ڕێکخراوەیی هەبێ یا بتوانێ بوونی هەبێ. دەیگوت هەموو ئەو داستانانەی لە بارەی گۆڵدستەین و سوپای نهێنی ئەوەوە بڵاو دەبنەوە، هەمووی پڕوپاگەندەن و حیزب بۆ مەبەستی خۆی دایناون و خەڵکەکەش ناچارن وای پێشان بدەن کە باوەڕ دەکەن. هەزاران جار لە خۆپێشاندانەکانی حیزبدا، بە هەموو توانای خۆی شیرڕاندویەتی و داوای مەرگی کەسانێکی کردووە کە ناویشی نەبیستوون و بچووکترین باوەڕیشی بە تاوانبارییان نەبووە. کاتێ کە دادگای ئاشکرا دادەنرا، لەگەڵ ئەنجومەنی لاواندا لە سەرەتاوە تا کۆتایی لەوێ دەبوون و هاواری (مردن بۆ خائینان)یان دەکرد. بە درێژایی دوو دەقیقەی ڕق، هێندەی جنێو بە گۆڵدستەین دەدا کە هەمووانی بۆڕ دەدان. بەڵام بچووکترین شارەزاییشی لە بارەی گۆڵدستەینەوە نەبوو. دوای شۆڕش گەورە ببوو و لەوە کەمتەمەنتر بوو ستراتیژی پەنجاکان و شێستەکانی حیزبی لەبیر بێ. شتێک ناوی ڕاپەڕینی سیاسی بێ لە جغزی خەیاڵی ئەو بەدەر بوو. بە لایەوە، لە هەموو حاڵەتێکدا حیزب لە تێکشکان نەدەهات. دەبێ حیزب هەموو دەمێ هەبێ و هەموو دەمێکیش وەک خۆی بێ. هەر هێندە دەکرا سەرپێچییەکی نهێنی بکەی یا ئەوپەڕی دەست بدەیتە کاری زەبروزەنگی تاکە کەسیی. کەسێ بکوژی یا شتێک بتەقێنیتەوە.

جولیا، لە چەند لایەنێکەوە لە وینستۆن ژیرتر بوو و کەمتریش پڕوپاگەندەی حیزب کاری تێ دەکرد. جارێکیان کە باسی شەڕی ئەوروئاسیای لەگەڵ وینستۆندا هێنایە گۆڕێ، جولیا باوەڕی خۆی وا دەرخست کە چ شەڕێ لە ئارا نەبێ. ئەو بۆمبانەش کە ڕۆژانە بە سەر لەندەندا دادەبارین، کاری خودی حکوومەتی ئۆقیانووسیا بێ (تا میللەت لە ناو ترس و لەرزدا بێ). بۆچوونی وا، هەرگیز بە بیری وینستۆندا نەهاتبوو. جولیا باسی ئەوەشی بۆ کرد کە لە دوو دەقیقەی ڕقدا، بە زۆر پێش بە پێکەنینی خۆی دەگرێ. هەر هێندە باسی فەرمانە حیزبییەکانی دەکرد کە پەیوەندی بە ژیانی خۆیەوە هەبێ. هەموو دەمێ، ئامادە بوو بۆ بۆچوونە ڕەسمییەکانی حیزب، دەست بە گەردندا بدا چونکە جیاوازی نێوان ڕاست و درۆی پێ گرینگ نەبوو. بۆ نموونە باوەڕی بەوە هەبوو کە حیزب فڕۆکەی داهێنابێ. لە قوتابخانە ئەوە فێر کرابوو. (وینستۆن بیری کەوتەوە کە حیزب لە



پەنجاکاندا ڕایگەیاند گوایە هێلیکۆپتەری داهێناوە. دوای نەوەیەکی دی، بێ گومان داهێنانی ماتۆڕی هەڵمیش بۆ خۆی دەگێڕێتەوە) کە بە جولیای گوت مێژووی فڕۆکە بۆ پێش لەدایکبوونی ئەو دەگەڕێتەوە و زۆر بەر لە شۆڕش هەبووە، قسەکانی پێ کەمبایەخ بوون. کوا گرینگ بوو کێ فڕۆکەی داهێنابێ؟. کاتێکیش زانی جولیا چوار ساڵ لەوەبەری بیر نەماوە کە ئۆقیانووسیا لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا لە شەڕدا بوو و لەگەڵ ئەوروئاسیادا ئاشتییان لە نێواندا بوو، دەتگوت لە سەربانێ بەربۆتەوە. بەڵێ ڕاستە هەموو شەڕێکی پێ فێڵ و تەڵەکە بوو بەڵام هەستی بەوەش نەکردبوو کە ناوی دوژمن گۆڕاوە. بە شێوەیەکی تەماوی گوتی: "وام دەزانی هەمیشە هەر لەگەڵ ئەوروئاسیادا لە شەڕداین". ئەم باسە، بۆ وینستۆن بوو بە مایەی جۆرە ترسێک. داهێنانی فڕۆکە بۆ سەردەمی پێش لەدایکبوونی جولیا دەگەڕایەوە و ئەهێکی تێدا بوو. بەڵام گۆڕانکارییەکانی جەنگ پەیوەندییان بە ماوەی چوار ساڵ پێشترەوە هەبوو و ئەو دەمە جولیا مرۆڤێکی تەواو بوو. نزیکەی چارەکە سەعاتێ بۆی باس کرد ئەوسا توانی باوەڕی پێ بهێنێ کە سەردەمێک ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دوژمن بوو نەک ئەوروئاسیا. بەڵام دیسان مەسەلەکەی بە لاوە پووچ بوو. بە بێ تاقەتیی گوتی: " ئەوجا چییە؟. خۆ شەڕی دوابڕاو بەردەوامە. بە هەرحاڵ، دەزانین گشت هەواڵەکان درۆن."

هێندێ جار باسی بەشی ئەرشیفی دەکرد کە ئەو دەسکارییە بێ پەردانەی تێدا ئەنجام دراوە. شتی لەو بابەتانەی پێ سەیر نەبوو. بە هۆی ئەو درۆیانەوە کە دەکرانە ڕاستی، هەستی بەوە نەدەکرد کە زارکێکی قووڵ لە ژێر پێیدا دەکرێتەوە. بەسەرهاتی جۆنز و ئارسۆن و ڕۆتەرفۆرد و ئەو کەرتە قاقەزەی بۆ گێڕایەوە کە ماوەیەک کە لە نێوان پەنجەکانیدا بوو.چ کارێکی نەکردە سەر. هەر لە سەرەتاوە هیچی ئەوتۆی لێ حاڵی نەبوو.پرسی:برادەرت بوون؟.

– نەخێر. نەمدەناسین. ئەندامی ناوەندی حیزب بوون. خۆ لە منیش بە تەمەنتر بوون. هی زەمانی کۆنینە بوون، بەر لە شۆڕش. هەر هێندە بوو کە بەو شێوە دەمناسین.

– باشە خەمی پێ دەوێ؟. هەموو دەمێ خەڵک دەکوژرێن. وا نییە؟.

هەولێ دا تێیگەیەنێ: "ئەو مەسەلەیە تایبەتیی بوو. هەر کوشتنەکەیان نەبوو. ئاگات لێیە ڕابردوو، تەنانەت دوێنێش، چۆن دەسڕدرێتەوە؟. ئەگەر ڕابردوو لە جێیەکدا خۆی مەڵاس دابێ، وا لە ناو هێندێ شتی ڕەق و تەقدایە کە ناویشیان نییە؟. وەک ئەو پارچە

بلووره. هیچ شتێ دەربارەی شۆڕش و وەختی بەر لە شۆڕش نازانین. هەموو بەڵگەنامەیەک یا لەناو براوە یا گۆڕدراوە، هەموو کتێبێ سەرلەنوێوە نووسراوەتەوە، هەموو وێنەیەک جارێکی دی کێشراوەتەوە، هەموو پەیکەرێک و شەقامێک و ئەپارتمانێک ناوی نوێیان هەیە، سەرلەبەری مێژوو گۆڕدراوە. ئەم ڕێبازەش، ڕۆژ بە ڕۆژ و سات بە سات بەردەوامە. مێژوو لە جێی خۆی چەقیوە. یەک سەردەم نەبێ کە حیزب هەمیشە لە سەر هەقە، سەردەمی تر بوونی نییە. دیارە دەزانم ڕابردوو گۆڕدراوە، بەڵام تەنانەت ئەو دەمەی کە بەخۆشم دەیگۆڕم چ بەڵگەی گۆڕانیم نییە. کە کارێک ئەنجام دەدرێ، شوێنەواری پێشووتری ناهێڵدرێ. تاکە بەڵگە وا لە ناو هۆشی مندایە و لەوە دڵنیا نیم هاوبیری من هەیە یا نا. تەنها ئەو چاوتروکانە لە هەموو تەمەنمدا، بەڵگەیەکی ڕاستەقینەی بەر لە ڕوودانەکە بە چەندین ساڵ، بە دەستمەوە بوو.

– جا بە کەڵکی چی دێ؟.

– هیچ. دوای یەک دوو دەقیقە فڕەمدا. ئەگەر ئەمڕۆبایە نەمدەفەوتان.

– من شتی وا ناکەم. بۆ شتێ خۆم تووشی ئەو مەترسییە دەکەم کە ئەوەندە بهێنێ نەک بۆ لەتە ڕۆژنامەی کۆن. هەڵیشتگرتبا چیت پێ لێ دەکرا؟.

– ڕەنگە بە کەڵک نەهاتبا بەڵام بەڵگە بوو. دوور نەبوو لێرە و لەوێ چپە چپێکی ساز کردبا بەو مەرجەی بموێرابا پێشانی کەسی بدەم. باوەڕ ناکەم بتوانین لە مەودای ژیانی خۆماندا شتێ بگۆڕین بەڵام دەتوانین کارێکی وا بکەین گەرای بچووک بچووک لێرە و لەوێ بخەین – کۆمەڵە خەڵکی کەم کەم پشتی یەک بگرن و وردە وردە زیاد بکەن. تەنانەت کەمێ زانیاریش لە پاش خۆیان جێ بهێڵن تا نەوەی دواتر لەو جێیەوە دەست پێ بکەن کە ئەوان پێی گەیشتوون.

– عەزیزم من چ پەیوەندیم بە نەوەی داهاتووەوە نییە. پەیوەندیم بە خۆمانەوە هەیە.

– تۆ، هەر لە پشتێنەت بەرەخوار یاخییە.

جولیا ئەو بۆچوونەی بە درەوشانەوەیەکی کتوپڕەوە وەرگرت. ئامێزی پێدا کرد. سەری خۆی بە بۆچوون و باوەڕی حیزبەوە نەدەهێشان. ئەگەر وینستۆن باسی (سۆسینگ) و باوەڕی دووفاقانە و گۆڕینی ڕابردوو و وەلانانی (ئێستا)ی بکردبا، جولیا سەرەگێژکەی پێ دەکەوت و دەیگوت کە هەرگیز گوێی بەوانە نەداوە. جگە لەوەش، بە تووڕەهاتی دەزانین. ئیدی سەری خۆی بۆ بهێشێنێ؟. دەیزانی کەنگێ (بژی) بکا و کەنگێ



(هوویها) بکات، ئەوەش بەس بوو. ئەگەر وینستۆن درێژەی بەو باسانە بدابا، جولیا خەو دەیبردەوە. لەو جۆرە کەسانە بوو کە دەتوانن هەر کاتێک و لە هەر کوێ بن بخەون. لە ئەنجامی دەمەتەقێدا، وینستۆن زانی چ هاسانە پیاو خۆی بە یەکباوەڕ پیشان بدا و هەمان کاتیش فڕی بە سەر یەکباوەڕییەوە نەبێ. حیزب سەرکەوتنێکی سەیری لەوەدا بەدەست هێنابوو کە جیهانبینی خۆی بە سەر کەسانێکدا بسەپێنێ کە ناتوانن پەی پێ بەرن. دەکرا زەقترین دەسکاری بەر هەست و دەستیان بە سەردا تێپەڕێ چونکە سەریان لە گەورەیی مەسەلەکە دەر نەدەکرد. هێندەش پەیوەندییان بە ڕووداوەکانەوە نەبوو تا سەرنجیان ڕاکێشن. تێنەگەیشتنیان هۆی داناییان بوو. هەموو شتێکیان پێ قووت دەدرا و ئازاریشیان پێ نەدەگەیشت. بەڵام قووتدراو لێی کەل نەدەبوو. ڕێک وەک ناوکەی ڕەقی هزر نەکراو کە بە ساغی لە بەدەنی پەلەوەرەوە بێتە دەرێ، وەک خۆی دەما.

## ٦

ئاخرێکەی ڕووی دا. ئاخرێکەی پەیامی چاوەڕوانکراو گەیشت. دەتگوت وینستۆن، هەموو تەمەنی چاوەڕوانی ئەو ڕووداوەیە.

بە کۆریدۆرە درێژەکەی وەزارەتدا دەڕۆیی. کە نزیک ئەو جێیە کەوتەوە جولیا پەیامەکەی نابووە مشتی، هەستی کرد یەکێکی لە خۆی زلتری وا بەدواوەیە. ئەو کەسە، هەرکەسێ بێ، نەرمە کۆخەیەکی بۆ کرد و پێ دەچوو بۆ کردنەوەی دەرگای قسانی بێ. وینستۆن لە جێی خۆی وێستا و ئاوڕێکی دایەوە. ئۆبراین بوو. ئاخرێکەی ڕوو بە ڕووی یەک وێستان و دەتگوت تاکە چارەسەر و دەربازبوونی وینستۆن ڕاکردنە. دڵی گرمەی دەهات و لەوە بوو زمانی ببەسترێ. بەڵام ئۆبراین بە کاوەخۆ هاتە پێشێ و بە جۆرێ دەستی خستە سەر بازووی، کە شان بە شانی یەکەوە ڕێ بکەن. بە باوەڕ بە خۆبوونێکی تایبەتییەوە کە ئەوی لە زۆربەی ئەندامانی ناوەندی حیزب جودا دەکردەوە، سەری قسەی گرتە دەست و گوتی :

– چاوەڕوانی دەرفەتێ بووم کە قسەت لەگەڵدا بکەم. پێرێ، گوتارێکی تۆم لە تایمزدا خوێندەوە کە بە (گوتەی نوێ) نووسیوتە. بەڕاستی زانستانە سەر لە گوتەی نوێ دەردەکەی، وا نییە؟. وینستۆن هاتبۆوە سەرخۆ. گوتی:

– زانستانە نا. من تەنها ئارەزوو لە نووسین دەکەم و هیچی دی. نووسین پیشەم نییە. هەرگیز خەریکی ئەو زمانەش نەبووم.

– بەڵام وەستایانە پێی دەنووسیت. ئەوە ڕای منە. دەربارەی ئەم مەسەلەیە لەگەڵ برادەرێکی خۆتدا دوام کە سەری لەم مەسەلانە دەردەچێ. ئەویش هەر پێی وابوو. ئێستا ناوەکەیم بیر نییە.

دیسان دڵی وینستۆن تەپپەی بە ئازاری لێ هەستا. ناوەلەبیرکراوەکە دیاردی بوو بۆ سایم و بڕایەوە. بەڵام سایم نەک هەر مردبوو، بەڵکو ناویشی لە سەر لاپەڕەی ڕۆژگار سڕدرابۆوە و ببوو بە نەبوو. هەموو جۆرە باسکردنێکی، باسی سەر بوو. دەبێ قسەکەی ئۆبراین پەیامێکی ڕەمزیی بێ. دەبێ کۆدێکی ئاماژەکردن بێ. سایم، بە تاوانی هیچ و پووچی خۆی وینستۆنیشی تووش کرد. هێواش هێواش لە سەر ڕۆیشتنی خۆیان بەردەوام بوون. ئۆبراین لە پڕێکدا وێستا. وەک ئەوەی خۆی چەک بکا، کە هەمیشە لەگەڵ ڕێکخستنی چاویلکەکەیدا پێوە دیار بوو، چاویلکەکەی لە سەر لووتی ڕێکخست. ئاوها



لە سەر قسەی خۆی ڕۆیی:– ئەوی کە مەبەستمە پێتی بڵێم ئەوەیە کە لە گوتارەکەدا دوو زاراوەی سڕدراوەت بەکار هێناون کە بەم دواییە لابراوون. دەیەم چاپی فەرهەنگی گوتەی نوێت دیوە ؟.

– نەخێر. نەمدەزانی چاپ کراوە. ئێستاش لە بەشی ئەرشیف چاپی نۆیەم بەکار دێنین.

– باوەڕ ناکەم چاپی دەیەم تا چەند مانگێکی دی بڵاو بکرێتەوە. تەنها چەند دانەیەکی، وەک نموونە لێ بڵاو بۆتەوە. بەخۆم یەکێکم هەیە. ڕەنگە حەز بکەی بیبینیت.

وینستۆن کە زوو لە مەبەستی حاڵیی بوو گوتی: – بەڵێ، بێگومان.

– بە ڕاستی هێندێ لە گۆڕانکارییەکانی داهێنانەن. بە تایبەتی ژمارەی (کردار)ەکانی... پێم وایە ئەو لایەنەیت بە دڵ بێ. دەتەوێ بە یەکێکدا بۆتی بنێرم؟ بەڵام داخەکەم کاری لەو بابەتانەم بیر دەچێ. دەبێ خۆت پێت نەکرێ بێیتە ئەپارتمانەکەمان و لێمی وەرگری؟. ڕاوێستە، باشترە ناونیشانەکەت بۆ بنووسم.

بەرانبەر تەلەسکرینێ وێستابوو. ئۆبراین دەستی بە گیرفانیدا کرد و دەفتەرێکی بچووکی چەرمتێگیراو و قەڵەمێکی زێڕینی دەرهێنان. بە شێوەیەک وێستا، لە تەلەسکرینەکەوە هەرچیی دەنووسی دەخوێندرایەوە. ناونیشانی ماڵەکەی نووسی و وێیدا. گوتی:

– ئێواران لە ماڵەوەم. ئەگەر لە ماڵیشەوە نەبووم خزمەکارەکەم وێت دەدا.

ئەوەی گوت و وینستۆنی بە لەتە کاغەزەکەوە، کە پێی نەدەویست حەشاری دا، جێ هێشت. وینستۆن نووسراوی سەر کاغەزەکەی لەبەر کرد و دوایی، لەگەڵ هێندێ قاقەزی تردا هەواڵەی چاڵی خەیاڵی کرد.

ئەوپەڕی چەند دەقیقەیەک پێکەوە دوا بوون. ئەو ڕووداوە یەک واتا پتری نەبوو. بیانوویەک بوو بۆ ئەوەی وینستۆن ماڵەکەی پێ بزانێ. خۆ هەر دەبوو فێڵێکی وا ساز بکا. ئەگەر نا، مەحاڵ بوو هەروا ڕاستەوخۆ ماڵی خەڵکی پێ بزاندرێ. چ کەتەلۆکیش نەبوو ناونیشانی تێدا بێ. وەک ئەوە بوو ئۆبراین پێی بڵێ: " کاکی خۆم ئەگەر ویستت چاوت پێم کەوێ، ئەوەتا لێرەم". دوور نییە پەیامێکی شاردراوەش لە ناو فەرهەنگەکەدا بێ. وینستۆن، بە لای کەمەوە لە یەک شتێ دڵنیا بوو: ئەوەی لە خەونیدا دیبووی ڕاست بوو و زۆری نەمابوو وەدیی بێ.

دەیزانی درەنگ یا زوو، فەرمانی ئۆبراین بەجێ دەگەیەنێ. سبەی – یا پاش ماوەیەکی

تر – دڵنییا نەبوو. ئەوەی رووی دەدا تیفتیفەی کارێ بوو کە چەند ساڵ بوو دەستی پێ کردبوو. مەسەلەکە، لە بیرکردنەوەوە ببوو بە وشە، لە وشەشەوە، ئەوا دەبێتە کار. دەبێ دواهەنگاو لە وەزارەتی ئەویندا بنرێ. لەوەیان دڵنیا بوو. ئەنجام لە هەناوی سەرەتادا بوو. بەڵام تۆقێنەریش بوو: لە تامکردنی مەرگ دەچوو. وەک ئەوەبوو بە پلەی کەمتر لە ژیاندا بیت. تەنانەت ئەو دەمەی کە لەگەڵ ئۆبرایندا دەدوا، هەستێکی سارد و لەرزهێنەری تێدا بوو. هەستی دەکرد پێی ناوەتە ناو گۆڕێکی شێدارەوە. تازە، کار لە کار ترازابوو و دەیزانی گۆڕ، بە زاری کراوەوە چاوەڕوانە.



## ٧

وینستۆن بە چاوی تەڕەوە وەئاگا هاتبووەوە. جولیا، بە دەم خەوەوە، بەرەو رووی ئەم وەرچەرخا و شتێکی گوت. ڕەنگە گوتبێتی: "مەسەلە چییە؟."

وینستۆن گوتی :" لە خەونمدا دیت..." و قسەکەی بڕی. لەوە ئاڵۆزتر بوو لە گوتن بێ. خودی خەونەکە و ئەو یادگاریانەی کە پەیوەندییان پێوە بوو، دوای وەئاگاهاتنەوەی چەکەرەیان کرد.

بە چاوی داخراوەوە، لە سەر پشت پاڵ کەوت و لە دەریای یادی خەونەکەیدا نقوم بوو. خەونێکی بەر فراوان و ڕۆشن بوو؛ وەک کێڵگەی دوای بارانی هاوینان، لە بەردەمیدا ڕادەکشا و هەموو شتێ، خۆی لە دیوی ناوەوەی شووشەیەکی بلووریندا دەنواند بەڵام رووی شووشەکە قوببەی ئاسمان بوو و هەموو شتێکی ناوی،لە بەر رووناکییەکی بێگەرد و نەرمدا کە ڕێی بێ بڕانەوەی تێدا دەبیندرا، مەلەی دەکرد. خەونەکەی دەدایە بەر زەین (لە ڕاستیدا، هەموو خەونەکە لە یەک واتادا خۆی دەنواند – بزواندنی بازوو بوو و دایکی ئەنجامی دابوو. دواییش، دوای سیی ساڵ لە فلیمە هەواڵیەکەدا کە دیبووی، ژنە جوولەکەیەک بە هەمان شێوە، هەوڵی دەدا منداڵەکەی لە فیشەکی کۆپتەر بپارێزێ. گوتی: – دەزانی هەتا ئێستا وامدەزانی من دایکی خۆمم کوشتووە؟.

جولیای خەواڵوو گوتی : "بۆ کوشتووتە؟."

– ڕاستەوخۆ نا.

لە خەونەکەیدا، دوادیداری دایکی بینی. دوای واداربوونەوەش بە چەند چرکەیەک، هێندێ ڕووداوی بچووکی وەک پەڕاوێزیشی بیر کەوتنەوە. یادگارییەک بوو کە ساڵەهای ساڵ خۆی لە هۆشیدا مات دابوو. لە مێژووەکەی دڵنییا نەبوو بەڵام ئەو دەمە، تەمەنی لە ١٠ تا ١٢ ساڵ پتر نەدەبوو.

ماوەیەک بوو باوکی ون ببوو. نەیدەزانی چ زەمانێ بوو. بارودۆخی نائارامی ئەو دەمەی باشتر لەبیر بوو. هێرشی عاسمانی بەردەوام و کونەتەیارەی ناو وێستگەی قەتاری ژێر زەوی و وێرانەی هەموو جێ و ڕاگەیاندنی بێ سەروبەر کە لە هەموو جێیەک هەڵواسرابوون و بەتالیۆنی لاوان بە بەرگی یەک تەرحەوە و سەرەی دوور و درێژی بەردەم نانەواخانەکان و دەنگی پچڕپچڕی ڕەشاش – لە سەرووی هەمووانیشەوە، بێ خواردنیی لە بیر بوون.

بیری کەوتەوە کە دوانیوەڕوانی دوور و درێژ، لەگەڵ منداڵانی تردا، زڕوزبڵ و پاشماوەی فڕە دراو، لە گەڵا کەلەم و توێکڵە پەتاتە دەگەڕان. هێندێ جار، کەرتە نانی قەراغ سووتاویشیان چنگ دەکەوت و بە وریایی هەڵیاندەگرت. چاوەڕوانی ئەو لۆرییانەیان لە جێی دیاریکراودا دەکرد کە ئالفی ئاژەڵیان بار دەکرد و لەگەڵ تاسەکردندا کەپەک و کونجی ڕۆن لێگیراویان لێ دەڕژا.

کە باوکی مرد، دایکی نە سەرسوڕمانی کتوپڕی پێوە دیار بوو نە پەژارەیەکی گەورە. بەڵام یەکسەر گۆڕا. دەتگوت گیانی تێدا نەماوە. لە وینستۆنیش پەنهان نەبوو کە چاوەڕوانی ڕووداوێکی چارەنووسساز بوو و لە پێشهاتنی دڵنیا و بەئاگا بوو. هەرچی پێویست بوایە ئەنجامی دەدا - خواردنی ساز دەکرد، کولّی دەکرد، پینەی دەکرد، جێی ڕادەخست، گسکی دەدا، خۆڵەمێشی بەتاڵ دەکرد و - بە کاوەخۆ و بێ ئەوەی کارێکی ناپێویست بکا - هەمووی ئەنجام دەدان. دەتگوت قەرەقۆزی وازییە و لە خۆڕا دەبزوێ. پاشان، جەستە گەورەکەی، لەخۆڕا دەگەڕایەوە سەر باری ئارامی و نەبزووتن. هەندێ جار ماوەی چەند سەعاتێ لە سەر قەرەوێڵەکە بە بێ دەنگی دادەنیشت و شیری دەدایە کچە دوو- سێ ساڵانەکەی کە خەلقەندەیەکی بچکۆلەی بێ دەنگ بوو و لە بەر لاوازی بە مەیموون دەچوو. جاروبارێ باوەشی بە وینستۆندا دەکرد و بێ ئەوەی هیچ بڵێ، بە خۆیەوە دەنووساند. وینستۆن، هەرچەندە منداڵ بوو و هەمیشە سەرقاڵ بوو، بەڵام دەیزانی شتێ کە هەرگیز باس نەکراوە، لە دەمەدەمی قەوماندایە.

ژوورەکەی بیر کەوتەوە. ژوورێکی تاریک و بۆنناخۆش. تەختەخەوەکە کە تا نزیکەی نیوەی ژوورەکەی گرتبۆوە، چەرچەفێکی سپی بە سەردا درابوو. تەباخێکی غاز و ڕەفتێک کە زەخیرەی لە سەر بوو بەرانبەر ئاگردانەکە بوون. کۆلێکی بچووکیش لای قاڵدرمەکانەوە بوو و چەند ماڵێک بەکاریان دەهێنا. جەستەی پەیکەرئاسای دایکی بیرکەوتەوە کە بە سەر تەباخەکەدا چەمابۆوە و چێشتی تێک دەدا. لە هەموو شتێ زیاتر برسێتی بەردەوامی خۆی و (شەڕکردنی لە سەر خواردن) وەبیر دەهات. هەموو دەمێ بۆڵەی دەهات و داوای خواردنی زیاتری دەکرد. دەیقیژاند (تەنانەت دەنگی خۆشی بیر دەهاتەوە کە تا ڕادەیەک نێر ببوو و جاروبارێ وەک تۆپ دەتەقییەوە)، یا دەپاڕایەوە تا بەشەخواردنی زیاتری بەرکەوێ. خواردنی زیادی بە مافی خۆی دەزانی و پێی وابوو دەبێ کوڕ بەشی زیاتر بێ. بەڵام بە زیادکردنی بەشەخواردن، داواکاریشی زیادی دەکرد. لە سەر خواردن، دایکی بیری دەخستەوە کە نابێ وا خۆپەرست بێ و دەبێ بیر لە خوشکەکەشی بکاتەوە کە نەخۆشە و



خۆراکی پێ دەوێ. کەڵکی نەبوو. کە دایکی لە تێکردنی خواردن دەبۆوە، ئەم دەیقیژاند و هەوڵی دەدا مەنجەڵ وکەوچک لەدەستی دەربهێنێ. تووڕە دەبوو. هێندێکی لە بەشی خوشکەکەشی بۆ خۆی تێدەکرد. دەیزانی دوو نەفەر لە برسان بە هیلاک دەچن بەڵام خۆی ڕاگیر نەدەکرد. تەنانەت بە مافی خۆشی دەزانی وا بکا. برسێتی زگی، ڕێبازی بۆ ڕەفتاری دادەنا. ئەگەر دایکی چاوی لێ خافڵ بوایە خۆی دەگەیاندە خواردنی سەر ڕەفتەکەش.

ڕۆژێکیان شوکلاد دابەش کرا. چەندین حەفتە یا چەندین مانگ بوو دابەش نەکرابوو. ئەو کەرتە شوکلادە بچووک و ئازیزەی باش لە یاد بوو. کەرتێکی پەنجا گرامیی بوو (ئەو کاتە بە ئۆنس حسێب دەکرا) بۆ سێ کەس. دیارە دەبوو بکرێتە سێ بەشی وەک یەکەوە. وینستۆن، وەک ئەوەی گوێی لە دەنگی کەسێکی دی بێ نەک دەنگی خۆی، کتوپڕ گوێی لە خۆی بوو کە داوای هەمووی دەکرد. دایکی پێی گوت کە نابێ چاوچنۆک بێ. شەڕێکی دوور و درێژی بە قیژەقیژ و تووڕەبوون و فرمێسک و هەنسکی قەوماند. خوشکە لاوازەکەشی کە وەک بەچکە مەیموون چنگی بە دایکیدا کردبوو، بە چاوی درشت و خەماوییەوە تێی ڕامابوو. لە ئەنجامدا سێ چارەکی شوکلادەکەی دایە وینستۆن و چارەکێکیشی دا بە کیژەکەی. منداڵەکە، وەریگرت و تەماشایەکی کرد. پێ دەچوو نەزانێ چییە. تاوێ وینستۆن بە دیارییەوە وێستا و سەرنجی دا. لە پڕێکدا، لە دەستی دەرهێنا و بە دەرگاکەدا قووچاندی.

دایکی، لە دوایەوە لێی کرد بە هەرا: وینستۆن، وینستۆن!. بگەڕێوە! شوکلادی خوشکەکەت بدەوە.

لە جێی خۆیدا وێستا، بەڵام نەدەگەڕایەوە. چاوی خەمباری دایکی، بە ڕووی ئەمەوە گیرسابۆوە. تا ئەو دەمەش کە ڕووداوەکانی بیر دەکەوتنەوە، نەیدەزانی چ کارەساتێ لە قەوماندا بوو. خوشکەکەی کە عەقڵی پێدا دەشکا لە شتێ بێبەش کراوە، نووزەنووزی بوو. دایکی باوەشی پێدا کردبوو و بە سینگی خۆیەوەی نووساندبوو. ئەو لەئامێزگرتنە، وینستۆنی تێدەگەیاند کە خوشکەکەی لە سەرەمەرگدایە. وەرچەرخایەوە و بە قاڵدرمەکاندا داگەڕا و شوکلاتەکە، بە دەستیەوە دەنووسا.

ئیدی دوای ئەوە، دایکی نەدی. دوای لرفکردنی شوکلاتەکە هەستی بە شەرمەزاری دەکرد و ماوەی چەند سەعاتێ بە شەقمەکاندا خولایەوە تا برسێتی بەرەو ماڵەوەی کردەوە. کە هاتەوە، دایکی ون ببوو. شتی وا، لەو سەردەمەدا ئاسایی بوو. دایکی و خوشکەکەی

نەبێ، هەموو شتێ لە جێی خۆی بوو. جلی لەگەڵ خۆیدا نەبردبوو. تەنانەت پاڵتۆکەشی هەر لەوێ بوو. قەت لە مەرگی دایکی دڵنیا نەبوو. ڕێی تێ دەچوو ڕەوانەی ئۆردوگای بێگاری کرابێ. بەڵام کێ دەڵێ خوشکەکەی، وەک خۆی، بۆ هەتیوخانەیەک نەبراوە کە (پەروەردگە)ی پێ دەگوترا و لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆدا دانرا. لەوانەشە لەگەڵ دایکیدا برابێتە ئۆردوگا یا بۆ مردن، بۆ جێیەکی تریان بردبن.

خەون و خەیاڵ لە هەستیدا هەر دەدرەوشانەوە. جۆری لە باوەشگرتنەکە کە شێوەی پارێزگاریکردنی پێوە بوو، پێ دەچوو هەموو لێکدانەوەیەکی خەونەکە بێ. بیری بۆ خەونێکی دی گەڕایەوە کە بەر لە دوو مانگ دیبووی. ڕێک وەک ئەو دەمەی دی کە دایکی بە ڕۆبە سپییەکەیەوە، لە سەر تەختە شکاوەکە دانیشتبوو و منداڵەکەی لە ئامێز بوو. وەک ئەو کاتەی کە لە ناو کەشتییەکە، نقوم دەبوون و دەقیقە بە دەقیقە ڕۆدەچوون، بەڵام هەر لێوەی دیار بوون و لە ناو ئاوە تاریکەکەوە تەماشایان دەکرد.

وینستۆن، باسی ونبوونی دایکی بۆ جولیا گێڕایەوە. ئەویش بێ ئەوەی تەماشای بکا، خۆی وەرچەرخاند و جێیەکەی خۆی ڕەحەتتر کرد. ئەوجا بە ئالۆزییەکەوە گوتی:

– پێ دەچێ ئەو دەمە جانەوەرێکی موزبڕ بووبی. هەموو منداڵان موزبڕن.

– وایە. بەڵام ئەوەی کە دەیگەیەنێ...

هەناسەی جولیا ئەوەی دەردەخست کە خەوی لێ کەوتبێتەوە. وینستۆن حەزی دەکرد لە سەر باسی دایکی بڕوا. دوای ئەوەی ئەوانەی دەربارەی دایکی بیرکەوتنەوە، پێی وانەبوو دایکی ژنێکی تایبەتی یا زیرەک بووبێ. بەڵام خاوەنی جۆرە پاکژی و ڕێزێ بوو ئەوەش لە بەر ئەوەی پێوەری ئەو تایبەتی بوو بە خۆیەوە. هەستەکانی هی خۆی بوون و لە دەرەوەڕا نەدەگۆڕان. پێی وانەبوو هەڵسوکەوتی بێ بەرهەم، واتای نەبێ. ئەگەر یەکێ یەکێکی تری خۆش بوێ و هیچی نەبێ وێی دا، هەر نەبێ سۆزی دەداتێ. کە پارچە شوکلادەکە نەما، دایکی منداڵەکەی بە خۆیەوە دەنووساند. ئەو کارەی جێی هیچی نەدەگرتەوە، شوکلادی تری پێ پەیدا نەدەکرا، پێشی بە مەرگی منداڵەکە و خۆی نەدەگرت، بەڵام ئەنجامەکەی بە لاوە سروشتی بوو. ژنە پەنابەرەکەی ناو کەشتییەکەش بە باسکی، منداڵەکەی لە فیشەکی کۆپتەر دەپاراست و هێندەی قاقەزێکیش زیاتر کاریگەر نەبوو. کارەساتی ڕەفتاری حیزب لەوەدا بوو کە باوەڕت پێ بهێنێ هەموو بیرکردنەوە و هەستێکی ڕووت بێ کەڵکە و لە هەمان کاتدا گشت توانایەکت ئاراستەی جیهانی ماتریالی بکات. کە دەکەوتیتە بەر چنگی حیزب، ئیدی هەستت بکردبا یا نەکردبا، کارێکت بکردبا یا لە کردنی



بەرهەڵستیت کردبا جیاوازی نەبوو. هەرچۆنێ بوایە دەفەوتایت و شوێنەواری خۆت و کردارت نەدەمایەوە و لە ڕەوتی مێژوو دوور دەکەوتیتەوە. ئەمانە لە دوو وەچەی پێشوودا گرینگییان پێ نەدەدرا چونکە نیازی گۆڕینی مێژوویان نەبوو. خەڵکی، بێ ئەوەی بیریشی لێ بکەنەوە، بە سۆزی تایبەتی بەڕێوە دەچوون. ئەوەی کە گرینگ بوو پەیوەندی نێوان تاکە کەسەکان بوو. نەریتی بێ هوودە، لە باوەشگرتن، فرمێسک و ئەو جۆرە قسانەی کە دەبوو بەو کەسانە بگوترێن کە لە سەرەمەرگدا بوون، ئا ئەوانە نرخی خۆیان هەبوو. کتوپڕ بیری کەوتەوە کە هێشتا کرێکاران ئەو جۆرە نەریتانەیان تێدا ماوە. دڵسۆزی حیزب یا وڵات یا بیر و باوەڕ نەبوون، دڵسۆزی یەکدی بوون. بۆ یەکەم کەڕەت، لە گشت تەمەنیدا، بەرانبەر کرێکاران هەستی بە بێزاری نەکرد و بە لەشکرێکی سڕبووی دانان کە ڕۆژێ لە ڕۆژان زیندوو دەبێتەوە و دنیا دەگرێتەوە. کرێکاران، وەک بنیادەم مابوونەوە. ناخیان وشک نەبۆوە. بە هەست و سۆزی سەرەتاییەوە لکابوون. دەبوو وینستۆن لە نووکەوە تێ هەڵچێ و خۆی ماندوو بکا تا فێر بێ. کە بیری لەوانە دەکردەوە، بێ ئەوەی خۆی مەبەستی بێ، ئەو دەستە بڕاوەی سەر شۆستەکەی هاتەوە یاد کە پێش چەند حەفتەیەک وەک گەڵاکەلەم، بە نووکە شەقێک هاویشتیە چڵکاوەکەوە. بە دەنگێکی بڵند گوتی:

– کرێکاران مرۆڤن، ئێمە مرۆڤ نین.

جولیا کە تازە وەئاگا هاتبۆوە پرسی: – بۆ نا؟.

وینستۆن تاوێ ڕاما ئەوسا گوتی:

– بیرت لەوە نەکردۆتەوە کە تا زووە لێرە دەرکەوین و جارێکی دی یەکتر نەبینینەوە؟.

– بەڵێ عەزیزم. زۆر جار بیرم لێ کردۆتەوە بەڵام نامەوێ وا بکەم.

– تا ئێستا بەختمان باشی هێناوە بەڵام بەردەوام نابێ. تۆ هێشتا گەنجیت. هەر وا بێ وەی نابیت. ئەگەر خۆت لە پیاوی وەکی من دوور بگریت، لەوەیە پەنجاساڵی دی بژیت.

– نا. بیرم لە هەموو جەمسەرەکان کردۆتەوە. ئەوەی تۆ دەیکەی دەمەوێ منیش بیکەم. زۆر ڕەشبین مەبە. بۆ مانەوەی خۆم، تا ڕادەیەک لێزانم.

– ڕەنگە بتوانین شەش مانگی دی – ساڵێکی دی، پێکەوە بین. مەعلووم نییە. بەڵام دڵنیام کە لە ئەنجامدا لێک دادەبڕێین. دەزانی ئەو دەمە چەندە تەنها دەبین؟. هەر هێندەی کەوتینە داویانەوە، مەودای ئەوەمان نابێ کارێک بۆ یەکدی بکەین. ئەگەر من دان بە تاواندا بنێم تۆ تیرباران دەکرێی. هەرچی بکەم یا نەیکەم، هەرچی بڵێم یا نەیڵێم، ئەگەر

چ نهێنییەکیش نەدرکێنم، پێنج دەقیقە مەرگی تۆم پێ دوا ناخرێ. هیچمان نامانەوێ بزانین ئەوی ترمان ماوە یا مردووە. توانای هیچ شتێکمان نابێ. گرینگ ئەوەیە یەکتر دەسخەڕۆ نەکەین و یەکتر بە دەستەوە نەدەین کە ئەمەش هیچ ناگۆڕێ.

– ئەگەر مەبەستت دانپێدانانە، دەیکەین. هەموو کەسێ دەیکا. دەرفەتت نامێنێ. ئازارت دەدەن.

– مەبەستم دانپێدانان نییە. دانپێدانان، بەدەستەوەدان نییە. ئەوەی کە دەیکەی یا دەیلێیی ڕۆڵی خۆی هەیە. کەی توانییان ئەوینی تۆم تێدا نەهێڵن، ئەو کاتە بە ڕاستی تۆم بە دەستەوە داوە.

جولیا کەمێ بیری لەو گوتەیە کردەوە. پاشان گوتی:

– ئەوەیان پێ ناکرێ. هەموو شتێکیان پێ دەکرێ ئەوە نەبێ. دەتوانن ناچاری گوتنی هەموو شتێکت بکەن بەڵام ناتوانن وات لێ بکەن باوەڕ بە ڕاستبونی قسەکەت بهێنی. ڕێیان نییە بچنە ناو ناختەوە.

وینستۆن بە جۆرە هومێدێکەوە گوتی: – نا– نا. بە تەواوی ڕاستە. ڕێی چوونە ژوورەوەی ناو دەروونیان نییە. ئەگەر هەست بکەی، بە مرۆڤیی مانەوەت نرخی خۆی هەیە. هەر هیچت پێ نەکرێ، ئەوا هەر بەوە ئەوانت بەزاندووە.

بیری لە تەلەسکرین و گوێی هەردەم بەئاگای تەلەسکرین کردەوە. پێیان دەکرا شەو و ڕۆژ چاودێریت بکەن. بەڵام ئەگەر ئاگات لە هۆشی خۆت بوایە پێت دەکرا فریویان بدەی. نەیانتوانیبوو بە تەواوی پەی بە شێوەی بیرکرنەوەت بەرن. دوور نەبوو ئەو کاتەی کە دەسگیر دەکرای، هێندێ لەو مەسەلەیەت لە دەست بچێ. کەس نەیدەزانی ناوەوەی وەزارەتی ئەوین چۆنە و لەوێ چ ڕوو دەدا. بەڵام دەکرا بخرێتە بەر مەزەندە: ئەشکەنجە، بابەتی هۆش سرکردن، ئامێری وردکار کە ڕادەی کاردانەوەی عەسەبیی دەپێوێ، لە بەرەوە تواندنەوە بە هۆی نەخەوتن و لێکۆڵینەوەی بەردەوامەوە. بە پێی هەموو بۆچوونێک، هیچ نهێنییەک بە داپۆشراوی نامێنێ. بە لێکۆڵینەوە پەی بە ڕازەکان دەبرێ. بەڵام ئەگەر ئارەزووی مانەوە – کە ویستی مرۆڤبوونە – نەبێ چ جیاوازییەک لە ئەنجامەکەیدا دەمێنێ؟. هەستی خەڵکیان پێ نەدەگۆڕا: پیاو بە خۆی ئەوەی پێ نەدەکرا و بەخۆی هەستی خۆی پێ نەدەگۆڕدرا. دەیانتوانی پەی بە ڕەفتار و گوفتار و بیرکردنەوەت بەرن، بەڵام بنی بنەوە، ناو دیوارە نهێنییەکانی هۆش، نەک ئەوان، بنیادەم بەخۆشی نایگاتێ.



## ٨

ئەنجامی دا. ئاخرێکەی ئەنجامی دا.

ئەو ژوورەی کە لێی بوون، درێژۆکە و ڕووناک بوو. تەلەسکرینەکە بە تەواوی کز کرابوو و بلّمەبلّمی دەهات. کە پێت بە ڕایەخە ئەستوورە شینەکەدا دەنا، دەتگوت بە سەر ئاورێشمدا دەڕۆی. ئۆبراین، لەوسەری ژوورەکە، لە بەر گلۆپی لامپایەکی سەوزدا دانیشتبوو و ئەملاولای، قاقەزی بە سەر یەکەوە کۆمەڵکراو بوو. کە وینستۆن و جولیا لەگەڵ خزمەکارەکەدا وەژوور کەوتن، ئەو، زەحمەتی تەماشاکردنیانی بە خۆی نەدا.

وینستۆن، دڵی بە جۆرێ لێی دەدا کە لە باسی مەسەلەکە دوودڵی بکا. "ئەنجامامان دا، ئاخرێکەی ئەنجامامان دا"، تاکە شتێ بوو کە بیری لێ دەکردەوە. هاتنیان بۆ ئەو جێیە، هەر لە بنەوە کارێکی عەجوولانە بوو و چاوپێکەوتنەکەش هەرزەکارانە بوو. هەرچەندە لە دوو ڕێگەی جیاوازەوە هاتبوون و هەر لە بەر دەرگای ماڵەکەی ئۆبراین پێک گەیشتن، بەڵام هاتن بۆ ئەو جێیە، دڵێکی قایمی دەویست. بە ڕێکەوتی یەکجار دەگمەن نەبوایە، کەس ماڵی ئەندامانی ناوەندی نەدەدی و ڕێشیان نەدەکەوتە ئەو گەڕەکەی کە ئەوانی لێ دەژیان. هەوای ناو بینا فەڕاحە ڕازاوەکە، بۆنی خواردنی نائاشنا و تووتنی نایابی لێ دەهات. ئاسانسۆرەکان، بێ دەنگ و خێرا هەڵدەگەڕان و دادەگەڕان. خزمەکارەکان بە چاکەتی سپییەوە ئەمسەر و ئەوسەریان دەکرد – هەموو شتێ لە بزواندا بوو. هەرچەندە بۆ ئەو هاتنە بیانوویەکی چاکی هەبوو بەڵام هەنگاو دوای هەنگاو، ترس سواری سەری دەبوو. ئەگەر نیگابانی چاکەتڕەش بێت و داوای پێناسەی لێ بکا و دوایی وەدەری نێ!. بەڵام خزمەکارەکە، بە بێ یەک و دوو مەودای چوونەژوورەوەی دابوون. پیاوێکی کورتەبنەی ئەسمەری چاکەت سپی بوو. سیمای، وەک سیمای چینیەکان، لووس و بێ لۆچ بوو. ئەو ڕێڕەوەی کە پێشانی دان، ڕایەخێکی نەرمی لێ ڕاخرابوو. قاقەزی دیوارەکان شیریی بوون و تەختەکانیش سپی. هەموو جێیەک خاوێن بوو و لە هەمان کاتیشدا بە سام بوو. وینستۆن، بیری نەدەهات هەرگیز دیواری کۆریدۆری دیبێ کە بە چڵکی جەستەی بنیادەم پیس نەبووبێ.

ئۆبراین، قاقەزێکی بە دەستەوە بوو و پێ دەچوو بە وردی بیخوێنێتەوە. سەری خوار کردبۆوە و سەر لووتی دیار بوو. ڕوخساری سامناک و سەرنجڕاکێش بوو. ماوەی بیست چرکەیەک نەبزووت. پاشان بیژە و بنووسەی هێنایە بەردەمی و ئەم ڕاگەیاندنەی تفاندەوە :

"ژمارە یەک فاریزە پێنج فاریزە حەوت چاکن فاریزە پێشنیاری شاش دووبەرابەر کۆی گاڵتەجاڕ تاوانی بیر دەسڕدرێتەوە فاریزە کارگەی پێش پێشکەوتن هەڵسەنگاندنی کۆی خەرج مەکینە نوختە تەواو".

بە لەخۆڕازیبوونەوە، لە سەر کورسیەکە هەستاو بە سەر ڕایەخە نەرمەکەدا بەرەو لایان هات. پێ دەچوو لە گەڵ تەواوبوونی زاراوەکانی گوتەی نوێدا، هەوای ڕەسمییات بەریدابێ. بەڵام ڕوخساری لە جاران گرژتر بوو. دەتگوت هاتنی ئەمانی پێ خۆش نییە. ئەو ترسەی کە لە وینستۆن نیشتبوو، کتوپڕ لێی بوو بە شڵەژان. دوور نەبوو هەڵەیەکی کوشندەی کردبێ. ئاخر چ بەڵگەیەکی بە دەستەوە بوو کە ئۆبراین بەرهەڵستکارێکی سیاسییە؟. تروسکاییەکی سەیرکردنەکەی و تێبینی دوو واتا نەبێ هیچی دی نەبوو: ئەوانەی لێ دەرچێ، تەنها خەیاڵی شاردراوەی خۆی سازی دابوو. نەشیدەتوانی وەرگرتنی فەرهەنگەکە بکاتە بیانوو چونکە ئەو کارە هاتنی جولیای نەدەویست. کە ئۆبراین بە بەردەم تەلەسکرینەکەدا ڕەت بوو، دەتگوت شتێکی بیر کەوتەوە، ڕاوێستا. گەڕایەوە و پەنجەی نا بە دوگمەیەکی قەد دیوارەکەوە. گیزەگیزێ بەرز بووەوە و ئیدی دەنگەکە بڕا.

وینستۆن، هەرچەندە دەترسا بەڵام نەیتوانی دەمی خۆی بگرێ. گوتی: "دەکوژێتەوە!."

ئۆبراین گوتی: – بەڵێ دەتوانین بیکوژێنینەوە. بۆمان هەیە ئەوە بکەین.

ئیدی ڕووبەڕوویان بوو. جەستە گەورەکەی بە سەر هەردووکیاندا دەشکایەوە. هێشتا سیمای گرژ بوو. لە ڕواڵەتیدا دیار بوو کە چاوەڕوانی ئاخاوتنی وینستۆن بوو. بەڵام دەربارەی چی؟. دوور نەبوو تا ئەو دەمەش بیر لەو مێوانداریە وەڕسکەرە بکاتەوە. کەس هیچی نەدەگوت. دوای کوژاندنەوەی تەلەسکرینەکە، ژوورەکە وەک گۆڕستان کشومات بوو. یەک چرکە کات، ببوو بە زەمانێکی دوور و درێژ. وینستۆن، بە زەحمەت سەیری ئۆبراینی پێ دەکرا. کتوپڕ سیمای مۆنی ئۆبراین گۆڕا. دەتوانی بڵێی بزەی هاتێ. ئۆبراین، بە شێوەی ڕەفتاری تایبەتی خۆی، چاویلکەکەی ڕێک خست و گوتی: – من دەست پێ بکەم یا ئێوە؟.

وینستۆن بە پەلە وەڵامی دایەوە:

– من دەست پێ دەکەم. بە ڕاستی ئەوە کوژاوەتەوە؟.

– بەڵێ هەموو شتێ کوژاوەتەوە. هەر خۆمانین.

– بۆ ئەوە هاتوین کە...



بۆ یەکەم جار هەستی بە لێڵیی مەبەستەکەی خۆی کرد و قسەکەی بڕی. لەوێوە، نەیدەزانی چاوەڕوانی چ یارمەتییەک لە ئۆبراین دەکا و گوتنی هۆی هاتنیشیان هاسان نەبوو. ئەوەی کە دەبوو بیلێ، دەبوو ساکار و پڕ واتا بێ. گوتی:– پێمان وایە جۆرە بەرهەڵستکارییەک لە ئارادا هەیە. جۆرە ڕێکخراوێکی نهێنی دژی حیزب تێدەکۆشێ و جەنابیشت کاری تێدا دەکەی. دەمانەوێ پەیوەندی پێوە بکەین و کاری لەگەڵدا بکەین. باوەڕمان بە (سۆسینگ) نییە. تاوانباری فکرین. زیناش دەکەین. ئەمانە دەڵێم چونکە دەمانەوێ لە ژێر فەرمانی تۆدا بین. ئەگەر هەر جۆرە کارێکت لێمان گەرەک بێ ئامادەین.

جولیا بە عاستەم دەنگێکی لێوە هات، زیقەیەکی بێ دەسەڵاتانە بوو.

بەو هەستەوە کە تازە دەرگای ئاخاوتن کرایەوە، بێدەنگ بوو. ئاوڕێکی دایەوە. ناهەقی نەبوو چونکە خزمەکارە کورتەبنە ئەسمەرەکە، بێ ئەوەی لە دەرگا بدا هاتبوە ژوورێ. وینستۆن، سینییەکی پێ دی کە شووشە و پەرداخی لە سەر بوون. ئۆبراین گوتی: – مارتین لە خۆمانە. مارتین، (مەی)ەکە بێنە ئێرە و مێزەکە بسڕەوە!. کورسی تەواون؟. باشە، کەوابێ دەتوانین دانشین و بە ئاسوودەیی بدوێین. مارتین، کورسییەکیش بۆ خۆت بێنە. باسی کارە. دە دەقیقە واز لە خزمەت بهێنە.

پیاوە کورتەکە، بە ئیسراحەت لێی دانیشت، بەڵام دۆخی خزمەکاریی خۆی پاراستبوو کە شێوەیەکی سەرکەوتوانەی پێ دەدا. وینستۆن بە تیلەی چاو تەماشای دەکرد. پێ دەچوو ئەو کابرایە هەموو تەمەنی خۆی، لە گێڕانی یەک ڕۆڵدا سەرف کردبێ و پێی وا بێ هەر لێی دەرچێ دوچاری مەترسی دەبێ. ئۆبراین، ملی شووشەکەی گرت و پەرداخەکانی لە (شل)ێکی هەناری پڕ کرد و بیرەوەرییەکی نوستووی لە هۆشی وینستۆندا وەئاگا هێنایەوە کە ساڵەها لەوە بەر بە دیوارێکەوە دیتبووی – شووشەیەکی یەکجار گەورەی بە گڵۆپ داڕێژراوی لار، پەرداخێکی پڕ دەکرد. کە لە سەرەوە لێی ڕادەمای، مەیلەو ڕەش خۆی دەنواند. بەڵام لە شووشەکەدا وەک یاقووت خۆی دەنواند. بۆنی ترشاوێکی شیرینی لێ دەهات. چاوی لێ بوو جولیا بە سەرسامییەوە پەرداخەکەی خۆی هەڵگرت و بۆنێکی کرد.

ئۆبراین، بە بزەیەکی شاردراوەوە گوت: – بەمە دەگوترێ شەراب. بێگومان شتێکتان لە سەری خوێندۆتەوە. داخەکەم ناگاتە دەستی ئەندامە ئاساییەکانی حیزب"، سیمای گەورەیی بە خۆی دا و پەرداخەکەی هەڵگرت: "پێم وایە یەکەم پێکمان لە چاوی ڕێبەرمان بنۆشین: بە سەلامەتی عەمانۆئێل گۆڵدستەین."

وینستۆن بە گەرمییەوە پێکەکەی هەڵگرت. شەراب شتێ بوو کە لە سەری خوێندبۆوە و خەونی زۆری پێوە دیبوو. وەک پارچە بلوورەکە وشیعرە نیوە چڵەکانی مستەر چارینگتۆن، شەرابیش پەیوەندی بە ڕابردووی لەناوچووی ڕۆمانتیکانەوە هەبوو. ئەو ڕابردووەی کە لە خەیاڵە نهێنییەکانیدا خۆشی دەویستن. لە بەر هەر هۆیەک بووبێ، وەک شتێکی شیرین بیری لە شەراب دەکردەوە. شیرین وەک شاتوو، کاریگەرێتیشی دەمودەس بێ. کە لێی خواردەوە، خۆی پێ دەسخەڕۆ بوو. ڕاستییەکەشی ئەوە بوو کە دوای ئەو هەموو ساڵی (جن) خواردنەوەیە نەیتوانیبوو لە زاریدا ڕایگرێ و تامی بکا. پەرداخە بەتاڵەکەی دانایەوە و گوتی:" باشە، گۆڵدستەین بوونی هەیە؟."

– بەڵێ بوونی هەیە و زرپ و زیندووە. بەڵام نازانم لە کوێیە.

– ئەی بزوتنەوەی بەرهەڵستکاری؟.هەیە؟.لە داهێنانی پۆلیسی خەیاڵ نییە؟.

– نا. هەیە. ناوی ئەنجومەنی برایەتیمان لێ ناوە. نابێ هەرگیز لەوە زیاتر بزانن کە ئەنجومەنی برایەتی بوونی هەیە و ئێوە سەر بەو ئەنجومەنەن. دوایی دێمەوە سەر ئەو باسە.

تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد و لە سەری ڕۆیی: "بۆ ئەندامانی ناوەندیی حیزبیش ژیریی نییە لە نیو سەعات زیاتر تەلەسکرین بکوژێنێتەوە. نەدەبوو پێکەوە بێن. کە دەڕۆن، بە دوو ڕێی جیاوازدا بڕۆن." ڕووی لە جولیا کرد و گوتی: " هاوڕێ، یەکەم جار تۆ بڕۆ. بیست دەقیقە کاتمان بە دەستەوەیە. وا چاکە بە چەند پرسیارێک دەست پێ بکەم. تا چ ڕادەیەک ئامادەی کارن؟."

وینستۆن وەڵامی دایەوە:" ئەوەی کە لە دەسمان دێ."

ئۆبراین، بەرەو وینستۆن وەرچەرخا. ڕوخساری جولیای لێوە دیار نەما. وای دانابوو کە وینستۆن لە بری ئەویش دەدوێ. ماوەی چەند چرکەیەک پێڵۆکانی داخستن. بە دەنگێکی نەرم و نەوی کەوتە پرسیارکردن:

– ئامادەن ژیانی خۆتان بەخت کەن؟.

– بەڵێ.

– ئامادەن خۆتان بکوژن؟.

– بەڵێ.

– ئامادەن خراپەکاری وا بکەن کە ببێتە هۆی مەرگی سەدان کەسی بێتاوان؟.

– بەڵێ.



– ئامادەن فێڵ و گزی و فزی بکەن، هۆشی منداڵ بشێوێنن، (موخەددەرات) بڵاو بکەنەوە و ڕێ بۆ فەسادیی و نەخۆشیەکانی خۆش کەن – هەر شتێ کە دەبێتە هۆی لاوازبوونی حیزب بیکەن؟.

– بەڵێ.

– ئامادەن تا مردن، کەسایەتی خۆتان بگۆڕن و – بۆ نموونە – وەک خزمەکار یا کرێکاری کەشتی بژین؟.

– بەڵێ.

– ئامادەن لێک دابڕێن و هەرگیز یەکتر نەبیننەوە؟.

جولیا پەڕییە نێوان قسەکانەوە و گوتی: نەء!.

ماوەیەکی زۆری خایاند تا وینستۆنیش وەڵامی دایەوە. تاوێ توانای قسەکردنی نەما. زمانی لە ناو زاریدا، بە بێدەنگی دەگەڕا. سەرەتا و کۆتایی وەڵامەکەی دەزانی بەڵام جارێکی تر و جارێکی تر پێیدا دەچووەوە. تا وشەکەشی نەگوت نەیزانی چ دەڵێ. لە ئەنجامدا گوتی: "نەء!".

ئۆبراین گوتی: "باش بوو گوتتان. زانینی هەموو شتێ زۆر گرینگە". ڕووی کردە جولیا و بە دەنگێکی کەمێ توندتر گوتی: "دەزانی ئەگەر بشمێنن، ئەو لە سەر شێوەی پیاوێکی دی دەبێ؟. ڕەنگە ناچار بین شێوەی کەسێکی دی وێدەین. ڕەنگی، دەنگی، شێوەی دەستوپلی، ڕەنگی قژی – تەنانەت... ئا، دەنگیشی دەبێ بگۆڕدرێ. تۆ بە خۆشت دەبیتە کەسێکی دی. جەڕاحەکانمان پێیان دەکرێ لەوەت دەرکەن کە بناسرێیتەوە. هێندێ جار، ئەو کارە پێویست دەکا. تەنانەت لەوانەیە جێیەکی بەدەنیش فت کرێ.

وینستۆن، نەیتوانی سەیری سیمای مەنگۆلی مارتین نەکا.چ جێی برینی پێوە دیار نەبوو. بەڵام ئازایانە لە ئۆبراینی دەڕوانی. منجەمنجێکی کرد کە نیشانەی ڕەزامەندی پێوە دیار بوو.

– زۆر باشە، کەوابێ پێک هاتین.

قوتووە جگەرەیەکی زیوین لە سەر مێزەکە بوو. ئۆبراین، فەرمووی لێ کردن و بەخۆشی جگەرەیەکی دەرهێنا. لە جێی خۆی هەستا و بە کاوەخۆ کەوتە هاموشۆ. دەتگوت بە پێوە نەبێ باش ناتوانی بیر کاتەوە. جگەرەکان، جگەرەی نایاب بوون. توندوتۆڵ پێچرابوونەوە و ئاغزیان وەک ئاوریشم نەرم بوو. ئۆبراین، جارێکی تریش سەیری سەعاتەکەی کردەوە و

گوتی: "مارتین چاک وایە بچیتە ژووری چالێنان. چارەکەسەعاتێکی دی تەلەسکرینەکە پێ دەکەم. پێش ئەوەی بڕۆی، باش سەیری ئەم هاوڕێیانە بکە. دوایی دەیانبینیتەوە. ڕەنگە من نەیانبینمەوە."

چاوە ڕەشەکانی کابرا بچکۆلەکە، وەک ئەو دەمەی لە بەر دەرگا تووشیان بوو سەرنجی دان. چ شوێنەوارێکی ئاشنایەتی لە تەماشاکردنەکەیدا نەبوو. دەیویست شێوەیان بخاتە زەینی خۆیەوە، بەڵام پێ نەدەچوو هەست بە هیچ هاوکارییەک بکا یا نەیدەکرد. وینستۆن پێی وابوو کە ڕوخساری برینکاریکراوی توانای گۆڕانی لە دەست دابێ. مارتین بێ ئەوەی هیچ بڵێ یا خواحافیزیی بکا ڕۆی و دەرگاکەی لەدوای خۆیەوە داخست. ئۆبراین کە دەستێکی لە گیرفانیدا بوو و دەستەکەی تری جگەرەی پێ گرتبوو، گوتی: "دەبێ بزانن کە خەباتتان لە تاریکیدا دەبێ. هەمیشە لە تاریکیدا دەبێ. فەرمانتان پێ دەدرێ و بێ ئەوەی هۆیەکەی بزانن جێ بەجێی دەکەن. دوایی کتێبێکتان بۆ دەنێرم کە دەیخوێننەوە پەی بە جەوهەری ڕاستەقینەی ئەو کۆمەڵایەتییە دەبەن کە تێیدا دەژین و لەو ستراتیژییەش دەگەن کە دەبێتە کەرەسەی هەڵتەکاندنی. کە ئەو کتێبەتان خوێندەوە، ئیدی دەبنە ئەندامی ڕاستەقینەی کۆمیتەی برایەتی. بەڵام هەرگیز نازانن چ پەیوەندییەک ئێوە بەو ئەنجامانەوە گرێ دەدا کە بۆی تێدەکۆشن - دەتوانم پێتان بڵێم کە برایەتی هەیە بەڵام ناکرێ پێتان بڵێم سەد ئەندامی هەیە یا دە ملیۆن. لە ڕێی هەڵسوکەوتی خۆتانەوە، چەند کەسێکیش ناناسن. سێ و چوارێ پەیوەندیتان پێوە دەکەن و بە دوای یەکدا دەگۆڕێن. ئەم دیدارەمان یەکەم جارە و دەبێ بە نهێنی بمێنێتەوە. هەر فەرمانێکتان پێ دەگا، لە منەوەیە. ئەگەر بە گرینگمان زانی پەیوەندی پێکەوە بکەین ئەوا لە ڕێی مارتینەوە دەبێ. ئەگەر دەسگیر بکرێن، هەموو شتێ دەڵێن. ئەوە چارەنووسە. بەڵام جگە لە کردەوەی خۆتان هیچی دی ناڵێن و جگە لە هێندێ کەسی کەم بایەخ کەسی ترتان پێ بە دەستەوە نادرێ. منتان پێ بە دەستەوە نادرێ. ڕەنگە ئەو دەمە من نەمابم یا بووبێتم بە کەسێکی دی و سیمایەکی ترم هەبێ.

بە سەر ڕایەخە نەرمەکەدا بەردەوام دەهات و دەچوو. پیاوێکی کەتە بوو بەڵام لە جموجوڵیدا چاپک بوو. چاپکییەکەی، تەنانەت لە شێوەی دەست بە گیرفاندا کردن و جگەرەکێشانیشدا دەبیندرا. ئەوەی کە سەرنجی ڕادەکێشا باوەڕبەخۆبوون و ئاخاوتنی گاڵتەئامێزی بوو.چ شێوەی توندڕەوی و وشک لە سەرجەمی بیروباوەڕیدا نەبوو. کە باسی کوشتن و خۆکوشتن و نەخۆشی جنسیی و پەڕاندنی ئەندامی لەش و سیماگۆڕینی دەکرد،



شێوە ئاخاوتنی بە پلاری پێوە دیار بوو. لە شێوەی دەنگیدا، دەتگوت دەڵێ: "ئەمانە چارەنووسن و دەبێ بە بێ دوودڵی ئەنجامیان بدەن. بەڵام ئەگەر ژیان شیاوی بەردەوامبوون بێ کاری وا ناکەین". شەپۆلی دەسخۆشانە، لە دڵی وینستۆنەوە سەری دەکرد. ئەو، قەڵافەتی تارمایی ئاسای گۆڵدستەینی بیر چووبوو. کە تەماشای شان و ملی پتەو و ڕوخساری زیندوو و بەهێزی ئۆبراینت دەکرد، باوەڕت نەدەکرد لە شکاندن بێ. ڕێگەیەک نەبوو شارەزای نەبێ و مەترسییەک نەبوو پێشبینی نەکا. تەنانەت جولیاش کەوتبووە ژێر کاریگەرێتییەوە. جگەرەکەی کوژاندبۆوە و بە وردی گوێی دەگرت.

- بێگومان بیستووتانە ئەنجومەنی برایەتی هەبێ و دیارە نیگارێکیتان لە هۆشی خۆتاندا کێشاوە. لەوانەیە دنیایەکی گەورەی ژێرزەمینی یاخیگەرێتیتان لە زەیندا بێ کە بە دزییەوە لەم پەنا و لەو پەنا یەکتر دەبینن، پەیام لە سەر دیوار دەنووسن، بە دیاردی دەست و وشەی تایبەتی یەک دەناسن. شتی لەو بابەتانە لە ئارادا نییە. ئەندامانی ئەنجومەنی برایەتی چ ڕێیەکیان بۆ ناسینی یەکتر نییە و مومکین نییە هیچ ئەندامێک، لە چەند ئەندامێکی تر زیاتر بناسێ. ئەگەر خودی گۆڵدستەین بکەوێتە بەر دەستی پۆلیسی خەیاڵ، ناتوانێ شێوەی تەواوی ئەندامان یا هەر زانیارییەک کە پێی بنەبڕ بکرێ بخاتە بەر دەستیان. زانیاری لەو بابەتە نییە. ئەنجومەنی برایەتی نافەوتێندرێ چونکە شێوەیەکی ئاسایی ڕێکخراو نییە. باوەڕ نەبێ کە لە شکاندن نایا، هیچی دی ئەندامەکانی پێکەوە گرێ نادا. کاتێ کە دەسگیر دەکرێن هیچ یارمەتییەکتان پێ ناگا. هەرگیز یارمەتی ئەندامانی خۆمان نادەین. کاتێ کە دەبێ یەکێ بکوژێتەوە، ئەوپەڕەکەی بە دزییەوە گوێزانێکی بۆ زیندان پێ دەگەیەندرێ. دەبێ لەگەڵ ژیانی بێ هیواییدا ڕابێن. ماوەیەکی کەم کار دەکەیت و دەگیرێیت. هەموو شتێ دەڵێیت و دەمریت و دەبڕێیتەوە. ئەمانە ڕوویان داوە. پێ ناچێ لە مەودای ژیانی ئێمەدا چ گۆڕانێ ڕوو بدا. ئێمە مردووین. ژیانی ڕاستەقینەمان لە داهاتوودایە و خۆمان لە سەر شێوەی مشتێ خۆڵ و هێندێ ئێسقان بەشداری تێدا دەکەین. بەڵام ئەو داهاتووە چەند دەخایەنێ؟. ئەوە نازاندرێ. لەوانەیە هەزار ساڵ بخایەنێ. حاڵی حازر هیچ ناکرێ جگە لەوەی هۆشی خۆمان پێش بخەین. ناتوانین کاری بە کۆمەڵ بکەین. تەنها دەتوانین زانیاری خۆمان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دی، لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دی بگوێزینەوە. هیچ لەگەڵ پۆلیسی خەیاڵدا ناکرێ.

کەمێ بێدەنگ بوو و سەیرێکی تری کاتژمێرەکەی کردەوە. بە جولیای گوت:

– هاوڕێ کاتی ڕۆیشتنت هاتووە.

پەرداخەکانی پڕ کردن و ئەوەی خۆی بەرز کردەوە و بە گاڵتەیەکەوە گوتی:

– ئەم جارە لە چاوی کێدا نۆشی کەین؟. تێکشکانی پۆلیسی خەیاڵ، مەرگی ڕێبەری گەورە، مرۆڤایەتی، ئاینده؟.

وینستۆن گوتی: – بە سەلامەتیی ڕابردوو.

ئۆبراین قایل بوو و بە سووربوونەوە گوتی: – ڕابردوو گرینگترە.

پەرداخ بەرز کرانەوە. پاش کەمێ، جولیا بە مەبەستی ڕۆیشتن هەستا. ئۆبراین پاکەتێکی لە سەر سنووقەکە داگرت و حەبێکی سپی تەختی دایێ تا بیخاتە زاری. پێی گوت کە گرینگە لە دەرەوە، بۆنی شەرابی لێ نەیات، چونکە ئاسانسۆرچییەکان زۆر زیتن. هەر هێندەی کە دەرگاکە لە دوایەوە داخرا، ئیدی بوونی جولیای لە بیر کرد. یەک دوو هەنگاوی نا و گوتی:

– دەبێ بە هێندێ لایەنی باسەکاندا بچینەوە. پێم وایە پەناگەیەکت هەیە!.

وینستۆن، باسی ژوورەکەی نهۆمی سەرەوەی دوکانی چارینگتۆنی بۆ کرد.

– ئەوە بۆ ئێستا بەسە. دوایی جێیەکی دی پەیدا دەکەین. جێگۆڕکی پێویستە. لەم ماوەیەدا دانەیەک لە "کتێبەکە"تان بۆ دەنێرم – وینستۆن هەستی کرد ئۆبراینیش بە جۆرێ ناوی کتێبەکە دەبا، وەک ئەوەی لە کەوانەدا نووسرابێ – کتێبەکەی گۆڵدستەین دەڵێم. تا پێم بکرێ زوو دەینێرم. چەند ڕۆژێ دەبا تا چنگم دەکەوێ. ئەوەندەی لێ چاپ نەکراوە وەک تۆ تێی دەگەی. ئێمە چەند بە خێرایی چاپیان دەکەین، پۆلیسی خەیاڵیش ئەوەندە بە خێرایی دەیانفەوتێنێ. زۆر گرینگ نییە. کتێبەکە نەمرە و نافەوتێ. ئەگەر دوادانەشی نەهێڵن، دەتوانین وشە بە وشە، بە دەسخەت بینووسینەوە. جانتا لەگەڵ خۆتدا دەبەیتە سەر کار؟.

– بەڵێ، بە تەبیعەتی حاڵ دەیبەم.

– چۆنە؟.

– ڕەش. زۆر سواوە و دوو قفڵی پێوەیە.

– ڕەش، زۆر سواو، دوو قفڵ. باشە بەم زوانە، ڕۆژێ – ناتوانم ڕۆژەکەی دیاری بکەم – لەگەڵ کارەکانی بەیانیدا پەیامێکت پێ دەگا کە وشەی هەڵەی تێدا دەبێ و داوای



نووسینەوەی دەکرێ. ڕۆژی دوایی، جانتا مەهێنە. لە کاتێکی دیاریکراودا، یەکێ لە سەر شەقامەکە دەستێ دەخاتە سەر بازووت و دەڵێ: "وا بزانم جانتاکەتان لێ کەوتووە". جانتایەکت دەداتێ کە دانەیەک لە کتێبەکەی گۆڵدستەینی تێدایە. دوای چواردە ڕۆژ دەیگەڕێنیتەوە.

تاوێ بێدەنگ بوو. پاشان گوتی: – دەبێ چەند دەقیقەیەکی دی بڕۆی – بە هیوای دیدار – ئەگەر یەک ببینین.

وینستۆن سەری هەڵبڕی و تەماشایەکی کرد. ئەوسا گوتی: "لە جێیەک کە تاریکی لێ نییە؟."

ئۆبراین بێ ئەوەی خۆی شێلوو بکا و لەو گوتەیە سەرسام بێ، سەری ڕەزامەندیی ڕاوەشاند و وەک ئەوەی لە دیاردییەکی نهێنی حاڵیی بووبێ، گوتی: "لە جێیەک کە تاریکیی لێ نییە. بەر لەوەی بڕۆی حەز دەکەی شتێ بڵێی؟. پەیامێ، پرسیارێ ؟."

وینستۆن خەیاڵ بردیەوە. پێ نەدەچوو پرسیاری هەبێ. نەشیدەویست بچێتە ناو باسی گشتییەوە. لە جیاتی ئەوەی بیر لە شتێ بکاتەوە کە پەیوەندی بە خۆی و ئۆبراین یا ئەنجومەنی برایەتییەوە بێ، وێنەی تێکەڵ و پێکەڵی ژوورە تاریکەکەی دایکی کە دوا ڕۆژانی ژیانی تێدا بە سەر برد و ژوورە بچووکەکەی چارینگتۆن و پارچە شووشە بلورینەکە و تابلۆ پۆڵا نەقاڕکراوەکەی ناو چوارچێوەی عەبەنووسەکە، بە هۆشیدا دەخولانەوە. بە عاستەم دەنگی هەڵبڕی و گوتی: "ئایە شیعرێکی کۆنت بە ناوی (زەنگەکانی سێنت کلیمانت دەڵێن نارنج و لیمۆین)ەوە بیستووە؟."

ئۆبراین سەری ئەرێتی بۆ ڕاوەشاند و دەستی پێ کرد:

زەنگەکانی سێنت کلیمانت دەڵێن نارنج و لیمۆین

زەنگەکانی سێنت مارتین دەڵێن سێ شاهیمان وێدەوە

زەنگەکانی بیلی پیر دەڵێن کەی قەرزت دەدەیتەوە

زەنگەکانی شۆردیچ دەڵێن کاتێ کە زۆر دەوڵەمەند بووم

وینستۆن گوتی: – دوادێرەکەشت زانی!.

– بەڵێ دوادێرەکەشی دەزانم. بە داخەوە ئێستا کاتی ڕۆیشتنت هاتووە. بەڵام ڕاوێستە.چاکتر وایە (قورس)ێ لەمانەت بدەمێ.

که وینستۆن هەستا، ئۆبراین دەستی بۆ درێژ کرد. فشاری دەستی، ئێسقانەکانی دەستی وینستۆنی هێنایە خرەخڕ. وینستۆن، لە بەر دەرگاکەوە ئاوڕێکی دایەوە، بەڵام ئۆبراین هەر ئەو کاتە لەوەدا بوو لە بیری بەرێتەوە. ڕاوێستابوو و پەنجەی نابووە سەر دوگمەی تەلەسکرینەکە. وینستۆن، مێزی نووسینەکە و لامپا سەوزەکە و بێژە و بنووسەکە و کۆمەڵە قاقەزەکانی لە پشتیەوە دەدین. وینستۆن بە بیریدا هات کە هەر ئێستا، دوای نیو دەقیقە، دەچێتەوە سەر کارە بە نیوەچڵ جێماوە حیزبییەکەی خۆی.





جەستەی وینستۆن، لە ماندوێتیدا وەک جەلی لێ هاتبوو. جەلی وشەیەکی لەبار بوو کە بە بیریدا هات. تەنها هەستی بە ماندوێتی نەدەکرد، بەڵکە پێی وا بوو جەستەی بێ ڕەنگ بووە و ئەگەر دەستی هەڵبڕێ، ڕووناکایی لێوە دەبینێ. کاری وزەبەر، خوێن و لەمفی لە دەمارەکانیدا دەرکێشابوو و هەر پێست و دەمار و ئێسقانی تورت و ناسکی مابوونەوە. توانای هەستەکانی لە دەست دابوو. بەدلە شینەکەی، شانی ئازار دەدان و شۆستەکان پێیان ئازار دەدان و تەنانەت داخستن و کردنەوەی دەستیشی جمگەکانی ئازار دەدان.

لە ماوەی پێنج ڕۆژدا، زیاتر لە نەوەد سەعات کاری کردبوو. کارمەندانی تری وەزارەتەکەش، بە هەمان ئەندازە کاریان کردبوو. ئەو دەمە، هەموو کارێک ئەنجام درابوو و بە ڕواڵەت دەستی بەتاڵ بوو. تا سبەی بەیانی چ کارێکی حیزبی لە ئەستۆدا نەبوو. دەیتوانی شەش سەعات لە حەشارگەکەیدا بێ و نۆ سەعاتیش لە جێیەکەی خۆی بێ. بە کاوەخۆ، بە بەر خۆرەتاوە گەرمەکەی دوای نیوەڕۆدا، بە شەقامێکی پیسدا، بەرەو دوکانەکەی مستەر چارینگتۆن دەڕۆیشت و بیری لای مەفرەزەی گەڕۆک بوو. لە هەمان کاتیشدا باوەڕی بە خۆی دەهێنا کە چ مەترسییەک لە ئارادا نییە. جانتا قورسەکەی کە بە دەستیەوە بوو، تەکەتەک بەر چۆکی دەکەوت و پێستی لاقی ئازار دەدا. (کتێبەکە) لە جانتاکەدا بوو کە شەش ڕۆژ بوو پێی بوو بێ ئەوەی بیکاتەوە و تەماشای بکا.

لە شەشەم ڕۆژی حەفتەی ڕقدا، دوای خۆپێشاندان و گوتار و قیژە و گۆرانی ومەشق و لافیتە و فلیم و پەیکەری مۆم و گرمەی تەپڵ و زیرەی زوڕنا و زرمەی پێ و زڕەی تانک و گرموهۆڕی ڕەوەفڕۆکە و تەقەقەی تفەنگ، شەش ڕۆژ دوای دەستپێکردنی ئەوانە و کاتێ جۆش و خرۆشی خەڵکەکە گەیشتبووە چڵەپۆپە و ڕق لە ئەوروئاسیا وای لێ هاتبوو، ئەگەر ئەو خەڵکە دەستیان لەو دوو هەزار یەخسیرەی ئەوروئاسیایی گیر بوایە کە بڕیار بوو لە دوا ڕۆژی حەفتەی ڕقدا هەڵواسرێن، لەت و پەتیان دەکردن. ڕێک لەو دەمەدا ڕاگەیەندرا کە ئەوروئاسیا لەگەڵ ئۆقیانووسیادا لە یەک بەرەدان. دیارە، پێشەکی هیچ شتێ دەربارەی گۆڕانکارییەکە ڕانەگەیەندرابوو، بەڵکو کتوپڕ، لە هەموو جێیەکدا لە قاو درا کە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دوژمنە نەک ئەوروئاسیا. ئەو ساتەی کە ڕاگەیەندرا، وینستۆن لە شەقامێکی لەندەندا بەشداری خۆپێشاندانێکی دەکرد. شەو بوو، سیمای سپی و لافیتەی

سوور، لە بەر چراخانەکاندا دەتروسکانەوە. چەند هەزار کەسێک ئاخێندرابوونە گۆڕەپانەکانەوە و ڕیزێکی هەزار نەفەریی منداڵانیش بە جلی خەفیەگەرییەوە بەشدار بوون. قسەکەرێکی ناوەندی حیزبیش لە سەر سەکۆیەک وێستابوو و پەردەی سوور دەوری دابوو. قسەکەرەکە پیاوێکی لاواز بوو، بازووی درێژ و ناهەموار بوون. کەللەی ڕوتاوە بوو و چەند تاڵە موویەکی قیتی پێوە مابوون کە وەک داوڵ بەرز ببوونەوە. بە دەستێکی ملی مایکرۆفۆنەکەی گرتبوو و دەستەکەی تری ڕادەوەشاند و قسەی دەکرد. بە دەنگێک کە لە بڵندگۆکانەوە بەرز دەبووەوە، ئاماری دەسدرێژی و ڕەشبکوژی و ئەشکەنجە و بۆمبارانی خەڵکی بێ تاوان و زۆرگێ کردن و تالاّن و پڕوپاگەندەی درۆ و پەیماننامەی پێشێلکراوی هەڵڕشت.

مەحاڵ بوو گوێت لێ بێ و ڕق نەتگرێ و پاشان تێک نەچیت. چەند چرکەیەک و جارێک جەماوەرەکەی دەهێنایە جۆش و دەنگی خۆی، لە ناو هاتوهاواری شێتانەی خەڵکەکەدا، کە لە هەزاران گەرووەوە هەڵدەستا، کپ دەبوو. کێوییانەترین دەنگ هی منداڵەکان بوو. بیست دەقیقە بە سەر گوتارەکەیدا ڕەت نەببوو، پەیامنێرێک سەرکەوتە سەر سەکۆکە و قاقەزێکی نایە مشتی. هیچ شتێ لە دەنگ و ڕەفتار و ڕەنگیدا نەگۆڕا بەڵام جێگۆڕکێ بە ناوەکان کرا. بێ ئەوەی کەس هیچ بڵێ، دەنگی ڕەزامەندیی بەرز بووەوە. ئۆقیانووسیا لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا شەڕی بوو!. پاش کەمێ، بۆڵەبۆڵ پەیدا بوو. ئەو دروشم و لافیتانەی کە گۆڕەپانەکەیان پێ ڕازابۆوە، هەڵە دەرچوون!. نیوەی زیاتریان پێچەوانە بوون. خراپەکاری رووی دابوو!. پیاوانی گۆڵدستەی دەست بە کار بوون!. لەو کاتەدا کە پۆستەری قەد دیوارەکانیان هەڵدەکەند و لافیتەیان لەت لەت دەکرد و دەیانخستنە ژێر پێ، خەڵکەکە شڵەژان. خەفیەکان، بە دیوارەکاندا هەڵگەڕان و ئەو ئالاّیانەیان دادەگرت کە بە دوکەڵکێشەکانەوە قایم کرابوون و بە دەم باوە دەشەکانەوە. کارێکیان کرد هەر مەپرسە!. بەڵام دوای دوو سێ دەقیقە، هەموو شتێ دۆخی خۆی گرتەوە. قسەکەرەکە، هەر ملی مایکرۆفۆنەکەی لە مشتدا بوو و دەستەکەی تری ڕادەوەشاند و قسەی دەکرد. دوای یەک دەقیقە، هوتافی کێوییانە لە هەموو گەروویەکەوە بەرز بووەوە. ڕق، وەک جاران لە هەڵکشاندا بوو و تەنها بابەتەکە گۆڕابوو.

ئەوەی کە سەرنجی وینستۆنی ڕاکێشا ئەوە بوو قسەکەرەکە، لە ناوەڕاستی ڕستەکانیدا، بێ ئەوەی ڕاوێستێ یا ڕستەکانی بگۆڕێ، ڕێڕەوی باسەکەی گۆڕی. شتی تریش هەبوو کە بیری وینستۆنی شڵەژاندبێ. لە کاتی هەڵچوونەکەدا، واتە لەو دەمەدا کە پۆستەرەکان



دەدڕێندران، پیاوێکی نائاشنا دەستی خستە سەر شانی و گوتی: "ببوورە، پێم وایە جانتاکەتان لێ کەوتووە." لە سەرخۆ و بێ ئەوەی هیچ بڵێ، لێی وەرگرتبوو. دەیزانی زۆری دەوێ تا دەرفەتی خوێندنەوەی بۆ دەڕەخسێ. هەر بە کۆتایی هاتنی خۆپێشاندانەکە، هەرچەندە سەعات بیستوسێش بوو، بەڵام بەرەو وەزارەت گەڕایەوە. هەموو فەرمانبەران وایان کردبوو و چ پێی نەدەویست لە تەلەسکرینەوە فەرمانی گەڕانەوەیان پێ بدرێ.

ئۆقیانووسیا لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا شەڕی بوو: هەموو دەمێ ئۆقیانووسیا لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا شەڕی بووە. زۆربەی زۆری نووسراوە سیاسیەکانی ماوەی پێنج ساڵی پێشوو لە کەڵک کەوتن. ڕاپۆرت و گشت جۆرە نووسراوێکی ئەرشیف و ڕۆژنامە و کتێب و وێنە و فلیم و شریتی تۆمارکراو - دەبوو هەموو، دەمودەست بگۆڕدرێن - هەرچەندە چ فەرمانێ بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە دەرناکرابوو بەڵام ئاشکرابوو کە بەرێوەبەرایەتی بەشەکە، دەیەوێ دوای یەک حەفتە، شوێنەواری شەڕی ئەوروئاسیا و دۆستایەتی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا نەمێنێ.

کارەکە، کارێکی دژوار بوو. ئەوەی کە هێندەی دی گرانی کردبوو ئەوە بوو کە نەدەبوو لە ئەنجامدانیدا ناوە ڕاستەقینەکان بێنە گۆڕێ. فەرمانبەرانی بەشی ئەرشیف،لە شەو و ڕۆژێکدا هەژدە سەعات کاریان دەکرد و دوو سێ سەعات دەنوستن. دۆشەکیان لە ژێرزەمینەکانەوە هێنابوون و لە کۆریدۆرەکاندا ڕایانخستبوون. کارگەرانی کانتینەکە، نانەچەورە و قاوەی سەرکەوتنیان بە عارەبانە دەگێڕا. هەموو جارێ وینستۆن، کە بۆ چاوگەرمکردنێ دەچوو، سەر مێزەکەی پاک دەکردەوە، بەڵام کە بە چاوی خەواڵووەوە دەگەڕایەوە، هێندەی سەفتە قاقەزی بە لوولەکەدا بۆ هاتبوون، سەر مێزەکە و ئامێری بێژە و بنووسە پڕ دەبوون و هێندێکیشیان لێ کەوتبوونە سەر زەوی. یەکەم کاری وینستۆن ئەوە بوو کە جێی کارکردنی خۆی خۆش بکا. ئەوەی ببوە سەرباری نارەحەتی ئەوە بوو کە زۆربەی کارەکان، بە ئامێر ئەنجام دەدران. گەلێکیان هەر ئەوەندەیان دەویست کە ناوێکیان بە ناوێکی دی تێدا بگۆڕدرێ. بەڵام هەمووی کات و بیرکرنەوەی گەرەک بوو. تەنانەت هێندێ جار شارەزایی جوگرافیاشی دەویست تا شەرگەیەک لە جێیەکی گۆی زەوییەوە بۆ جێیەکی دی بگوێزێتەوە. سێیەم ڕۆژ، ئازاری چاوی بێ تاقەتی کردبوو و دەبوو هەر چەند دەقیقەیەک و جارێک چاویلکەکەی پاک کاتەوە. دەتگوت لە هەوڵدانی ئەنجامدانی کارێکی پشتشکێنی وادایە کە بۆی هەبێ ئەنجامی نەدا بەڵام بە شێوەیەکی شێتانەش لە هەڵپەی تەواوکردنیدا بێ. ئەوەندەی لە یادی بوو، هیچ وشەیەکی درۆ کە

دەیچرپاندە ناو بێژە و بنووسەکەوە ئازاری نەدەدا. وەک فەرمانبەرەکانی دی، هەموو هەوڵێکی ئەوە بوو هەڵەی نەبێ. ڕۆژی شەشەم، ئەو فەرمانانەی کە بە لوولەکەدا دەهاتن کەمیان کرد. لە مەودای نیو سەعاتدا هیچی بۆ نەهات. دوای ئەوە یەک نوشتە قاقەزی بۆ هات و ئیدی چکی کرد. لە هەموو جێیەکی بەشەکەدا، هاوکات کار نەما. کارمەندان هەناسەی ڕەحەت و نهێنییان هەڵمژی. ئەرکی گران کە لە باسکردن نەدەهات ڕاپەڕێندرا. ئیدی مەحاڵ بوو بە پێی بەڵگە و سەرچاوە بیسەلمێنی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان، شەڕ دژی ئەوروئاسیا قەوماوە. دوازدەی نیوەڕۆ، بێ ئەوەی کەس بە تەما بووبێ، کتوپڕ ڕاگەیەندرا کە گشت فەرمانبەران تا سبەی بەیانی پشوویان دەبێ. وینستۆن بە جانتاکەیەوە کە (کتێبەکە)ی تێدا بوو و لە کاتی کاردا دەیخستە نێولنگی و لە کاتی نوستندا دەیخستە ژێری، ڕۆیشتەوە. تەراشێکی کرد و تا ئاوەکە بە کوڵ هات زۆری نەما خەو بیباتەوە. بە کرتەکرتێکی حەزبزوێنەوە کە لە جمگەکانی دەهات، بە پلەکانی دوکانەکەی مستەر چارینگتۆندا هەڵگەڕا. ماندوو بوو بەڵام چی دی خەوی نەدەهات. پەنجەرەکەی کردەوە و تەباخە پیسەکەی داگیرساند و ئاوی بۆ قاوە نایە سەر. دەبوو جولیا زوو بێ و تا هاتنی ئەویش (کتێبەکە)ی پێ بوو. لە سەر کورسییە قەراغ سواوەکە دانیشت و قفڵی جانتاکەی کردنەوە.

کتێبێکی قەبەی ڕەش، ناشیانە بەرگی تێ گیرابوو. نە ناوی نووسرابوو نە ناوی نووسەرەکەی. بە شێوەیەکی ناڕێکیش چاپ کرابوو. لێواری پەڕەکانی دڕابوون و بە ئاسانی لێک دەبوونەوە. پێ دەچوو زۆری ئەم دەست و ئەو دەست پێ کرابێ: لە یەکەم لاپەڕەیدا نووسرابوو:

تیۆری و پراکتیک لەڕێبەرایەتی دەستەجەمعیدا[19]

نووسینی عەمانۆئێل گوڵدستەین

وینستۆن دەستی بە خوێندنەوەی کرد:

بەشی یەکەم

نەزانیی هێزە

لەو دەمەوەی کە مێژوو پەی پێ دەبا و پێ دەچێ لە دوای سەردەمی بەردەوە بێ، ئەم جیهانە سێ دەستە مرۆڤی تێدا ژیاون: یەکێکیان دەستەی بالایە، یەکێکیان دەستەی

(19) Oligarchical collectivism



ناوەنجییە و ئەوی تریشیان دەستەی دامێنە. ئەو سیانەش بە سەر دەستە و تاخمی لە خۆیان گچکەتردا دابەش بوون، کە ناوی هەمەچەشنەیان بووە و ڕێژەی هەر یەکێکیان و پەیوەندی نێوانیان، لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دی گۆڕاوە، هەرچەندە لە ناوەڕۆکی ڕاستەقینەدا هەرگیز نەگۆڕاوە. تەنانەت دوای ڕووداوی گەورە و گۆڕانکاری بە ڕواڵەت دەگمەنیش، هەمیشە هەمان کێشانە و پێوانە خۆی سەپاندووە. ڕێک وەک ئامێری هاموشۆ کە ڕوو لە هەر جێیەک بکا، هەر یەکە لە بەشە پێکهێنەرەکانی لە جێی خۆیدا دەمێنێ. ئەو سێ دەستەیە، هەمیشە بەرژەوەندییان جیاوازە.

وینستۆن لە خوێندنەوە ڕاوێستا. دەیویست ئەو هێمنی و بێدەنگییە بکاتە دەرفەتی بیرکردنەوە لەوەی کە خوێندیەوە. بە تەنها بوو: نە تەلەسکرینی لێ بوو نە گوێچکە بە کونی کلیلەوە بوو نە ترس و ئاوڕدانەوە و داپۆشینی ڕووی لاپەڕە لە ئارادا بوون. هەوای دڵگیری هاوین، گەمەی لە سەر ڕوخساریدا دەکرد. بە عاستەم دەنگی منداڵان، لە دوورەوەڕا دەبیسترا. لە ژوورەکەشدا، چکەچکی کاتژمێرەکە نەبێ دەنگی دی نەبوو. نەمریی بوو. لە پڕێکدا، وەک کەسێ دەستی بە هەڵدانەوەی پەڕە بە پەڕەی کتێبەکە کرد، کە دڵنیا بێ نەک جارێ بەڵکو دوو جاریشی دەخوێنێتەوە. لە سەر بەشێکی تری کتێبەکە گیرسایەوە. دەستی پێ کرد:

بەشی سێیەم

شەڕ ئاشتییە

وەک لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمەوە پێشبینی دەکرا، جیهان بە سەر سێ زلهێزدا دابەش بووە. کاتێ ڕووسیا ئەوروپای قووت دا و ئەمەریکاش بەریتانیای گرت، دوو زلهێزی ئەو سێیە پەیدا بوون کە ئەوروئاسیا و ئۆقیانووسیایان پێ دەگوترێ. سێیەم هێزیش ڕۆژهەڵاتی ئاسیایە کە لە ئەنجامی شەڕ و هەرای دەیەکاندا وەک هێزێکی سەربەخۆ پەیدا بوو. سنووری نێوان ئەو سێ هێزە لە هێندێ لاوە سەپاوە و لە هێندێ لای تریشەوە، بە هۆی شەڕ و هەراوە، بەردەوام لە گۆڕانکاریدایە. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی لە ناو قەوارەی سیاسی خۆیاندان. ئەوروئاسیا هەموو سەرزەمینی بەشی باکوری زەوی ئەوروپا و ئاسیا، لە پورتوگالەوە تا تەنگەی بێرینگ دەگرێتەوە. ئۆقیانووسیاش لە ئەمەریکا و دوورگەکانی ئەتلەنتیکەوە کە بەریتانیاشی تێدایە تا باکوری ئەفریقیا و ئۆستڕالیاش لە جغزی ئەودایە. ئەمما ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کە لە دووەکەی دی بچووکترە و

سنووری لای ڕۆژهەلاتیەوە کەمە، چین و ولاتەکانی خواروەی چین و دوورگەکانی ژاپۆن و بەشێکی زۆری مەنگۆلیا و مەنچۆریاو تیبت دەگرێتەوە کە هەرسێکیان هەمیشە لە گۆڕانکاریدان. ئەم سێ هێزە، هەمیشە بە جۆرێ لە جۆرەکان شەڕ و هەرایانە. بیست و پێنج ساڵە ئەمە حاڵیانە. شەڕەکانیان وەک شەڕی دەیەکانی ئەم سەدەیە ماڵوێرانکەر و کارەسات نین. شەڕ،غەرەزی ئاشکرای شەڕکەر دەیگێڕێ کە یەکیان پێ لە بەین ناچێ و ئامانجی ماتریالییان لە شەڕدا نییە و ڕێباز و ئایدۆلۆژیش لێکیان جودا ناکاتەوە. ئەمە، ئەوە ناگەیەنێ کە مەیلی شەڕ و خوێنڕشتن و هەوڵی فراوانکردنی دەسەلات کەم بوونەتەوە. بە پێچەوانەوە، هێستریای شەڕ، گشتگر و کتوپڕە. زەبروزەنگ و پەلاماردان و کوشتنی منداڵ و نزمکردنەوەی پلەی میللەت و بەکۆیلەکردنی، سزادانی دیل کە تا کولاندن یا زیندەچاڵ کردنیش دەگرێتەوە، وەک ڕەفتاری سروشتی دێنە بەر زەین بە مەرجێ خۆت ئەنجامیان بدەی نەک دوژمنەکەت. کاریگەرێتی ڕاستەوخۆی شەڕ بۆ سەر ژمارەیەکی کەمی شارەزایان و پسپۆران دەبێ کە ئەمەش بە پێی بەراوردکردن زیانێکی ئەوتۆ نییە. ئەگەر شەڕ بقەومێ لە سەر سنوورە خەیاڵییەکاندا دەقەومێ کە ڕەشە خەڵکەکە بۆ ناسینی سنوور و کەلەبەرەکانی ڕمڵ لێ دەدەن یا لە دەوروبەری کەشتییەکاندا ڕوو دەدا کە گاردەکان چاودێری جێی ستراتیژی لێوە دەکەن. شەڕ لە شارە گەورەکاندا واتایەکی ئەوتۆی نییە هێندە نەبێ کە پێداویستییە بنەڕەتییەکان، بەردەوام لە کەمبووندا دەبن و جار و بارێکیش مووشەکێک دەتەقێتەوە و دەبێتە هۆی کوشتنی بیست کەسێ. شەڕ، لە ڕاستیدا سروشتی خۆی گۆڕیوە. بە شێوەیەکی وردتر بڵێین، هۆکارەکانی شەڕ پلەی گرنگییان گۆڕاوە. ئەو هۆکارانەی کە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا شەڕی گەورەیان لە سەر دەقەوما ئێستا بەربەست کراون و بە وریایی دەسنیشاندەکرێن و چارەسەر دەکرێن.

دەبێ پێشەکی ئەوە بزانین کە شەڕی ئێستا مەحاڵە چارەنووسساز بێ هەرچەندە دۆستایەتی و پەیمانی دووقۆڵی چەند ساڵ جارێ تازەش ببنەوە. هیچ یەکێ لەو سێ هێزە تەنانەت لە حاڵەتی هاوکاریکردنی دووەکەی تریشدا تێکناشکێندرێ. ئەوانە بە قەدەر یەکن و هێزی بەرگریکردنیان مەحکەمە. ئەوروئاسیا، سەرزەمینی فراوان بەرگری لێ دەکا. ئۆقیانووسیا، زەریای پان و بەرینی هەیە و ڕۆژهەلاتی ئاسیاش دەوڵەمەندی و سووربوونی دانیشتوانی هەیە. ئیدی بە پێی بۆچوونی ماتریالانە، هۆکاری جەنگ لە ئارادا نییە.بە لەنگەر گرتنی دارایی سەربەخۆ، کە بەرهەم و خەرج پێکەوە گرێ دەدا، ململانێی دۆزینەوەی بازاڕی کالا کە جاران شەڕی لە سەر دەقەوما کاریگەرێتی نەما و



دەسگرتن بە سەر سەرچاوەی کەلوپەلی خاودا چی دی بابەتی ژیان و مردن نییە. هەر یەکە لەو هێزانە، هەر چۆنێ بێ دەتوانێ لە ناو سنووری خۆیدا پێداویستییەکانی خۆی وەدەست بێنێ. ئا ئەو کاتەی شەڕ ئامانجی دارایی هەبێ، شەڕ دەبێتە شەڕی هێزی کار. لە ناو سنووری زلهێزەکاندا چوارگۆشەیەک هەیە کە تەنجە و بەرازاڤیل و داروین و هۆنگ کۆنگ گۆشەکانی پێک دەهێنن و پێنجیەکی دانیشتوانی گۆی زەوی لێیە، بە شێوەیەکی بنەبڕ لە ژێر ڕکێفی هیچیاندا نییە. لە پێناوی دەست بە سەردا گرتنی ئەو چوارگۆشە پڕ خەڵکە و سەهۆڵبەندانی دەوری جەمسەری زەوی ململانێ لە نێوان ئەو سێ زلهێزەدا هەیە. لە ڕاستیدا هیچیان ئەو ناوچانەیان بە دەستەوە نییە. بەشێکی ئەو ناوچانە، ئەم دەست و ئەو دەست دەکا و بە هۆی پەلاماری کتوپڕ و خیانەتکارییەوە دەست بە سەر ئەم یا ئەو پارچەیەدا دەگیرێ و هەر جارە و لایەک دەیخاتە ژێر قەڵەمڕەوی خۆیەوە. هەموو ئەو جێیانەی کە ململانێیان لە سەرە، (کان)ی زۆریان تێدان و هێندێکیان بەرهەمی کشتوکاڵی گرنگی وەک (لاستیک)یان تێدا هەیە کە لە ناوچە ساردەکاندا پێویستە و بە گرانتر بەرهەم دەهێندرێ. بەلام لە سەرووی هەموو ئەمانەوە هێزی کاری بێ پایانی تێدایە. هەر یەکە لەو هێزانە ئەگەر دەست بە سەر ناوچەی گەرمی ئەفریقیا یا ولاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا یا خوارووی هندستاندا یا دوورگەکانی ئەندونوسیادا بگرێ، دەست بە سەر سەدان ملیۆن کۆڵکێشی هەرزان و بە بڕشتی (کوولی)[٢٠] شدا دەگرێ. خەڵکی ئەو ناوچانە، کەم و زۆر بوونەتە کۆیلە و بەردەوام لە لایەن خاوەنی نوێوە دەسەلاتیان بە سەردا دەگیرێ و وەک خەڵووز و نەوت بەکار دەهێندرێن و ناوچەی دەسەلاتیان پێ فراوان دەکرێ تا دەست بە سەر هی تردا بگرن و ناوچەی تریان چنگ کەوێ... و هتد. دەبێ ئەوەش بزانین کە هەرگیز، شەڕ لەو ناوچانە تێناپەڕێ کە هەرایان لە سەر هەیە. سنووری ئەوروئاسیا لە نێوان دەریاچەی کۆنگۆ و لێواری دەریای ناوەڕاست لە هەڵکشان و داکشاندایە. دوورگەکانی ئۆقیانووسی هندی و ئۆقیانووسی ئارام لە نێوان ڕۆژهەلاتی ئەوروپا و ئۆقیانووسیادا ئەم دەست و ئەو دەست دەکا. سنووری نێوان ئەوروئاسیا و ڕۆژهەلاتی ئاسیا لە لای مەگۆلستانەوە هەرگیز سەپاو نییە. هەرسێ هێزەکە، بەشی زۆری تەوەری زەوی بە هی خۆیان دەزانن کە زۆربەی ئەو ناوچانە کەسیان تێدا ناژی یا جارێ هەر لە بنیی پێی مرۆڤیان پێ نەکەوتووە. بەلام هاوکێشەی هێزی ئەو سێیە هەمیشە نەگۆڕە و هەمیشەش لە دەسدرێژی پارێزراوە. لەشکری کاری بەکارنەهێندراوی میللەتانی

٢٠- Cooly - ie کرێکاری کۆڵهەڵگری هندی.

دەوروبەری هێڵی پانی ناوەڕاستی زەوی، بە کەڵکی ئابووری جیهانی نایا. ئەمانە هیچ ناخەنە سەر سامانی زەوی چونکە ئەوەی بەرهەمی دەهێنن بۆ مەبەستی شەڕ بەکار دێ و دەبێ کەرەسەی شەڕیان چاکتر بێ تا بتوانن ئاگری شەڕێکی تری پێ خۆش کەن و بە هێزی کاری لەشکری کۆیلە خێرایی بە ئاهەنگی شەڕ دەبەخشن. بەڵام ئەگەر ئەوانەشیان نەبوونایە، شێوازی کۆمەڵایەتی جیهان و ئەو ڕەوەندەی کە گرتویەتی، جیاوازی نەدەبوو.

ئامانجی ئەو شەڕەی کە لە ئارادایە (بە پێی "باوەڕی دووفاقانە"ی مۆخە بەهۆشەکانی ناوەندیی حیزب، هەم بە ڕەسمی دەناسرێ هەم بە ڕەسمی ناناسرێ) ئەوەیە کە بە بێ ئەوەی ڕادەی ژیانی گشتی بەرز بێتەوە بەرهەم خەرج دەکرێ. لە سەدەی نۆزدە بە دواوە کێشەی گەورە ئەوە بوو کە کاڵای زیاد چۆن لە وڵاتێکی پیشەسازیدا لە کۆڵ بکرێتەوە. ئێستا کەم کەس خۆراکی تەواویان هەیە. ئەمە کێشەی سەرەکی نییە و ڕەنگە هەرگیز کێشەش نەبووبێ تەنانەت ئەگەر هەنگاوی وێرانکاریش نەنرێ. جێهانی ئەمڕۆ بە گوێرەی جیهانی پێش ١٩١٤ بێ بەرهەم و برسی و وێرانەیە. خۆ ئەگەر بە ئایندەیەکی خەیاڵیی بپێوین کە خەڵکی چاوەڕوانێتی، هەر بەجارێ کارەساتە. لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا خەیاڵی کۆمەڵگەیەکی ئەوپەڕی دەوڵەمەند و ئاسودە و بەکار و بە بەرهەمی پاشەڕۆژ، لە دنیایەکی درەوشەداری شووشە و پۆڵابەندا و کۆنکرێتی وەک بەفر سپیدا، لە هۆشی هەموو ڕۆشنبیرێکدا بوو. زانست و تەکنەلۆژیا، بە شێوەیەکی سەیر پێش دەکەوتن و ئاسایی بوو خەڵکی، بەتەمای بەردەوامبوونی ئەو پێشکەوتنە بن. بەڵام وا دەرنەچوو. لە لایەکەوە لە بەر دەسکورتی کە شوێنەواری شەڕ و شۆڕش بوو وا دەرنەچوو، لە لایەکی تریشەوە خودی زانست و تەکنەلۆژیا لە ناو کۆمەڵگەی دواکەوتوودا ڕێی مانەوەیان نەبوو. بە شێوەیەکی گشتی، جیهانی ئەمڕۆ لە پەنجا ساڵ پێش ئێستا سەرەتاییترە. لایەنی دواکەوتووی تایبەتی پێش خرا و بەشی نوێی وابەستە بە جەنگ و خەفیەگەرێتییەوە داهێندران و گەشەیان پێ درا، بەڵام داهێنان و تاقیکردنەوە بە جارێ وێستان و برینی شەڕی ئەتۆمی پەنجاکان هێشتا سارێژ نەبووە. لە سەر ئەوانەشەوە، مەترسییەکانی ئامێر لە جاران کەمتر نین. لەو دەمەوەڕا کە سەروسەکوتی ئامێر پەیدا بووە، لە هۆشمەندان عەیانە کە پێداویستی چەوساندنەوە و فراوانکردنی نایەکسانی نێوان مرۆ نەماوە. وا نەبوایە، برسێتی و نەخوێندەواری و نەخۆشی و چەوساندنەوەی کرێکار، دەبوو دوای چەند نەوەیەک نەمێنن. لە ڕاستیدا ئامێر، بێ ئەوەی بۆ ئەو مەبەستانە وەگەڕ خرێ، هەر لەخۆڕا – بە زیادکردنی بەروبوومێ کە دابیننەکردنی مەحاڵ بوو – لە مەودای پەنجا ساڵی کۆتایی



سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، پێوانەی ڕادەی ژیانی خەڵکی ئاسایی زۆر بەرز کردەوە. بەڵام ئەوەش ئاشکرا بوو کە بەرزکردنەوەی سامان، هەڕەشەی تەپاندنی کۆمەڵگەی هەمەچینیشی دەکرد – لە ڕاستیدا هۆی تەپاندنیشی بوو – لە دنیایەکدا کە گشت کەسێ کەم کار بکا و خۆراکی تەواوی هەبێ، و گەرماو و یەخچاڵی لە ماڵێ هەبن و خاوەنی ئۆتۆمبیل یا کۆپتەری تایبەتی بێ گرینگترین هۆکاری نایەکسانی لە ئارادا نامێنێ. ئەگەر سامان گشتی بێ مەودای دەست بەسەرداگرتنی نابێ. دەکرێ بیرلە کۆمەڵگەیەک بکەینەوە کە تێیدا سامان و کاڵای خۆشگوزەرانی بە هاوسانی دابەش دەکرێن، بەڵام دەسەڵات لە چنگی تاخمێکی گچکەدایە. کۆمەڵگەی وا، ناکرێ بە بەردەوامی پتەو و بەهێز بێ. وا دانێ هەمووان، بە بێ جیاوازی مەودای خۆشگوزەرانییان دەبێ و ڕەشە خەڵکەکەش کە زیاتر دوچاری هەژاریی دێن توانای فێربوون و بیرکردنەوەیان هەبێ. لە باری وادا، درەنگ یا زوو پێدەگەن و تێدەگەن و کەمایەسییەک کە هیچیان لە دەست نایات، لە سەرەڕێیاندا هەڵدەتۆقن. لە مەودایەکی درێژدا و لە کۆمەڵگەی فرەچیندا، تەنها بە هەژاری و نەداری یەکسانی دێتە کایەوە. ئەگەر بۆ سەردەمی کشتوکاڵی سەرەتای ١٩٠٠ بگەڕێینەوە، دەبینین بیرکردنەوەی خەڵکی هۆشمەندی ئەو دەمە، بە دەوری چارەسەری گونجاودا نەدەخولایەوە. بیرکردنەوەیان لەگەڵ تەکنیکدا کە سەرانسەری دنیای تەنی، دژ وێستایەوە. لە سەر ئەوەشەوە، هەر وڵاتێ لە مەودای تەکنیکدا جێ مابێ، لە جێی خۆیدا ماوەتەوە و لە لایەنی هێزی سەربازییەوە بێ دەسەڵات بووە و ئەوجا بە شێوەی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ نەیارێکی بەهێزی لێ پەیدا بووە و دەستی بە سەردا گرتووە.

کەلەبەردانان لە بەردەم بەرهەمدا بۆ مەبەستی هەژارکردنی خەڵک، چارەسەرێ نەبوو جێی ڕەزامەندی بێ. ئەمە بە شێوەیەکی فراوان لە سایەی دوادوایی دەسەڵاتی سەرمایەداریدا، لە نێوان ساڵانی ١٩٢٠ و ١٩٤٠ دا بەرپا کرا. دارایی زۆربەی وڵاتان لە جێی خۆیدا مەیی. زەوی نەکێڵدرا، کاڵەی سەرمایەداران پەرەیان پێ نەدرا. خەڵکێکی زۆر کاریان نەما و کەوتنە سەر ورگی دەوڵەت. ئەمانەش بوون بە هۆی لاوازی سەربازیی و لەو جێیەوە کە نەداری پەیدا بوو دەبوو بەرهەڵستکاریش پەیدا بێ. کێشەی گەورە لەوەدا بوو کە چەرخی پیشەسازی دەبوو بگەڕێ بێ ئەوەی سامانی جیهان زیاد بکرێ. دەبوو کاڵە بەرهەم بهێندرێ بەڵام دابەش نەکرێ. لە واقعیشدا تاکە ڕێگەی بەردەوامبوونی ئەو بارە، تەنها جەنگی بەردەوام بوو.

ئەركی سەرەكی جەنگ وێرانكردنە. هێندەی وێرانكردنی بەری ڕەنجی مرۆ گرنگە، تێكشكاندنی خودی مرۆ گرنگ نییە. شەڕ ڕێگەیەكە بۆ تێكشكاندن و بە حەوادا بردن و لە دەریا نقومكردنی هەموو بابەتێ كە دەبێتە هۆی خۆشگوزەرانی مرۆڤ و لە مەودایەكی دووردا هۆشیاریان دەكاتەوە. تەنانەت ئەگەر ئەسبابی شەڕ لە بەینیش نەچێ، بەرهەمهێنانی دەبێتە هۆی بە خەرجدانی توانای كار بێ ئەوەی هیچ شتێ بۆ بەكارهێنانی گوزەران وەبەرهەم بهێندرێ. بۆ نموونە "قەڵای سەراو" ئەوەندە هێزی كاری پێ دەوێ كە بەشی دروستكردنی چەندسەد كەشتییەكی باربەر بكات. ئەوەش هەر دەبێ ڕۆژێ لە ڕۆژان تێك بشكێ بێ ئەوەی هیچی زیاد كردبێ، ئەوجا یەكێكی دی دروست دەكرێ. بە شێوەیەك نەخشە بۆ شەڕ كێشراوە كە هەموو ئەسبابێكی زیادە، پێش بەكارهێنانی و پڕكردنەوەی كەلێن، قووت بدا. پێداویستی كۆمەڵگە بە كەم دەبیندرێ و بەوەش، كەمبوونەوەی بەردەوامی پێداویستی پەیدا دەبێ. هەر بە ئانقەست، تەنانەت كۆمەڵە خەڵكێكی پایەبڵندیش دەخرێنە لێواری دەردەسەرییەوە تا نرخی پێداویستییەكانی ژیان بەرز بێتەوە. بەو شێوەیە نەلوان و نەگونجانی گرووپە جیاجیاكانیش پەرە دەسێنن. ئەگەر بە گەز و جاوی سەرەتای ١٩٠٠ی بپێوین، دەبینین تەنانەت ژیانی ئەندامی ناوەندی حیزبیش ناهەموار بووە هەرچەندە دەسكەوتی خۆشگوزەرانی -ماڵی گەورە و ڕێكوپێك، قوماشی نایابی جل و بەرگ، خۆراك و خواردنەوە و تووتنی نایاب، دوو سێ خزمەكار، ئۆتۆمبیل یا هیلیكۆپتەری تایبەتی - لە دنیایەكی تەواو جیاواز لە دنیای ئەندامی ئاسایی حیزبی دادەنان. ئەندامە ئاساییەكانی حیزبیش، ئەگەر بە ڕەشەخەڵكەكە - كە بە كرێكاران ناویان دەبرێ - بپێوین، هەمان دەسكەوتیان هەیە. بارودۆخی كۆمەڵگە بارودۆخی شارێكی گەمارۆ دراوە كە تێیدا پارچە گۆشتێكی ئەسپ دەوڵەمەند و هەژار لێك جودا دەكاتەوە. لە هەمان كاتیشدا هەستكردن بە بوونی شەڕ كە هەستكردنە بە مەترسیی هەر لەوەوەڕا دێ كە مافی ڕەفتاركردن بە چارەنووسی هەمووانەوە، لە دەسەڵاتی توێژاڵێكدایە.

شەڕ، تەنها پێداویستی لە ناو نابا بەڵكو باری دەروونیش بۆ قەبووڵكردنی ئامادە دەكا. لە بنەڕەتدا بەفیڕۆدانی وزەی كاری زیادەیە. دروستكردنی ئەهرام وپەرستگا و چاڵ و دیسان پڕكردنەوەی، یا تەنانەت وەبەرهەمهێنانی كاڵە و پاشان سووتاندنی، تا بڵێی ئاسایین. بەڵام ئەمە بنەڕەتی دارایی دەوێ نەك سۆزی كۆمەڵگەی هەمەچین. ئەوەی جێی باسە ورەی خەڵك نییە كە بە كارەوە پەیوەست بن و پێوەی خەریك بن. بەڵكو ورەی



خودی حیزبە. تەنانەت بێ تواناترین ئەندامی حیزبیش چاوەڕوانی توانا و گەرموگوڕی لێ دەكرێ با لە سنوورێكی بەرتەسكیشدا بێ. بەڵام دەبێ خۆشباوەڕ و نەزان بێ و كەسایەتی، لە ترس و قین و (ئەشەدوبیللا) پێك هاتبێ. بە شێوەیەكی دی، دەبێ هۆشی لەگەڵ جەنگدا گونجاو بێ. ئیدی گرینگ نییە شەڕ لە ئارادا هەیە یا نییە و تا چ ڕادەیەك چارەنووسسازە. گرینگ نییە شەڕ چاك دەگەڕێ یا خراپ. ئەوەی گرینگە ئەوەیە شەڕ باسی هەبێ. دابڕانی هۆش كە حیزب لە ئەندامی خۆی دەوێ، لە سەردەمی شەڕدا هاسانتر وەدەست دێ. ئێستا تا ڕادەیەك گشتگرە، بەڵام دەبێ بگاتە پلەی بەرزتر و ئاشكراتر بێ. بە شێوەیەكی وردتر، هیستریای شەڕ و ڕق لە دوژمن، لە ناو ئەندامانی كۆمیتەدا بەهێزن. ئەندامی ناوەندی حیزب كە پلەی بەڕێوەبردنی هەیە، گرنگە ئاگای لە ڕاستی و درۆی هەواڵەكانی شەڕ بێ و هەموو دەمێ بزانێ شەڕ فرتوفێڵە یا هەر لە بنیی لە ئارادا نییە یا بۆ مەبەستی پێچەوانەی ئەو مەبەستانەی كە ئاشكرا كراوون دەگەڕێ. بەڵام ئاگاداربوونی لەو بابەتانە، بە باوەڕی دووفاقانە، بە ئاسانی دەخەسێندرێ. لە هەمان كاتیشدا، یەك ئەندامی حیزب بۆ یەك ساتیش نابێ باوەڕی بەوە لەق بێ كە شەڕ وەك ڕاستییەك لە ئارادایە و بە سەركەوتنی ئۆقیانووسیاوە بەستراوەتەوە كە سەروەری بێ هاوتای گشت جیهانە.

سەرجەمی ئەندامانی ناوەندی حیزب،وەك ڕوكنێكی ئاین باوەڕیان بە سەركەوتنی داهاتوو هەیە. سەركەوتن، یا بە پێكەوەنانی هێزی ڕامالێن بە دەست دێ یا بە داهێنانی جۆرە چەكێكی بێ بەرگری. هەڵپەی پەیداكردنی چەكی نوێ بەردەوامە و یەكێكە لەو دەروازانەی كە داهێنەران و هۆشمەندان خەریكین. زانست، بە واتا كۆنەكەی، هێندەی بكرێ لە ئۆقیانووسیادا هەیە. گوتەی نوێ چ وشەیەكی بۆ زانست تێدا نییە. بیری دەسەڵاتدارێتی كە ئەنجامی زانستانەی پێ وەدی دێ، پێچەوانەی باوەڕە بنەڕەتییەكانی (سۆسینگ) دەوەستێتەوە. تەنانەت پێشكەوتنی تەكنیكیش هەر ئەو دەمە دێتە دی كە بە جۆرێ لە جۆرەكان جغز بۆ سەربەستی خەڵك دانرێ. لە سنووری هونەری سوودبەخشدا دنیا لە جێی خۆیدا دەوێستێ یا بەرەو دواوە دەچێ. زەوی بە ئەسپ و هەوجاڕ دەكێڵدرێ، بەڵام كتێب بە ئامێر چاپ دەكرێ. كاروباری ژیان - واتە شەڕ و جاسووسێتی - سەرەتاییە و بە بنەڕەتی سەرەتاییەوە پەیوەستن. حیزب دوو ئامانجی هەن، یەكێكیان دەستبەسەرداگرتنی گۆی زەوییە و ئەوی تریان بنەبڕكردنی سەرچاوەی بیركردنەوەیە لە پاشەڕۆژ. كەواتە حیزب، لە هەوڵی چارەسەركردنی دوو كێشەدایە. یەكێكیان ئەوەیە كە

بزانێ مرۆڤی دی بیرلە چی دەکاتەوە و ئەوی تریشیان ئەوەیە لە ماوەی چەند چرکەیەکدا، بێ ئەوەی پێشووتر بیری لێ کرابێتەوە، چەند سەد ملیۆنی بنیادەم بکوژێ. تا ئەو ڕادەیەی کە لێکۆڵینەوەی زانستانە پەی پێ دەبا، ئامانجی سەرەکی هەر ئەمەیانە. خوێندکاران یا دەروونناسانی ئەمڕۆ و شارەزایانی باوەڕ، بە وردییەکی لە ڕادە بەدەر کاریگەریتی (موخەدەرات) و ڕاچڵەکاندن و خەوی دەسکرد و ئەشکەنجە هەڵدەسەنگێنن. شارەزایانی فیزیا و کیمیا و گیانداران، تەنها لەو بەشەدا ڕێڕەوی پسپۆریی دەگرنە بەر کە پەیوەندی بە گیان دەرهێنانەوە هەیە. تاقیگە و لابۆرەکانی وەزارەتی ئاشتی پڕن لەو پسپۆرانەی کە لە چۆڵاییەکانی بەرازیل و بیابانەکانی ئوستralیا و دوورگە ونەکانی جەمسەری خوارووی زەوی دەکۆڵنەوە. هێندێکیان ڕێی هاموشۆی خودڕۆ بۆ شەڕەکانی داهاتوو دەدۆزنەوە و هێندێکیان هەوڵی دۆزینەوەی بۆمبای گەورەتر و کاریگەرتر، و باڕووتی بەهێزتر و زرێپۆشی پتەوتر دەدەن. هێندێکی تریشیان خەریکی بەرهەمهێنانی گازی کوشندەترن یا ژەهرێ هاسانتر بتوێتەوە و زۆرترین بەرهەمی ڕووپۆشی زەوی بفەوتێنێ یا میکرۆبی نەخۆشی کە بەرانبەر هەموو دەرمانێکی ناسراو خۆی ڕاگرێ. هی وا هەن کە خەریکی داهێنانی جۆرە ئۆتۆمبیلێکن، وەک چۆن کەشتیشکێن بە بن ئاودا ڕێی خۆی دەکاتەوە، ئاوها بە ژێر زەویدا بڕوا. یا فڕۆکەیەک کە هەر ئەوەندەی بەلەمی چارۆکەیەک فڕگەی پێ بوێ. هێندێکی دی لەوانە دوورتر ڕۆیشتوون، خەریکن لە حەوا، دوور لە زەوی، بە زەڕەبین تیشکی خۆر ئاراستە بکەن و هەڵکشان و داکشانی دەریا و بوومەلەرزە، لە ڕێی دەسکاریکردنی گەرمایی چەقی زەوییەوە دەستەمۆ بکەن. بەڵام هیچ یەکێ لەو سێ پرۆژەیە لە ئەنجام نزیک نەکەوتۆتەوە و هیچ کام لە سێ زلهێزەکان بۆخۆی سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەرانبەر ئەوانی دی وەدەست نەهێناوە. ئەوەی لە هەمووی گرنگترە ئەوەیە کە هەرسێکیان، بە وەدەسهێنانی بۆمبی ئەتۆم، چەکێکی وایان چنگ کەوتووە کە زۆر لەوە بەهێزترە توێژەرەوەکانی خۆیان دایهێنن. هەرچەندە حیزب وەک پیشەی خۆی، داهێنانی بۆمبی ئەتۆم بۆ خۆی دەگێڕێتەوە، بەڵام بۆمبی ئەتۆم بۆ یەکەمین جار لە ناوەڕاستی چلەکاندا پەیدا بوو و دوای دە ساڵ بە شێوەیەکی فراوان بەکار هێندرا. ئەو سەردەمە، چەند سەد بۆمبێک بە جێیە پیشەسازییەکانی ڕووسیای ئەورووپا و ڕۆژاوای ئەورووپا و ئەمەریکای باکوردا کێشران. کاریگەریتیشی ئەوە بوو کە دەسەڵاتداران بگەنە ئەو باوەڕەی تەقاندنەوەی چەند بۆمبایەکی دی دەبێتە هۆی لەناوبردنی مرۆڤ و لە ئەنجامیشدا، نەمانی دەسەڵاتی خۆیان. دوای ئەوە بۆمبای دی نەتەقێندرانەوە هەرچەندە



بڕیار و ڕاگەیاندنی ئاشکراشی لەبارەوە دەرنەچوو. هەرسێ هێزەکە بەردەوام لە هەوڵی پەرەپێدانی چەکی ئەتۆمین و بۆ ڕۆژەڕەشێکی هەڵدەگرن کە درەنگ یا زوو دەبێ بێ. لەو کێشمەکێشەدا، ماوەی سی چل ساڵێک هونەری شەڕ لە جێی خۆیدا مایەوە. ئەوەندە بوو کۆپتەر جێی خودڕۆی گرتەوە و ڕاکێتی ئاراستەکراو لە بری فڕۆکەی بۆمبهاوێژ بەکار دەهێندرا و ژێرئاوی کە نقومبوونی نییە لە بری کەشتی شەڕ بەکار دەهێندرا. ئەوانەی لێ دەرچێ، پێشکەوتنێکی ئەوتۆ بەدی نەهات. تانک و ژێرئاوی و کەشتیشکێن و ڕەشاش و تەنانەت تفەنگ و نارنجۆکیش، تا ئێستا بەکار دەهێندرێن. لەگەڵ ئەوەشدا کە کوشتاری بێ پایان لە ڕێی چاپەمەنی و تەلەسکرینەوە ڕادەگەیەندرێ، بەڵام شەڕە کۆنەکان کە لە ماوەی چەند حەفتەیەکدا سەدان هەزار و بگرە ملیۆنان کوشتاریان تێدا دەدرا، چی دی نەقەومانەوە. هیچ یەکێ لەو سێ زلهێزانە کارێکی وا ناکات کە مەترسی تێکشکانی تەواوی تێدا بێ. هەر کاتێ چالاکییەکی گەورە ڕوو بدات، بۆ سەرسامکردنی هاوپەیمانێک ڕوو دەدا. ئەو ستراتیژییەی زلهێزەکان ڕەچاوی دەکەن یا وای دەردەخەن کە ڕەچاوی دەکەن، هەر یەکێکە. پلانەکە وەها دانراوە کە بە هۆی تێکهەڵقژان و شەڕەوە و لە کاتی گونجاودا، زەبری کوشندە لە خیانەتکاران بوەشێندرێ و چەند بنکەیەکی دەورەدراوی ئەم نەیار یا ئەو نەیار داگیر بکرێ تا ڕێکەوتننامە و دۆستایەتی لەگەڵدا، بە شێوەیەک مۆر کرێ کە تا ماوەی چەندین ساڵ خەو لە چاویان بزڕێنێ. ئەو ماوەیە، دەرفەتی ئەوە دەڕەخسێ کە ڕاکێتی ئەتۆمی لە گشت نوختە ستراتیژییەکاندا دانرێن و لە ئەنجامدا هەموویان بە جارێ بتەقێندرێن و کاریگەریتییان هێند گەورە بێ کە خۆ لێ لادانی بۆ نەبێ. ئەوجا کاتی ئەوە دێ بۆ خۆگرتکردنەوە و هێرشێکی دی پەیمانی دۆستایەتی مۆر کرێ. پێی ناوێ لێی بدوێین کە ئەم پلانانە تەنها خەیاڵن و هەرگیز نایەنە دی. هەروەها ئەو جێیانە نەبێ کە کەوتوونەتە سەر هێڵی پانی ناوەڕاستی زەوی و جەمسەرەکان و کێشەیان لە سەر هەیە، شەڕ لە هیچ جێیەکی دی ناقەومێ: هەرگیز کەس قەڵەمڕەوی ئەوی دی داگیر ناکات. ئەمەش ئەو ڕاستییە دەردەخات کە هێندێ شوێنی سنووری نێوان زلهێزەکان، بە زۆرداری سەپێندراون. بۆ نموونە، ئەوروئاسیا بە هاسانی دەتوانێ دوورگەکانی بەریتانیا، کە بە پێی نەخشەی جوگرافیایی بەشێکی ئەورووپان، بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. لە لایەکی ترەوە بۆ ئۆقیانووسیا زەحمەت نییە سنوورەکانی خۆی تا ڕێن یا تەنانەت (ویچسل)یش بەرین کاتەوە. بەڵام ئەمانە پێچەوانەی ئەو نەریتانەن کە هەموو لا ڕەچاویان دەکەن با تۆماریش نەکرابێتن. ئەگەر ئۆقیانووسیا، بۆ نموونە، ئەو

جێیانە داگیر بکا کە جاران ناویان فەرەنسا و ئەڵمانیا بوو، ناچارانە، یا دەبێ دانیشتوانیان ڕاگوێزێ کە کارێکی نەکردەیە یا دەبێ دەوری سەد ملیۆن خەڵکی لە میللەتێک تێدا نیشتەجێ بکرێن کە ڕادەی تەکنەلۆژیای لە هی ئۆقیانووسیاوە نزیک بێ. ئەم کارە بۆ هەرسێ زلهێزەکان وەک یەکە. هەر سێ زلهێزەکان گرینگی بەوە دەدەن کە چ پەیوەندییەک لە نێوان میللەتەکانیان و میللەتانی دەرەوەدا نەبێ مەگەر لەگەڵ دیل و کۆیلە ڕەشەکاندا، ئەوەش لە سنوورێکی یەکجار بەرتەسکدا. تەنانەت هاوپەیمانیش بەوپەڕی گومانەوە سەیر دەکرێ. دیلی لێ دەرچێ، هاوڵاتییەکی ئاسایی ئۆقیانووسیا هەرگیز چاوی بە هاونیشتمانێکی ئەوروئاسیایی یا ڕۆژهەڵاتی ئاسیایی ناکەوێ و فێربوونی زمانی بێگانەش قەدەغەیە. ئەگەر هاوڵاتییەک ڕێی پەیوەندی بە بێگانەوە هەبێ، بۆی دەردەکەوێ کە لە خۆی دەچن و هەرچی لە بارەوە بیستوون درۆیە. ئیدی ئەو دنیا سەرمۆر کراوەی کە تێیدا دەژی درزی دەکەوێتێ و ئەو ترس و ڕق و خۆپەسندییەی کە دەروونی لە سەر هەڵچندراون، لە بەین دەچن. لە بەر ئەوە هەرسێ هێزەکە لە سەر ئەوە ڕێکن کە هەرچەندە ئێران و میسر و جاوە و سیلان ئەم دەست و ئەو دەستیش بکەن، بەڵام بۆمبا نەبێ نابێ هیچ شتێ بە نێوانیاندا ڕەت بێ.

ئەو زەمینەی، ڕاستییەکە هەرگیز ڕاناگەیەندرێ، بەڵام بە جۆرە نهێنییەک لە سەری ڕێکن: ئەوەش ئەوەیە کە شێوەی ژیان لە ناو هەرسێ زلهێزەکەدا وێک دەچێ. لە ئۆقیانووسیادا، فەلسەفە گشتییەکە ناوی (سۆسینگ)ی لێ نراوە، بەڵام لە ئەوروئاسیادا بەلشەفیزمی نوێ و لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا ناوێکی چینی هەیە کە وەرگێڕانەکەی دەبێتە عەشقە مەرگ. بەڵام لەوانەیە واتای (خۆ فەوتان)ی باشتر بۆ بشێ. ئۆقیانووسیایی مەودای ئەوەی پێ نادرێ شتێ دەربارەی ڕێبازەکانی دی بزانێ هێندە نەبێ کە وەک تاوانی بەربڵاو و پێچەوانەی هۆش و ڕەوشت ناو ببرێ. لە ڕاستیدا، ئەو سێ فەلسەفەیە ڕێک و هاوتەریبن و لێک جودا ناکرێنەوە و ئەو سستەمە کۆمەڵایەتییەی پێکی دەهێنن بە هیچ شێوەیێ جیاوازییان نییە. لە هەموو شوێنێ، هەمان بینای هەرەمی و هەمان جۆرە پەرستنی سەرکردەی نیمچە یەزدان و هەمان دارایی کە بە شەڕ و بۆ شەڕ دەگەڕێ، لە ئارادان. لە بەر ئەوە سەرکەوتنی ئەو سێیە بە سەر یەکدیدا نەک هەر نایەتە دی بەڵکو چ دەسکەوتێکیشیان تێدا نییە تا ئەنجامی بدەن. بە پێچەوانەوە، تا نێوانیان نارێک بێ، وەک سێکوچکە زیاتر پشتی یەک دەگرن. دیارە وەک هەمیشە دەسەڵاتدارانی ئەو سێ زلهێزە لە کرداری خۆیان هەم بە ئاگان هەم لێی بێ ئاگان. ئەوەش دەزانن کە شەڕی بێ



سەرکەوتنی بەردەوام هەمیشە پێویستە و ئەوەش سەپاوە کە هیچ مەترسییەک لە سەر ڕەتکردنەوەی واقیع لە لایەن سۆسینگ و بیرە نەیارەکانی ترەوە لە ئارادا نییە. دەبێ لێرەدا ئەوە دووپات بکەینەوە کە شەڕی بەردەوامی بێ بڕانەوە، هەموو خەسڵەتێکی لە بناغەوەڕا گۆڕیوە.

زەمانی پێشوو، شەڕ وا دەناسرا کە درەنگ یا زوو دەبڕێتەوە. جا بە سەرکەوتنی یەکجاری بێ یا بە تێکشکانی یەکجاری. هەروەها زەمانی زوو، شەڕ هۆکاری تێکەڵاوبوونی خەڵکەکە بوو لەگەڵ واقیعدا. لە هەموو سەردەمێکدا، هەموو دەسەڵاتداران ویستویانە شێوەیەکی نادروستی دنیا پێشانی خەڵکی ژێر ڕکێفی خۆیان بدەن. بەڵام نەیانتوانیوە ئەو باوەڕە وەگەڕ خەن کە لە توانای سەربازیی سوپا کەم کاتەوە. مادام تێکشکان واتای ژێردەستی یا ئەنجامی خراپی هەبوو، بە گەرمی پێش بە شکست دەگیرا. ڕاستییە زەقەکان، چاویان لێ نەدەنوقێندرا. لە فەلسەفە و ئاین و ڕەوشت و سیاسەتدا، ڕەنگە دوو و دوو بیکردبایەتە پێنج. بەڵام کە باس بوو بە باسی تۆپ و فڕۆکە دەبوو هەر بکاتە چوار. ئەو میللەتانەی کە ڕۆڵیان دیار نەبوو هەر دەبوو لە بنەوە بن و هەوڵی زیادکردنی ڕۆڵی خۆیان، ڕەتکردنەوەی بندەستی بوو. بۆ بینینی ڕۆڵی خۆیان، هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە لە ڕابردووەوە فێر بن و بە وردی ئاگاداری ڕووداوەکانی بن. دیارە ڕۆژنامە و کتێبی مێژوو، دەسکاری وڕتووش دەکران، بەڵام مەحاڵ بووە بەو شێوەیەی ئێستا کرابێ. شەڕ ئێشککگری هۆش بوو. بە تایبەتی بۆ دەستەی فەرمانڕەوایان چاکترین ئێشککگر بوو. ئەنجامی شەڕ سەرکەوتن بوایە یا شکست، دەستی هیچ کام لە دەستەی فەرمانڕەواکان بە تەواوی لە دەسەڵات دوور نەدەکەوتەوە.

بەڵام ئەگەر شەڕ درێژەی کێشا، ئیدی مەترسیەکانیشی لە بەین دەچن. لە کاتی وادا شتێ نابێ پێی بڵێن پێداویستی سەربازیی. پێشکەوتنی تەکنیک ڕادەوێستێ و زەقترین واقیع پشتگوێ دەخرێ یا هاشای لێ دەکرێ. وەک دیتمان، ئەو لێکۆڵینەوانەی دەکرێن و بە زانستانە ناو دەبرێن، لە خزمەتی شەڕدان، بەڵام لە بنەڕەتدا جۆرە خەیاڵێکن کە ئاشکرا کردنی ئەنجامیان، گرینگ نییە. پۆلیسی خەیاڵی لێ دەرچێ هیچی دی لە ئۆقیانووسیادا کاریگەر نییە. لە بەر ئەوەی هیچ کام لە زلهێزەکان هی ئەوە نیە داگیر بکرێ، هەر یەکەیان دنیایەکی تایبەتی و جیاوازی پێک هێناوە و تێیدا، چۆنی بوێ وا هۆش دەگۆڕێ. واقیع تەنها لە پێداویستییەکانی ژیاندا خۆ دەنوێنێ – پێداویستی خواردن و خواردنەوە، کونجێکی حەوانەوە و پۆشاک، خۆپاراستن لە ژەهرخواردن و لە پەنجەرەی

سەرەوەڕا خۆهەڵدان و هەتا دوایی. هەتا ئێستا جیاوازی لە نێوان ژیان و مردن، خۆشی و ناخۆشیدا هەیە، بەڵام ئەوە هەموو شتێکە. دابڕان لە دنیای دەرەوە و ڕابردوو وای لە خەڵکی ئۆقیانووسیا کردووە دەڵێی لە ناو ئەستێرەکاندا بەرەڵا کراون و نازانن کوێ خوارەوەیە و کوێ سەرەوەیە. حوکمڕانانی ئەم زلهێزانە، حەوت پەڵیان بە تەنگەی فیرعەونەکان و قەڕاڵەکانی ڕۆمدا داوە. ناچارن نەهێڵن ژێردەستەکانیان لە برسا قڕیان تێ کەوێ و ناچارن ڕادەی پێشکەوتنی تەکنیکی شەڕ لە ئاستی توانای نەیارەکانیاندا ڕاگرن. بەم کەمترین دەسکەوتانە، دەتوانن واقیع بە شێوەیەک بگۆڕن کە خۆیان گەرەکیانە. لەبەر ئەوە، ئەگەر بە پێوانەی شەڕەکانی زەمانی زوو شەڕی ئەمڕۆ بپێوین، فرتوفێڵ نەبێ هیچی دی دەرناچێ. شەڕی ئێستا بە شەڕی ئەو (دووسم)انە دەچێ کە شاخیان بەرەو دواوە پێچی خواردووە و یەکتریان پێ زامدار ناکرێ. شەڕی وا، هەرچەندە ناواقعیانەش بێ بەڵام بێ مەعنا نییە. کاڵەی زیادە لووش دەکا و باری دەروونیی خەڵکی وڵاتی هەمەچین دەگونجێنێ. ئەوەتا ئاشکرایە کە شەڕ پێداویستییەکی ناوخۆییە. لە ڕابردوودا هەموو گروهە دەسەڵاتدارەکان دژی یەکدی دەجەنگان با نەشیانتوانیبێ ویستی وەک یەکی خۆیان ڕەچاو بکەن. وێرانکاریش بۆیە سنوورێکی هەبوو چونکە هەمیشە سەرکەوتوو دەستی بە سەر وڵاتی دۆڕاودا دەگرت. هەرگیز لەم سەردەمەدا بەربەرەکانێی یەکدی ناکەن. دەسەڵاتداران، دژی ژێردەستەکانی خۆیان شەڕ وەگەڕ دەخەن. ئامانجی شەڕ، پاراستن یا فراوانکردنی ناوچەی قەڵەمڕەو نییە، بەڵکو ئەوەیە کۆمەڵگە دەقی نەشکێ. وشەی "جەنگ" بەخۆی گومڕا کراوە. ئەگەر بڵێین بە هۆی بەردەوامیی شەڕەوە چ شەڕ لە ئارادا نەماوە، زۆرمان نەگوتووە. شێوەی چەوساندنەوەی مرۆ، هەر لە سەردەمی بەردەوە بگرە تا دەگاتە سەرەتای سەدەی بیستەم، گۆڕاوە و شێوەیەکی تر جێ گرتۆتەوە کە زۆر جیاوازە. ئەگەر ئەو زلهێزانە لەبری شەڕ لە سەر ئەوە پێک بهاتبان کە ئاشتی بەردەوام بسەپێ، شتێکی ئەوتۆ نەدەگۆڕا چونکە ئەو کاتە هیچیان ناچاری جیهانی دەرەوە نەدەبوون و بۆ هەمیشە لە مەترسی دەرەکی دوور دەبوون. ئاشتی پایەدار و بەردەوام وەک شەڕی پایەدار و بەردەوام وایە. ئەمەیە واتای ئەو دروشمەی حیزب کە دەڵێ شەڕ ئاشتییە – هەرچەندە زۆربەی ئەندامانی حیزب تەنها واتا ڕواڵەتیەکەی دەزانن.

وینستۆن تاوێ لە خوێندنەوە کەوت. لە دوورەوە دەنگی تەقینەوەی تۆپ دەهات. هەستی بەختەوەری بەوەی کە خۆی و کتێبە قەدەغەکە، پێکەوە لە ژوورێکی بێ تەلەسکریندان، هێشتا بەری نەدابوو. تەنهایی و ئاسوودەیی لەگەڵ هەستی ماندوێتی



جەستەی و کورسییە نەرمەکە و ئەو کزەبایەی کە لە پەنجەرەکەوە دەهات و بە سیمایدا دەخشا، تێکەڵ دەبوون. کتێبەکە ئەفسووناوی بوو. یا بە شێوەیەکی وردتر بڵێین، هەستی دڵنیایی پێ دەبەخشی. بە شێوەیەکی گشتی، کتێبەکە شتێکی تازەی تێنەگەیاند و ئەمەش هۆیەکی گرینگێتیی بوو. ئەگەر ئەمیش هۆشی خۆی گرد کردباوە، هەمان شتی دەگوت. بەرهەمی مێشکێ بوو کە جیاوازی لەگەڵ مێشکی ئەمدا نەبوو هێندە نەبێ کە بەتواناتر و ڕەوانتر بوو و ترسیشی لێ بار نەکرابو. بۆی دەرکەوت کە چاکترین کتێب ئەوانەن، باسی شتگەلێکت بۆ دەکەن کە خۆت دەیانزانی.

تازە گەڕابۆوە سەر بەشی یەکەم، گوێی لە دەنگی پێی جولیا بوو کە بە سەر قاڵدرمەکەدا سەردەکەوت و بە دیتنی گەشایەوە. جولیا جانتا قاوەییەکەی دانا و خۆی هاویشتە ئامێزییەوە. حەفتەیەک پتر بوو یەکیان نەدیبوو.

دوای لەئامێزگرتن وینستۆن گوتی: – کتێبەکەم وەرگرت.

جولیا بێ ئەوەی زۆر خۆی بە خاوەنی بکا گوتی: "بەڕاستتە؟!.چەند باشە!."

ئیدی بە دیار تەباخەکەوە کەوتە سەر چۆک و کەوتە قاوەلێنان.

بەر لەوەی ماوەی نیو سەعات لە ناو پێخەفدا پێکەوە بەسەر بەرن، باسی ئەو مەسەلەیە نەهاتەوە گۆڕێ. تا دەهات دەرەوە سارد دەبوو و سەرما پەردەی پێ دادانەوە. لە خوارەوەڕا، دەنگی گۆرانییە ئاشناکە و هەنگاوی پتەو، لەحەسارە بەردڕێژەکەوە، بە بەردەوامیی دەهات. ئەو ژنە بەهێز و بازوو سوورخنەی کە وینستۆن لە یەکەم هاتنیدا دیبووی، لە خوارەوە بوو و یەکێ بوو لە بابەتە نەگۆڕەکانی دەرێ. دەتگوت ساتێکی ڕۆژ نییە ئەو ژنە لە نێوان تەشتەکە و تەنافەکاندا نەیات و نەچێ و قولابی جلگری بە زارەوە نەبێ و لە بەر خۆیەوە گۆرانی نەچڕێ. جولیا لەسەر لا، ڕێک ڕاکشابوو و وەنەوزی دەدا.

وینستۆن کتێبەکەی لە عاردی هەڵگرت و پشتی بە سەرینی سەر قەرەوێڵەکەدا دایەوە. گوتی: " دەبێ بیخوێنینەوە. تۆش. دەبێ هەموو ئەندامانی ئەنجومەنی برایەتی بیخوێننەوە.

جولیا بە چاوی داخراوەوە گوتی: "تۆ بیخوێنەوە. بە دەنگی بڵند بیخوێنەوە. ئەوە باشترین شێوەی خوێندنەوەیە. لە بەرەوە بۆشم ڕوون بکەوە."

کاتژمێرەکە شەشی پێشان دەدا کە دەیکردە هەژدە. سێ و چوار سەعاتی دی کاتیان هەبوو. کتێبەکەی خستە سەر چۆکی و دەستی پێ کرد:

بەشی یەکەم

## نەزانیی هێزە

لەو دەمەوەی کە مێژوو پەی پێ دەبا و پێ دەچێ لە دوای سەردەمی بەردەوە بێ، ئەم جیهانە سێ دەستە مرۆڤی تێدا ژیاون: یەکێکیان دەستەی باڵایە، یەکێکیان دەستەی ناوەنجییە و ئەوی تریشیان دەستەی دامێنە. ئەو سیانەش بە سەر دەستە و تاخمی لە خۆیان گچکەتردا دابەش بوون کە ناوی هەمە چەشنەیان بووە و ڕێژەی هەر یەکێکیان و پەیوەندی نێوانیان، لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دی گۆڕاوە هەرچەندە لە ناوەڕۆکی ڕاستەقینەدا هەرگیز نەگۆڕاوە. تەنانەت دوای ڕووداوی گەورە و گۆڕانکاری بە ڕواڵەت دەگمەنیش، هەمیشە هەمان کێشانە و پێوانە خۆی سەپاندووە. ڕێک وەک ئامێری هاموشۆ کە ڕوو لە هەر جێیەک بکا، هەر یەکە لە بەشە پێکهێنەرەکانی لە جێی خۆیدا دەمێنێ.

– جولیا وەئاگای؟.

– بەڵێ ئازیزم، گوێ دەگرم. قەوماوە.

وینستۆن لە سەری ڕۆیشت:

ئەو سێ دەستەیە هەمیشە بەرژەوەندییان جیاوازە. ئامانجی دەستەی باڵا ئەوەیە لە جێی خۆیدا بمێنێ. ئامانجی دەستەی ناوەنجی ئەوەیە جێی ئەوەی یەکەم بگرێ. ئامانجی دەستەی دامێنیش، ئەگەر ئامانجی هەبێ – چونکە بارودۆخی دەستەی دامێن ئەوەیە کە بە کاری گران بهاڕدرێ و جاروبارێ نەبێ چ ئاگای لە دەرەوەی ژیانی ڕۆژانەی خۆی نییە – ئەوەیە جوداوازی نەمێنێ و کۆمەڵگەی هاوسان دامەزرێ. بەم شێوەیە بە درێژایی مێژوو ئەم ململانێ و هاوکێشەیە دووبارە دەبێتەوە. لە مەودای دووردا، دەستەی باڵا بە ڕواڵەت، بە کەیفی خۆی لە سەر تەختی دەسەڵات پاڵی لێ دەداتەوە. بەڵام درەنگ یا زوو ئەو ڕۆژە دێ کە باوەڕبەخۆبوونی یا شایستەبوونی فەرمانڕەوایی یا هەردووکیان لە دەست دەدا ئەو دەمەش لە لایەن دەستەی ناوەنجییەوە لەناو دەبرێ. لەم کەین و بەینەدا دەستەی ناوەنجی جێی دەستەی دامێن لە لای خۆی دەکاتەوە. هەر کە گەیشتیشە مەبەستی خۆی ئیدی دەستەی دامێن دەگەڕێتەوە دۆخی جاران و بەخۆشی دەبێتە دەستەی باڵا. دەمودەستیش دەستەی ناوەنجی نوێ، لە یەکێ لەو دووە یا لە هەردووکیان پێک دێتەوە و ململانێکەش سەر هەڵدەداتەوە. لەم سێ دەستەیەدا هەر دەستەی دامێن بە ڕێرەویش بێ،



بە ئامانجی خۆی ناگا. زیادەڕۆییە ئەگەر بڵێین لە مەودای هەموو مێژوودا سەرکەوتنی ماتریالی نەهاتۆتە دی. تەنانەت ئەمڕۆ، لە سەردەمی تێکشکاندنیشدا، حاڵوباری مرۆ لە چەند سەدەیەک لەمەوبەر لەبارترە. بەڵام پێشکەوتنی دارایی و گۆڕانی خەسڵەت و پەرەسەندن یا کودەتا، هەندەی نوکە دەرزییەک نابەرابەرییان نەگۆڕیوە. لە دەستەی دامێندا ناوی خاوەن کارەکان نەبێ، هیچ جۆرە گۆڕانکارییەکی مێژوویی نەهاتۆتە دی.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوەڕا، ئیدی دووبارەبوونەوەی ئەم ڕێبازە لە لای چاوکراوان ئاشکرا بوو. لەوەوە قوتابخانەی فەلسەفی وا سەریان هەڵدا کە مێژوویان وەک بازنەیەکی داخراو شی دەکردەوە کە تیایدا نابەرابەری یاسای نەگۆڕی ژیانی مرۆڤە. دیارە ئەم بۆچوونە، هەمیشە لایەنگری خۆی هەبووە. بەڵام وەک ئێستا دەردەکەوێ ناوەڕۆکی دەگۆڕا. لە ڕابردوودا پێداویستی کۆمەڵگەی هەمەچین، فەلسەفەیەک بوو بە تایبەتی لای دەستەی باڵا، و لە لایەن پاشا و قەشە و یاساناسان و ئەوانەی لە کەوڵی ئەماندا دەژیان ڕادەگەیەندرا و بە گشتی بەڵێنی (جەزادانەوە)ی ئەو دنیای تێدا بوو. دەستەی ناوەنجی، هەتا لە هەوڵی بەدەستهێنانی دەسەڵاتدا بوایە، باسی زاراوەی وەک هاوسانی و برایەتی و ئازادی دەکرد. هێشتا نەدەگەیشتە ئەو پلەیەی دەسەڵاتی لە دەستدا بێ، بەڵام زۆری نەدەما بیگاتێ، واتای برایەتی مرۆڤی لە لا دادەپۆشرا. پێش ئەوانە، چەندین شۆڕش لە ژێر دروشمی چوونیەکیدا بەرپا کراون. بەڵام هەر بە لەناوبردنی زۆرداری کۆن، هەناسە وەبەر زۆرداری نوێدا هاتووە. دەستەی نوێ، پێشەکی زۆرداریێتی خۆیان ڕادەگەیاند. سۆسیالیزم، ئەو تیۆرییەی کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا دەرکەوت و دوا ئاڵقەی زنجیرەی هۆش بوو کە بۆ سەردەمی کۆنی شۆڕشی کۆیلەکان دەگەڕایەوە، تۆباوییە کۆنەکانی گرتەوە. بەڵام لە هەموو نەگونجانێکی سۆسیالیزمدا کە لە سەرەتای (١٩٠٠)ەوە دەردەکەوت، زیاتر و زیاتر بە دابینکردنی سەربەستی و یەکسانییەوە دەبەسترایەوە. بزووتنەوەی نوێ کە لە ناوەڕاستی ئەم سەدەیەوەڕا پەیدا بوون: سۆسینگ لە ئۆقیانوسیا و بۆڵشەفیزمی نوێ لە ئەوروپا و ویستی مەرگ – کە بە گشتی وا ناو دەبرا – لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا، ئەو ئامانجەیان هەبوو کە نائازادی و نابەرابەری بەرپا بکەن. ئەم بزووتنەوە نوێیانە، لە سەر درەختی بزووتنەوە کۆنەکان ڕواون و لەوەدا سەرکەوتن کە ناویان بهێڵنەوە و لابەلایی پێیاندا هەڵبڵێن. بەڵام مەبەستی ڕاستییان ئەوە بوو کە بەر بە پێشکەوتن بگرن و لە ساتێکی دیاریکراودا چەرخی مێژوو ڕاگرن. دەبوو جارێکی تریش وەرچەرخانی مێژوو ڕوو بداتەوە ئەوسا بوەستێ. وەک هەمیشە،

دەبوو دەستەی باڵا جێ بۆ دەستەی ناوەنجی چۆڵ بکا، کە ببوو بە دەستەی باڵا. بەڵام ئەم جارەیان بە ستراتیژییەکی ژیرانەوە، دەستەی باڵا پێی کرا پلە و پایەی خۆی بۆ هەمیشە بپارێزێ.

لە لایەکەوە بە هۆی کۆکردنەوەی شارەزایی مێژوییەوە، لە لایەکی تریشەوە بە هۆی گەشەکردنی تێگەیشتنی مێژووەوە کە بەر لە سەدەی نۆزدە لە ئارادا بوون، باوەڕی نوێ سەریان هەڵدا. ئیدی بزووتنی بازنەیی مێژوو گونجاو بوو یا پێ دەچوو گونجاو بێ. ئەگەر واش بووبێ، دیارە توانای گۆڕینی بووە. بەڵام هۆی سەرەکی و قووڵ ئەوە بوو کە یەکسانی مرۆ، لە سەرەتای (١٩٠٠)ەوە توانای وەگەڕکەوتنی پەیدا کرد. هێشتا هەر ڕاست بوو کە مرۆ بە زگماک چوونیەک نین و دەبێ ئەرکیشیان بە شێوەیەک جودا بێ کە کۆمەڵێکیان لە کۆمەڵەکەی دی هان بدرێ. لەگەڵ ئەوەشدا، پێداویستی ڕاستەقینە ئەوە نەبوو کە جوداوازی چینایەتی یا جیاوازی فراوانی سامان لە ئارادا بێ. لە زەمانی پێشوودا، جیاوازی چینایەتی هەر ئەوە نەبوو کە خۆلێلادانی بۆ نەبێ بەڵکو ئامانج بوو. نایەکسانی مرۆ نرخی شارستانییەت بوو. لە هەناوی پیشەسازی و لەگەڵیدا، شێوەی پەیوەندییەکان گۆڕا. هەرچەندە هێشتا پێویست بوو کە خەڵکی کاری هەمەجۆر ئەنجام بدەن، بەڵام چی تر پێی نەدەویست لە پلەی کۆمەڵایەتی و ئابووری جیاوازدا بژین. لە گۆشەنیگای ئەو کۆمەڵە دەسەڵاتدارە تازانەوە، یەکسانی ئامانجێ نەبوو هەوڵی بەرپابوونی بدرێ بەڵکو مەترسییەک بوو کە دەبوو بەربەرەکانی بکرێ. لە سەردەمە سەرەتاییەکاندا کە نەدەکرا کۆمەڵگەی ئاسوودەی پڕئاسایش پێک بهێندرێ، باوەڕ پێ هێنانی هاسان بوو. وەک بەهەشتی ڕووی زەوی، خەڵکی بە برایانە و بە پەنای یەکەوە بژین. بێدادی و کاری گران، هەزاران ساڵ خەیاڵی مرۆڤیان بە خۆیانەوە خەریک کردووە. ئەم خەیاڵە، چنگی لەوانەش گیر کرد کە لە هەموو گۆڕانکارییەکی مێژوییدا سوودمەند دەبوون. بەرۆگرانی شۆڕشی فەرەنسا و ئینگلیز و ئەمەریکا، بە قسەی خۆیان، بۆ مافی مرۆڤ و مافی ڕادەربڕینی ئازادانە و بەرابەری لە بەردەم یاسادا و بابەتی وەک ئەوانە هەوڵیان دەدا و تەنانەت هەڵسوکەوتی خۆشیان بەوانەوە گرێ دەدا. بەڵام لە چلەکانی سەدەی بیستەمدا، هەموو ڕێبازێکی سیاسیانە توندڕۆ بوون. بەهەشتی سەر زەوییان ڕێک لە کاتی پێکهاتنیدا تێک دا. هەموو تیۆرییەکی سیاسی، هەر ناوێکیان لە خۆ نابێ بە زنجیری پلە و پایە، و گەلەکۆمەکێ بەسترابۆوە. لە سایەی ئەو توندوتیژییە گشتگر و ئاشکرایانەدا و لەو بارودۆخەدا کە لە دەوروبەری (١٩٣٠) ڕەخسابوو، ئەو خەسێتانەی کە دەمێ بوو



دەستیان لێ هەڵگیرابوو، هەندێکیان سەدان ساڵیش بوو نەمابوو – بەندکردنی بێ دادگا و بێگار بە یەخسیران و هەڵواسینی سەر شەقامەکان و ئەشکەنجەدان بۆ دانپێدانان و ڕەشبگیری و ڕەوپێکردنی بە کۆمەڵ – نەک تەنها ڕەواجیان پەیدا کردەوە، بەڵکو جێی ڕەزامەندیش بوون و لە لایەن هێندێ لەو کەسانەوە کە خۆیان بە ڕۆشنبیر و پێشکەوتوو دەزانی، بەرگریشیان لێ دەکرا.

دوای دە ساڵەکانی شەڕی میللی و ناوخۆیی و شۆڕش و شۆڕشی چەواشە، لە هەموو جێیەکی جیهاندا سۆسینگ و باوەڕە نەیارەکانی لە سەر شێوەی تیۆری سیاسیانەی قاڵبگرتوودا دەرکەوتن. بەڵام ڕژێمە هەمەجۆرەکان کە بە گشتی بە تۆتالیتێر ناسرابوون و لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا پەیدا بوون، تیشکیان هاویشتە سەر و هێڵە سەرەکییەکانی جیهان کە لە ئەنجامی کێشە و هەرادا سەریان هەڵدا بوو، زوو بە ئاشکرا دەرکەوتن. بە هەمان شێوە، ئەو بابەتە خەڵکەی کە دنیا دەکەوتە ژێر ڕکێفیانەوە ئاشکرا بوون. ئەریستۆکراتە نوێیەکان کە جێی زۆربەی بیروکراتەکانیان گرتەوە، لەگەڵ زاناکان و تەکنیکییەکان و سازمانی بازرگان و پسپۆرانی ڕاگەیاندن و کۆمەڵناسان و مامۆستایان و ڕۆژنامەگەران و سیاسەتمەداران و پیشەوەراندا پێک هاتن. ئەمانە کە ڕەگیان دەگەڕایەوە سەر مووچەخۆران و توێژاڵی باڵای کرێکاران، خۆیان ڕێک خست و بە هۆی ئەو دنیا نەزۆکەوە بەڕێوە دەچوون کە مۆنۆپۆڵی کارگە و ڕێبەرایەتی ناوەندی پێکیان هێنابوو. بە گوێرەی چەشنی ڕابردووی خۆیان، ئەمانە بەرچاوتێرتربوون و کەمتر دوای دەسکەوتی تایبەتی خۆیان دەکەوتن و زیاتر تێنووی بەدەسهێنانی دەسەڵات بوون و پتر هەڵپەی تێکشکاندنی بەرهەڵستکاری خۆیان دەکرد. ئەم جیاوازییەی دوایی، لە هەموو ئەوانی دی زەقتر و ئاشکراتر دیار بوو. بە گوێرەی ئەم چەوساندنەوەیەی کە ئێستا هەیە، چەوساندنەوەی کۆن ئاهەنگ بوو. دەستەی دەسەڵاتدان، تا ڕادەیەک لەگەڵ بیری ئازادیخوازانەدا بوون و حەزیان دەکرد دەروازەی کراوە بهێڵنەوە و گرینگییان بە کاروباری بەرچاوان داوە و کاریان بەوە نەبووە چی بە هۆشی خەڵکی ژێر ڕکێفیاندا دەگوزەرێ. بە گوێرەی پێوانەی تازە، تەنانەت کڵێسای سەدەکانی ناوەڕاستیش لێبووردنیان هەبووە. لایەنێکی بەڵگەی ئەمە ئەوەیە کە هیچ دەوڵەتێک توانای چاودێریکردنی بەردەوامی خەڵکەکەی نەبووە. بەڵام داهێنانی چاپ، کۆکردنەوەی باوەڕی خەڵکی بە شێوەیەکی گشتی هاسان کرد و فلیم و ڕادیۆ ش ئەم هەنگاوەیان فراوانتر کرد. بە بڵاوبوونەوەی تەلەڤزیۆن و پێشکەوتنی ئەم ئامێرە کە وای لێ هات لە یەک کاتدا سیما و دەنگ دەربخا

و سیما و دەنگیش وەرگریٚ، ئیدی ژیانی تایبەتی لە ئارادا نەما. هەموو هاونیشتمانییەک، یا هەموو ئەوانەی کە شایانی چاودیٚریکردن بن، دەکرا هەموو کاتیٚ لە بەر چاوی پۆلیسدا بن و بیستوچوار سەعاتە ڕاگەیاندنیان بە گویٚدا بکریٚ. لە هەمان کاتیشدا گشت کەناڵیٚکی تری پەیوەندی داخران و ئیدی بۆ یەکەم جار گویٚڕایەڵیی بۆ دامودەزگای دەوڵەت و یەکجۆرکردنی بیر و باوەڕ بە سەر خەڵکدا سەپاند.

دوای مەودا شۆڕشیەکەی ساڵانی پەنجا و شیٚست، دەستەی باڵا و ناوەنجی و دامیٚنی کۆمەڵگە، وەک هەمیشە خۆیان ڕیٚک خستەوە. بەڵام ئەم جارەیان دەستەی باڵا بە پیٚچەوانەی ئەوانەی پیٚشووترەوە، بە گویٚرەی خووی خۆڕسک ڕەفتاری نەکرد و دەیزانی چی بۆ پاراستنی پلە و پایەی خۆی پیٚویستە. دەمیٚ بوو دیار بوو کە تەنها شیٚوەی بەڕیٚوەبردنی کۆمیتەیی بەڕیٚوەبردنی دەوڵەت ڕیٚبازی بیٚ سەرهیٚشەیە. ئەگەر سامان و دەسەڵاتت لە دەستدا بن، بە هاسانی هەردووکیانت پیٚ دەپاریٚزریٚ. بە ناوە (نەهیٚشتنی خاوەنداریٚتی تایبەتی) کە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا پەیدا بو، لە ڕاستیدا ئەوەی دەگەیاند کە خاوەنداریٚتی بکەویٚتە دەستی ژمارەیەکی کەمتری خەڵکەوە. بەڵام ئەو جیاوازییەش هەبوو کە خاوەنە تازەکان لە بری ئەوەی لە تاکەتاکەی خەڵکیٚکی زۆر پیٚک بیٚن، تویٚژاڵیٚ بوون. لە ئاستی تاکە کەسیدا هیچ یەکیٚ لە ئەندامانی حیزب خاوەنی شتی تورەهاتی تایبەتی نەبیٚ خاوەنی هیچ نین. لە ئاستی کۆمەڵیشدا، حیزب خاوەنی ئۆقیانووسیایە چونکە ئەگەر خاوەن دەسەڵات هەموو شتیٚ بیٚ، چۆنی بە پیٚویست بزانیٚ وای هەڵدەسووڕیٚنیٚ. لە ساڵانی پیٚش شۆڕشدا، حیزب توانی بە بیٚ هیچ بەرهەڵستیٚکی ئەوتۆ، بگاتە پایەی ڕیٚبەرایەتی لە کاتیٚکدا ڕەوەندی گشتیی، وەک ئەرکی دەستەجەمعی دەردەخرا. هەمیشە وا باو بووە کە هەر کاتیٚ سەرمایەدار بڕووتیٚندریٚتەوە، ئەنجامەکەی دەبیٚتە سۆسیالیزم. سەرمایەدارانیش بە بیٚ هیچ لەقەفڕکیٚیەک لە خاوەنداریٚتی کەوتبوون. کارگە و کان و زەوی و خانوو و ئەسبابی هاموشۆ و هەموو شتیٚکی تریان لیٚ سەندرا. لە بەر ئەوەی چی دی خاوەنداریٚتی تایبەتی لە ئارادا نەبوو، دەبوو هەر ببیٚتە خاوەنداریٚتی گشتی. سۆسینگ کە لە هەناوی سۆسیالیزمی پیٚشووتر بەربۆتەوە و فەرهەنگ و زاراوەی لەوەوە بۆ ماوەتەوە، بە ڕاستی بەندیٚکی بنەڕەتی لیٚ هیٚنایە دی کە تیٚیدا، پیٚشەکی پیٚشبینی ئەوە کراوە کە نایەکسانی دارایی، دیاردەیەکی بەردەوامە. بەڵام ڕەگی کیٚشەی هەمیشەی کۆمەڵگەی فرەچین لەوە قووڵترە. تەنها چوار ڕیٚگە بۆ ڕووخاندنی دەستەی دەسەڵاتدار لە ئارادایە. یا لە لایەن هیٚزی دوژمنی دەرەکییەوە تیٚک دەشکیٚ، یا شیٚوەی



نارێکی ڕیٚبەرایەتی چاوی خەڵکی بۆ یاخیگەریٚتی دەکاتەوە، یا باوەڕ بە خۆبوون و ئارەزووی حوکمڕانی لە دەست دەدا. ئەم هۆکارانە، هەر یەکەیان بە تەنیٚ ناکەویٚتە گەڕ و وەک یاسایەک، هەموویان بە یەک پلە پەیدا دەبن. دەستەی دەسەڵاتدار کە خۆی لیٚیان دەپاریٚزیٚ، دەتوانیٚ بە بەردەوامی لە سەر تەختی دەسەڵات بمیٚنیٚتەوە. تەنها باری دەروونی خودی دەستەی دەسەڵاتدار دەمیٚنیٚ کە کاریگەریٚتی هەبیٚ.

لە ناوەڕاستی ئەم سەدەیە بە دواوە، چی دی مەترسی یەکەم لە ئارادا نەما. هیچ یەکیٚ لەو زلهیٚزانە کە دنیایان لە نیٚوان خۆیاندا دابەش کردووە، هی ئەوە نییە بکەویٚتە ژیٚر ڕکیٚفی ئەوانی ترەوە. مەگەر بە گۆڕانکاری لەسەرخۆی کۆمەڵگە و لە ڕکیٚف دەرچوونی بیٚ کە ئەمەش بە ئاسانی چارەسەر دەکریٚ. مەترسی دووەم، تەنها تیۆرییە. هەرگیز جەماوەر بە پیٚی ویستی خۆی مل بە یاخیبوونەوە نانیٚ و تەنها لە بەر چەوساندنەوە یاخی نابیٚ. لە ڕاستیدا، مادام پیٚوەری هەڵسانگاندنیان نەخراوەتە بەردەست، هەرگیز هەست بە چەوساندنەوەی خۆیان ناکەن. کیٚشەی یەک لە دوای یەکی دارایی دەورانەکانی پیٚشوو هیچ پیٚویست نەبوون و ئەمڕۆ ڕیٚی ڕوودانیان نادریٚ. بەڵام بشیٚویٚنی دی بە ئەندازەی جاران بۆی هەیە بقەومیٚ. کەچی ئەو بشیٚویٚنیانە چ ئەنجامیٚکی سیاسییان نابیٚ چونکە ڕیٚی دەربڕینی ناڕەزایی لە ئارادا نییە. کیٚشەی کاڵەی زیادەش کە لەگەڵ پەرەسەندنی ئامیٚردا پەیدا بووە، بە شەڕی بەردەوام چارەسەر دەکریٚ (بڕوانە بەشی سیٚیەم). لە هەمان کاتیشدا، بۆ بەرزکردنەوەی ورەی گشتی بە کەڵکە. لە گۆشەنیگای دەسەڵاتدارانی ئیٚستامانەوە، تاکە مەترسیی ڕاستەقینە ئەگەر هەبیٚ، پەیدابوونی تویٚژاڵیٚکی نویٚیە لە خەڵکی بە توانا و کەمکار و تیٚنووی دەسەڵات، و پەرەسەندنی لیبرالیزم و گومڕایی لە ڕیزی هاوتەرحەکانیاندا کە لە ناو ڕیزی دەسەڵاتداراندان. کەوابیٚ مەسەلەکە مەسەلەی فیٚرکردن و ڕاهیٚنانە. کیٚشەکە بەوە چار دەکریٚ کە بەردەوام زەینی دەستەی ڕیٚبەرایەتی و هەڵسوڕیٚنەرانی کار، بە تایبەتی ئەمەی دووەم کە فراوانترە و ڕیٚک بە دوای یەکەمدا دیٚ، بگونجیٚ. زەینی ڕەشەخەڵکەکەش هەر ئەوەندەی دەویٚ بەرەو نەریٚتی ئاراستە بکریٚ.

دەتوانین بەم پیٚشەکییە شیٚوازی کۆمەڵگەی ئۆقیانووسیا شارەزا بین ئەگەر تا ئیٚستا شارەزای نەبووبین. لووتکەی هەرەمی کۆمەڵ (ڕیٚبەری گەورە)یە. ڕیٚبەری گەورە لە هەڵە بە دەرە و یەکەم بەتوانایە. هەموو جۆرە پیٚشکەوتن و پیٚشخستن و داهیٚنانی زانستانە و زانایی و هۆش و بەختەوەری و چاکە، لە ڕیٚبەرایەتی ڕوحیی ئەوەوە سەر هەڵدەدەن. ڕیٚبەری گەورە بە چاو نابیندریٚ. سیمایەکە بە دیوارەکانەوە و دەنگیٚکە لە تەلەسکرینەوە.

به دڵنیایییەوە دەتوانین بڵێین کە ڕێبەری گەورە ژیانی ئەبەدیی هەیە و نەمرە، و لە لەدایکبوونیشی دڵنیا نین. ڕێبەری گەورە ڕوویەکە و حیزب لێیەوە خۆ پێشانی جیهان دەدا کاریگەرێتی ئەو ئەوەیە کە چەقی خوشەویستی و ڕق و ڕێز بێ (ئەو هەستانەی کە لە تاکە کەسدا کۆ دەبنەوە نەک ڕێکخراو). ناوەندی حیزب لە خوار ڕێبەری گەورەوە دێ. ژمارەی دیاریکراوی ناوەندی حیزب دەگاتە شەش ملیۆن یا لە سەدا دووی دانیشتوانی ئۆقیانووسیا. دوای ناوەندی حیزبیش ئەندامانی ئاسایی دێن. ئەگەر ناوەندی حیزب بە مۆخی دەوڵەت دانێین، ئەندامانی ئاسایی ڕێک جێی دەست و پێ دەگرنەوە. لە خوار ئەوانیشەوە ڕێکخراوی کەڕ و لاڵ دێن کە بە کرێکاران ناو دەبرێن. ئەمانە، لەوانەیە لە سەدا هەشتا و پێنجی دانیشتوانی ئۆقیانووسیا پێک بهێنن. بە پێی دابەشکردنی پێشوومان، کرێکاران دەبنە دەستەی دامێن. کۆمەڵگەی دەوروبەری هێڵی پانی ناوەڕاستی زەوی کە ئەم دەست و ئەو دەستیان پێ دەکرێ، بەشێکی پێویستی پێکهاتنی کۆمەڵگە نین.

لە بنەڕەتدا، ئەندامبوون لەو سێ دەستەیەدا بە پێی ڕەچەڵەک نییە. منداڵێک کە لە دایک و بابێکی ناوەندی حیزب دەکەوێتەوە،بە پێی تیۆری، بەخۆی لە ناوەندیی حیزب نەکەوتۆتەوە. وەرگرتنی ئەندام لە بەشە جیاجیاکانی حیزبدا، دوای تاقیکردنەوە، لە شانزەساڵیدا ئەنجام دەدرێ. جوداوازی ڕەگەزیش لە ئارادا نییە و شارێ پێش شارێکی دی، لەم مەودایەدا ناکەوێتەوە. جوولەکە و قول و هیندییە سوورەکانی ئەمەریکای خواروو، لە پلە باڵاکانی حیزبدا بەرچاو دەکەون و بەڕێوەبەرانی ناوچەکان لە دانیشتوانی خۆیان هەڵدەبژێردرێن. لە هیچ کوێی ئۆقیانووسیادا، دانیشتوان هەست بەوە ناکەن کە کۆلۆنی کراون و لە پایتەختێکی دوورەوە فەرمانڕەوایی دەکرێن. ئۆقیانووسیا پایتەختی نییە و جێی سەرکردەکەی کەس پێی نازانێ. جگە لەوەی کە ئینگلیزی زمانی گشتییە و گوتەی نوێ زمانی ڕەسمییە، وڵات چ مەرکەزییەتێکی تێدا نییە. بەڕێوەبەران، بە هۆی پەیوەندی خوێنەوە پێکەوە گرێ نەدراون بەڵکو بە هۆی بیر و باوەڕی هاوبەشەوە. بەڵێ ڕاستە لە یەکەم سەرنجداندا دەردەکەوێ کۆمەڵگەکەمان جیاوازی چینایەتی زۆر قووڵی تێدایە و دەڵێی ئەم جیاوازییانە پشتاوپشت هاتوون.

جوداوازی چینایەتی لە سەردەمی سەرمایەداری و تەنانەت سەرەتای سەردەمی پیشەسازیشدا هەبووە. بێ گومان گۆڕانکاری لە بەشە جیاجیاکانی حیزبدا کراون، بەڵام هەر تا ئەو ڕادەیەی کە ئەندامی سستی ناوەندی حیزب دەرکراوە و ڕێی بەرزبوونەوەی



ئەندامی پێویست، بۆ پڕکردنەوەی کەلێن و جێی مەترسی دراوە. لە ڕاستیدا، پرۆلیتار بۆی نییە بێتە ڕیزی حیزبەوە. هەرە لێهاتوویان کە لەوانەیە گیانی ناقایلبوونی تێدا بێ، دەدرێتە دەستی پۆلیسی خەیاڵ و لە بەین دەبرێ. ئەم شێوە چارەسەرانەش، هەمیشەیی نین. حیزب بە پێی واتای کۆنی وشەکە، لە دەستەی باڵای کۆمەڵ پێک نەهاتووە و گواستنەوی دەسەڵاتیش نییە لە خۆیانەوە بۆ نەوەی خۆیان. ئەگەر ڕێیەکی دی بۆ فەراحکردنی دەسەڵات و پێشخستنی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی نەبێ، دەبێ وەچەیەکی تەواوی پرۆلیتاری تێ خزێندرێ. حیزب لە ساڵە نەهاتەکاندا، بە هۆی نەبوونی بەرۆگرەوە، بەرهەڵستکاری لە بەردەم خۆیدا نەهێشت. سۆسیالیستە کۆنەکان کە خەباتی خۆیان دژی جیاوازی چینایەتی تەرخان کردبوو، پێیان وابو ئەوەی لە سەر ڕەگ و ڕیشاڵ نەڕوێ نەمر نابێ. بیریان لەوە نەکردبۆوە کە بەردەوامبوونی کۆمەڵگەی فرەچین، مەرج نییە بەردەوامبوونێکی فیزیاوی بێ و ئەوەشیان نەدەزانی کە ئەرۆستۆکراتی بنەماڵە، هەمیشە تەمەنی کورت بووە. کەچی ڕێکخراوی خوازراوەی وەک کلێسای کاتۆلیک سەدان ساڵ یا هەزاران ساڵ دەوامی بووە. ناوەڕۆکی کۆمەڵگەی فرەچین ئەوە نییە کە منداڵ بەرۆگری بابی بێ بەڵکو بەردەوامبوونی شێوەی تێڕوانینە بۆ ژیان کە مردووان بە زیندوی دەسپێرن. مادام توێژاڵی دەسەڵاتدار دەتوانێ جێنشینی خۆی دەسنیشان بکا، توێژاڵی دەسەڵاتدارە. حیزب چ کاری بە هێشتنەوەی خوێنی خۆی نەداوە بەڵکو کاری بە هێشتنەوەی خۆی داوە. گرنگ نییە کێ کاروباری دەسەڵات بەڕێوە دەبا بەو مەرجەی پێکهاتەی کۆمەڵگەی فرەچین وەکی خۆی بێ.

هەموو باوەڕ و نەریت و ئارەزوو و هەست و هەڵوێستێ کە ئەم سەردەمە دیارییان دەکا، بە جۆرێ قاڵبیان گرتووە کە بە گوێرەی بارودۆخی نهێنیسازی حیزب بێ و سروشتی ڕاستەقینەی کۆمەڵگەی ئەم سەردەمە ئاشکرا نەکا. بشێوێنی یا هەر ئامادەبوونێ بۆ بشێوێنی لەم دەمەدا مەحاڵە. چ مەترسییەک لە لایەن پرۆلیتارەوە لە ئارادا نییە. بە وازلێهێنانیان، هەر لە خۆڕا، نەوە دوای نەوە و ساڵ بە ساڵ کار دەکەن و زاوزێ دەکەن و دەمرن بێ ئەوەی شتێ بۆ بشێوێنی بیانبزوێنێ و بێ ئەوەی بتوانن تێبگەن کە دنیا، لەوانەیە جۆرێکی دی بێ. کاتێ مەترسی پەیدا دەکەن کە پیشەسازی پێش کەوێ و ئەوانیش پتر فێر بکرێن. بەڵام مادام ململانێی پێشخستنی سەربازی و بازرگانی لە دیاردە هەرە گرنگەکان نییە، ئاستی فێربوونی ئەوانیش بەرەو خوارەوە دەچێ. ڕەشە خەڵکەکە، هەر بۆچوونێکیان هەبێ یا نەبێ وەک یەک وایە. ڕێیان هەیە ئازادی

بیرکردنەوەیان هەبێ چونکە بیرکردنەوەیان نییە. لە لایەکی تریشەوە، بچووکترین لادانی ئەندامی حیزب لە باوەڕ، هەرچەندە گرنگیش نەبێ، چاوی لێ ناپۆشرێ.

ئەندامی حیزب لە ڕۆژی دروستبوونیەوە تا مردنی، لە ژێر چاودێری پۆلیسی خەیاڵدا دەژی. تەنانەت کە بە تەنهاش دەبێ، لەو لایەنەوە دڵنیا نییە. لە هەر کوێ بێ، خەوتبێ یا وەئاگا بێ، کار بکا یا پشوو بدا، لە گەرماو بێ یا لە سەر تەختی نوستن، بێ ئەوەی پێشەکی ئاگادار کرابێ، دەکرێ چاودێری بکرێ و بەخۆشی چ پێی نەزانێ. هیچ ڕەفتارێکی پشتگوێ ناخرێ. دۆستەکانی، پشووەکانی، ڕەفتاری لە گەڵ ژن و منداڵی خۆیدا، شێوەی ڕوخساری لە کاتی تەنهاییدا، ئەو وشانەی کە بە دەم خەوەوە دەیانڵێ، تەنانەت بزووتنە ئاساییەکانی جەستەشی، لە ژێر چاودێرییەکی ورد ورددان. نەک هەر هەڵەیەکی واقعی، بەڵکو بچووکترین ڕەفتاری نا سروشتی و گۆڕینی عادەت یا هەر جۆرە ڕەفتارێکی (عەسەبی) کە ڕەنگی خۆدوواندن بداتەوە، لە زەڕەبینی دەزگای خەفیەگەرێتی ون نابێ. لە هیچ لایەکەوە سەربەستی هەڵبژاردنی نییە. لە لایەکی تریشەوە، کرداری بە پێی یاسا لە ئۆقیانووسیادا نییە. بیر و ڕەفتارێ کە لە حاڵەتی ئاشکرابووندا سزای مەرگیان لە سەر بێ، قەدەغە نین. پاکسازی و لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجە و بەندکردن و بە هەڵمکردنی بەردەوام، سزای تاوانی ئەنجامدراو نین، بەڵکو بۆ لەناوبردنی کەسانێکن کە ڕێی تێ دەچێ لە داهاتوودا ئەنجامیان بدا. نابێ ئەندامی حیزب هەر باوەڕی دروستی هەبێ و بەس بەڵکو دەبێ غەریزەی دروستیشی هەبێ. زۆری ئەو باوەڕ و هەڵوێستانەی کە لێی داوا دەکرێن بە ئاشکرا ناگوترێن و گەلێ بۆچوون و هەڵوێستی لێ دەخوازرێن بێ ئەوەی هەرگیز باس کرابێتن و باسیش ناکرێن و بە بێ دەربڕینی پێچەوانە شاردراوەکانی ناو سۆسینگ لە دەربڕین نایەن. ئەگەر ئەندامی حیزب بە غەریزە ("چاکبیر" لە "گوتەی نوێدا") بێ، لە هەموو بارودۆخێکدا دەزانێ کامە بۆچوون و کام خەیاڵ دروستە. بەڵام بە هەرحاڵ، ڕاهێنانی دوور و درێژی هۆش هەر لە منداڵییەوە دەست پێ دەکا و لە دەوری گوتەی نوێ و زاراوەی وەک (ڕاگرتنی تاوان) و (ڕەش سپی) و باوەڕی دووفاقانەدا گەشە دەکا و وای لێ دێ کە نەتوانێ بە قووڵیی بیر بکاتەوە.

لە ئەندامی حیزب دەخوازرێ هیچ جۆرە سۆزێکی تایبەتی نەبێ و لە هەوڵ و کۆششیدا وچان نەبێ. لێی دەخوازرێ کە بەرانبەر دوژمنی دەرەکی و خائینانی ناوخۆ، لێواولێو بێ لە ڕق و بۆ سەرکەوتنی یەک لە دوای یەک بە پەرۆش بێ و بەرانبەر توانا و دانایی حیزب گوێ لە مشت بێ. ئەو نارەزاییانەی کە ژیانی کولەمەرگی و بێ بەرهەم دروستیان دەکەن،



بە ئانقەست ئاراستەی دەرەوە دەکرێن و لە دەرفەتێکی وەک دوو دەقیقە ڕقدا، وەک دوکەڵ بە هەوادا دەچن و ئەو مەزەندە و بۆچوونانەی کە لەوانەن گەرای گومان بخەن یا چووزەرەی بشێوێنی بن، هەر لە سەرەتاوە درکیان پێ دەکرێ و لە دیسپلینەکانی ناوەوەدا دەکوژرێن. یەکەم شێوەی ئەم دیاردەیە کە لەوانەیە لە منداڵییەوە پەیدا بێ، لە گوتەی نوێدا پێی دەگوترێ ڕاگرتنی تاوان. واتە ئامادەبوون بۆ سڕکردنی هەر بیرێک لە سەرەتای پەیدابوونیەوە وەک ئەوەی بە غەریزە بێ. ئامادەبوونی لەم بابەتەش ئەوە دەگەیەنێ کە دەمەتەقێی پێ نەکرێ و بە پێی لۆژیک درک بە هەڵە نەکا و گومان لە هەموو سەرنج و دەربڕینێ بکا کە پێچەوانەی سۆسینگ بوەستێتەوە و لە هەموو بۆچوونێ بێزار بێ کە ڕووی لە لادان بێ. بە کورتییەکەی ڕاگرتنی تاوان واتە کەرایەتی ئاسایشبەخش. بەڵام کەرایەتی بە تەنێ بەس نییە. بە پێچەوانەوە، دڵسۆزی بە تەواوی واتای وشەکە ئەوەیە وەک چۆن پاڵەوانی سێرک گشت بزووتنێکی جەستەی لە دەسەڵاتدایە، ئاوها هەموو حەواسێک لە ژێر دەسەڵاتدا بێ. کۆمەڵگەی ئۆقیانووسیا، وەک پێویست لە سەر ئەو باوەڕە بەندە کە ڕێبەری گەورە توانای بێ هاوتای هەیە و حیزبیش لە هەڵە بەدەرە. وەلێ مادام ڕێبەری گەورە توانای بێ هاوتای نەبێ و حیزبیش لە هەڵە بە دەر نەبێ، دەبێ ئارایشکردنی ڕووداوە بە پێچ و پەناکان، بێ ماندووبوون و هەمیشە بەردەوام بێ. لەم بارەیەوە زاراوەیەکی کلیل هەیە کە بەو سستەمە فکرییە ڕێی بۆ خۆش دەکرێ کە هەموو ڕابردووی گرتۆتەوە و لە گوتەی نوێدا باوەڕی دووفاقانەی پێ دەگوترێ. گۆڕینی ڕابردوو لە بەر دوو هۆ پێویستە. یەکێکیان لاوەکییە و ئەگەر بشێ ناوی دەنێین هۆی یەدەگ. هۆی لاوەکیش ئەوەیە کە ئەندامی حیزب ڕێک وەک کرێکاران بە بارودۆخی ژیانی سەردەم قایل بێ لە بەر ئەوەی چ پێوەری نییە پێی بپێوێ. وەک چۆن لە دەرەوەی وڵات دادەبڕێ، دەبێ لە ڕابردووش دابڕێ، چونکە پێویستە پێی وابێ بارودۆخی ژیانی خۆی لە هی باپیرانی چاکترە و ڕادەی خۆشی ژیانیشی بەردەوام لە هەڵکشاندایە. بەڵام هۆی گرنگتر بۆ گۆڕینی ڕابردوو پاراستنی حیزبە لە هەڵە. مەسەلە تەنها ئەوە نییە کە گوتار و بەڵگەنامە و ئاماری ژمارە بەردەوام بگونجێندرێن تا بە ڕاستدەرچوونی پێشبینیەکانی حیزب بسەلمێندرێ. ناشکرێ باوەڕ بە گۆڕینی باوەڕ بکرێ. با بۆچوون بگۆڕێ و هەڵوێستی سیاسی دووچاری لاوازیش بێ. بۆ نموونە، ئەگەر ئەوروئاسیا یا ڕۆژهەڵاتی ئاسیا (هەر کامێکیان بێ) ئەمڕۆ دوژمن بێ، دەبێ ئەو وڵاتە هەمیشە دوژمن بووبێ. هەر کاتێ واقعێکی پێچەوانە پێش هات، دەبێ ئەو واقیعە بگۆڕدرێ. هەمیشە مێژوو بەم

شێوەیە دەنووسرێتەوە. گۆڕینی ڕۆژانەی ڕابردوو کە لە وەزارەتی ڕاستی ئەنجام دەدرێ، هێندەی سەرکوتکردن و خەفیەگەریتی بۆ مانەوە و پتەوی ڕژێم پێویستە کە ئەرکی وەزارەتی ئەوینن. توانای گۆڕینی ڕابردوو لە باوەڕە بنەڕەتییەکانی سۆسینگە. ڕووداوی ڕابردوو بەندەی گفتوگۆیە و بوونی ماتریالی نییە، بەڵکو لە سەرچاوەی نووسراو و بیرەوەری مرۆڤدا دەژی. بەڵگەنامە و بیرەوەری شایەدیی بۆ ڕابردوو دەدەن. مادام حیزب دەستی بە سەر بەڵگەنامە و هۆشی ئەندامی خۆیدا دەڕوا، چۆنی بوێ وای دەسازێنێ. بەو پێیەش وا دەکەوێتەوە کە ڕابردوو دەگۆڕدرێ بەڵام لە هیچ وەرچەرخانێکی دیاریکراویشدا گۆڕانی بۆ نییە، چونکە جارێکی دی دروست کراوەتەوە. ئەوەی لە ڕابردوودا بە پێی پێویست خولقێندرا، دەبێتە ڕابردوو و ڕابردووش نابێ بگۆڕدرێ. ئەم کارە، بە پێی پێویست لەوانەیە ساڵی چەند جارێک ئەنجام بدرێ و هەموو دەمێکیش حیزب لەگەڵ ڕاستییە گردەبڕەکەدایە و نابێ بارودۆخ بە پێچەوانەی خۆی بووبێ. بەمەدا دەردەکەوێ کە دەستڕۆیشتن بە سەر ڕابردوودا لەو دەسەڵاتەوە دێ کە بە سەر بیرەوەرییەوە هەیە. دڵنیابوون لەوەی کە بەڵگەنامەکان لەگەڵ هەڵوێستی ساتێکی دیاریکراودا ڕێک دێتەوە تەنها حاڵەتێکی میکانیکییە. بەڵام پێویستە ئەوە لە هۆشدا بێ کە هەموو شتێ بەو جۆرە بووە کە ویستراوە. ئەگەر ڕاهێنانەوەی سەر لە نوێی هۆش پێویست بوو یا شایەدە نووسراوەکان بەتاڵ کرانەوە، ئەوا پێویستیشە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە کراون بیر بچنەوە. ئەنجامدانی کاری وا وەک شێوەکانی تری ڕەوانناسی بە ڕاهێنان دەکرێ. ئەندامانی حیزب، بە تایبەتی هۆشیار و هاوتەرحەکان، خۆیان فێری ئەوە دەکەن. لە زمانی کۆندا، بە ئاشکرا بەوە دەگوترا ئاژاوتنی واقیع. لە گوتەی نوێدا پێی دەگوترێ باوەڕی دووفاقانە هەرچەندە باوەڕی دووفاقانە زۆر شتی فراوانتریش دەگرێتەوە.

باوەڕی دووفاقانە، واتە توانای هێشتنەوەی دوو باوەڕی پێچەوانەی یەک لە یەک کاتدا و باوەڕهێنان بە هەردووکیان لە هەمان کاتدا. بەرژەوەندی ڕۆژانەی حیزب دەزانێ کە دەبێ هۆشی ئەندام بەرەو کوێ ئاراستە بکرێ چونکە حەقیقەت دەگۆڕدرێ بەڵام بە خۆ ڕاهێنان لە سەر باوەڕی دووفاقانە باوەڕ بە خۆت دەهێنی کە حەقیقەت نەگۆڕاوە. دەبێ هەموو کارێ بە ئاگایانە ئەنجام بدرێ ئەگەر نا بە وردی ئەنجام نادرێ. دەبێ لە هەمان کاتدا نائاگایانەش بێ دەنا هەستی ناپاکی و ئازاری ویژدانی لەگەڵدا دێ. باوەڕی دووفاقانە دەگەڕێتەوە بۆ جەوهەری خودی سۆسینگ چونکە ئەرکی سەرەکی حیزب ئەوەیە شانبەشانی هێشتنەوەی ئامانجی پتەوی حیزب کە ڕاستگۆیانە جێگیردەبێ، سوود لە فریودانی



ئاگایانەش ببینێ. درۆکردنی بە ئانقەست و لە دڵەوە باوەڕهێنان بەو درۆیانە و لەبیربردنەوەی هەموو واقعێکی تاڵ و پاشانیش لە کاتی پێویستدا، دەرهێنانەوەی واقعی لەبیرچوو لە تەپان بنی خەیاڵەوە و مل نەدان بۆ واقعی دی – هەموو ئەمانە پێداویستیی بنەڕەتین. تەنانەت لە کاتی وەگەڕخستنی باوەڕی دووفاقانەشدا، خۆڕاهێنان لە سەر باوەڕی دووفاقانە پێویستە چونکە بە هۆی بەکارهێنانیەوە پیاو لەگەڵ گۆڕینی واقیعدا ڕادێ و بە هۆی بەکارهێنانەوەی باوەڕی دووفاقانەوە، گۆڕینی ڕاستی بە درۆ تا هەتایە دەوامی دەبێ. بە هۆی باوەڕی دووفاقانەوە حیزب توانیویەتی بەر بە مێژوو بگرێ تا ئەو جێیەی کە ئاگادارین – دوور نییە هەزاران ساڵی تریش ئەوەی بۆ بچێتە سەر.

هەموو دامودەزگا هەمەچینەکانی ڕابردوو، یا بە هۆی توندوتیژییەوە دەسەڵاتیان لە دەست داوە یا بە هۆی نەرمونیانییەوە. یا بێ عەقڵ و ڕوحزل بوون و ئەو دەمە نەرمونیان بوون کە توندوتیژی پێویست بووە و ئیدی تێکشکاون. کەوابێ لەناوچوونیان یا بێئاگایانە بوو یا ئاگایانە. سەرکەوتنی حیزب لەوەدایە کە سستەمێکی وای داهێناوە کە هەردوو بارودۆخەکەی لە یەک کاتدا تێدان. حیزب بە هیچ بابەتە ڕێڕەوێکی فیکریی دی سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا. ئەگەر یەکێ مەبەستی فەرمانڕەوایی بێ دەبێ بتوانێ هەڵسوکەوت لەگەڵ واقیعدا بکا، چونکە نهێنی دەسەڵات لەوەدایە باوەڕێک بە(بێ هەڵەیی) خۆیەوە گرێ بدا و بوێرێ سوود لە هەڵەی ڕابردوو وەرگرێ.

ئاشکرایە کە ئەوانەی باوەڕی دووفاقانەیان داهێناوە، باشترین کەسانێکن کە پەیڕەویی لێ دەکەن و دەزانن باوەڕی دووفاقانە سستەمێکی فراوانی فریودانی هۆشە. چاکترین خەڵکی کۆمەڵگە دەزانن چی ڕوو دەدا و خراپترین خەڵکیش ئەو ڕووداوانە دەبینن. بە شێوەیەکی گشتی: چەندە ڕادەی تێگەیشتن زیاتر بێ فریودان زیاتر دەبێ و چەندە بەری هۆش فراوانتر بێ سەلامەتی عەقڵ کەمتر دەبێ. هیستریای شەڕ لەگەڵ هەڵکشانی پلەی کۆمەڵایەتی تاکە کەسەکاندا بەرز دەبێتەوە. ئەوانەی کە بۆچوونی ماقوڵیان بەرانبەر شەڕ هەیە خەڵکی ئەو ناوچانەی گۆی زەوین کە هەمیشە هەرایان لە سەرە. کارەساتی شەڕ بۆ ئەو بابەتە خەڵکانە بە هەڵکشان و داکشانی دەریا دەچێ و شەپۆلەکانی، خۆ بەواندا دەدەن و دەکشێنەوە. کێ شەڕ دەدۆڕێنێ یا دەیباتەوە، بۆ ئەوان جیاوازیی نییە و دەزانن گۆڕینی دەسەڵاتدار هەر ئەوە دەگەیەنێ کە وەک بەرێ، هەمان کار بۆ ئاغایەکی دی ئەنجام بدەن کە ڕێک وەک ئەوەی دی ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکا. ئەو کرێکارانەی کە کەمێ حاڵیان چاکترە و پێیان دەڵێن پرۆلیتار، بە دەگمەن ئاگاداری شەڕ هەن. پێویستە دێوەزمەی ترس

و ڕق هەمیشە لە دەروونیاندا بێ. ئەگەر وازیان لێ بهێندرێ، وایان لێ دێ تا ماوەیەکی دوور و درێژ شەڕیان بیر نامێنێ. لە ڕیزی حیزبدا، بە تایبەتی ناوەندی حیزب، زۆرترین جۆش و خرۆش بۆ شەڕ هەیە. ئەوانەی کە دەزانن داگیرکردنی دنیا مەحالە، باوەڕی گردەبڕیان بە داگیرکردنی هەیە. زامنی پەیوەندی دژەکان - توانا لەگەڵ بێ تواناییدا، باوەڕ لەگەڵ بێ باوەڕیدا - یەکێکە لە نیشانە دیارەکانی کۆمەڵگەی ئۆقیانووسیا. ئایدۆلۆژیای باو، پڕە لە دیاردەی دژ بە یەک ئەگەر دژێکی ئاشکراش لە ئارادا نەبێ. حیزب بەم شێوەیە، گشت بنەمایەکی جارانی سۆسیالیزم ڕەت دەکاتەوە و دەیانکوژێنێتەوە کە بە ناوی سۆسیالیزمەوە ئەنجام دەدرێن. کرێکارێش کە لە سەدەکانی ڕابردوودا نموونەیان نەبوو، وانەی ڕقیان دادەدرێ و بەرگی هاوتەرحییان لە بەر دەکرێ کە پێشووتر هی کرێکارانی دەستیی بوو. بە پێی بەرنامەی درێژخایەن، خێزان بنکۆڵ دەکرێ و بە جۆرێ ناوی ڕێبەر دەبرێ کە سۆزی ئەندامانی خێزان ڕابکێشێ. تەنانەت ناوی ئەو چوار وەزارەتەی کە حوکمڕانیمان دەکەن، نیشانەی جۆرە شەرم نەکردنێکە لە بەرەواژکردنەوەی ڕاستییەکاندا. وەزارەتی ئاشتی خەریکی شەڕە و وەزارەتی ڕاستی سەروکاری لەگەڵ درۆدا هەیە، وەزارەتی ئەوین ئەرکی ئەشکەنجەی لە سەرە و وەزارەتی فراوانی سەروکاری لەگەڵ قاتوقڕیدا هەیە. ئەم دیاردە دژ بەیەکانە ڕێکەوت نین و لە ڕیاکاریشەوە نەهاتوون. بەڵکو لە ڕاهێنانی بەئانقەستی باوەڕی دووفاقانەوە پەیدا بوون. هێشتنەوەی دەسەڵاتی هەمیشەیی، تەنها لە ڕێی پێکەوە لکاندنی دژەکانەوە دەبێ. بە هیچ شێوەیەکی دی جغزی دەزگا کۆنەکان لە شکاندن نەدەهاتن. ئەگەر یەکسانی مرۆ بۆ هەمیشە وەلا نرێ - ئەگەر ئەوانەی کە ناوی دەستەی بالامان لێ نان بە بەردەوامی لە سەر تەختی دەسەڵاتدا بن - دەبێ شێتگیرانە دەست بە سەر بارودۆخی پەرەسەندنی هۆشدا بگرن. بەڵام پرسیارێک لە ئارادایە کە تا ئێستا گرنگیمان پێ نەداوە. پرسیارەکەش ئەمەیە: بۆ دەبێ یەکسانیی مرۆ لە ئارادا نەبێ؟. ئەگەر وا دانێین میکانیزمی کارەکان بە جوانی شیی کراوەتەوە، باشە مەبەست لەوەدا چییە کە مێژوو لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا ڕاگیرێ؟. لێرەدا دەگەینە نهێنی سەرەکی. وەک دیتمان حیزب و لە سەرووی هەموانیشەوە ناوەندی حیزب، لە سەر باوەڕی دووفاقانە بەندە. بەڵام مەسەلەکە زۆر لەوە قووڵترە. هەرگیز ئەو باوەڕە نەخراوەتە بەر پرسیارەوە کە یەکەم جار دەسەڵاتی وەدەست هێناوە و پاشان باوەڕی دووفاقانە و پۆلیسی خەیاڵ و شەڕی بەردەوام و گەلێ دەستی پێکردنی داهێناوە. ئەم هۆیە بە ڕاستی...



وەک ئەوەی دەنگێ وەئاگای بێنێ، وینستۆن، بێدەنگی وەئاگای هێنا. پێی وابوو جولیا ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو. لە سەر تەنیشت ڕاکشابوو و لە ناوقەدی بەرەژوور ڕووت بوو. دەستێکی خستبووە ژێر سەری و قەفێ لە پرچەکەی بە سەر چاویدا شۆڕ ببۆوە. سینگی لە سەرخۆ، بەرز دەبوو و نزم دەبوو.

- جولیا.

وەڵامی نەبو.

- جولیا وەئاگای؟.

وەڵامی نەبوو. نوستبوو. وینستۆن کتێبەکەی داخست و بە کاوەخۆ لە عاردی دانا، و لە سەر تەختەکە ڕاکشا و جولیای داپۆشی.

بیری لەوە دەکردەوە کە هێشتا نهێنییە ڕاستەقینەکان حاڵی نەبووە. دەیزانی چۆن بەڵام نەیدەزانی بۆ. بەشی یەکەمی کتێبەکە بە بەشی سێیەمی دەچوو و شتێکی نوێی نەخستبووە سەر زانیارییەکانی بەڵام زانیارییەکانی ئەمی بە جوانی دارێژابۆوە. بە خوێندنەوەی کتێبەکە دڵنیا بوو کە شێت نییە. کەمایەسیبوون، تەنانەت ئەگەر کەمایەسی تاکە کەسیش بێ شێتبوون نییە. ڕاستی و ناڕاستی لە ئارادا بوون. چنگ گیرکرنیش لە ڕاستی، ئەگەر دژی هەموو دنیاش بێ شێتیی نییە. تیشکی زەردی خۆری دەم کەل کە لە ئاوابووندا بوو، لە پەنجەرەکەوە بەژوور دەکەوت و بەر باسکی دەکەوت. وینستۆن، چاوی داخستن. تیشکی خۆر کە بەر ڕوخساری دەکەوت و نەرمایی جەستەی کیژەکە، هەستی سەرکەوتنێکی خەوهێنەر و دڵنیابوونیان پێ دەدا. ترسولەرزی نەبوو و هەموو شتێ بە دڵی خۆی بوو. لە بەر خۆیەوە گوتی : "ژیریی بە پێی ئامار نییە"، و لەگەڵ هەستکردن بە قووڵایی و دانایی ئەو ڕاستییەدا، خەو بردیەوە.

کاتێ وەئاگا هاتەوە پێی وابوو ماوەیەکی زۆر نوستووە. بەڵام کە ڕوانییە سەعاتە کۆنەکە، دیتی بیست و سی دەقیقەیە. سەرخەوێکی کورتی تری شکاند. ئاوازە بەرزە ئاشناکە لە گۆڕەپانەکەی خوارەوەڕا دەهات:

تەنها هەر خەیاڵێکی بێ سەروبەر بوو
وەک ڕۆژێکی مانگی نیسان بەسەر چوو
بەڵام نیگا و وشە و خەون و خەیاڵیان وروژاندم و
دڵیان ڕفاندم و چوون

پێ دەچوو ئەو ئاوازە هێشتا خۆشی خۆی پاراستبێ. لە هەموو جێیەکت دەبیست. ڕێی بە سروودی ڕق چۆڵ کردبوو. جولیا، بە دەنگی ئاوازەکە بەئاگا هاتەوە. بە نازێکەوە خۆی پێچایەوە و لە سەر تەختەکە هەستا و گوتی:

– برسیمە. وا چاکە کەمێ قاوەی دی لێنێم. پەککووو... تەباخەکە کوژاوەتەوە و ئاوەکەش ساردە.

تەباخەکەی هەڵگرت و ڕایوەشاند و گوتی : "یەک دڵۆپ نەوتیشی تێدا نییە."

– دەتوانین کەمێ لە چارینگتۆنە پیر وەرگرین.

– سەیر ئەوەیە کە من تەماشام کرد پڕ بوو. خۆم لەبەر دەکەم.

پاشان گوتی: – دنیا ساردی کردووە.

وینستۆنیش ڕاست بووەوە و خۆی لەبەرکرد. ئەو دەنگەی کە ماندووبوونی بۆ نەبوو، بەردەوام دەبیسترا:

دەڵێن زەمانە چارەی دەرد دەکا
و هەموو ئازارێ بیر دەچێتەوە
بەڵام فرمێسک و بزەی ساڵانم
ئێستاش کەتانی دڵ دەڕزێنن

وینستۆن بە دەم قایمکردنی پشتێنەکەیەوە، بەرەو پەنجەرەکە چوو. هەتاو گەیشتبووە پشت خانووەکانەوە و تیشکی نەدەگەیشتە حەوشەکەی خوارێ. حەوشە بەردڕێژەکە، لە زۆر جێوە تەڕ بوو و دەتگوت ئاوڕشێن کراوە. هەستی دەکرد ئاسمانیش ئاوڕشێن کراوە چونکە لە نێوان دوکەڵکێشەکانەوە، تەڕ و شین خۆی دەنواند. ژنەکە کە ماندووبوونی نەبوو، دەهات و دەچوو. قولابی جلگری دەنانە زار و دەریدەهێنانەوە، گۆرانی دەچڕی و بێدەنگ دەبوو. پارچە پەڕۆی زیاتر و زیاتری هەڵدەخست. وینستۆن نەیدەزانی ئەو ژنە ژیانی لە سەر کوڵکردنە یا پێبەندی بیست سی نەوەیە. جولیا هاتە تەنیشتی و بە لایەوە ڕاوێستا. بە جووتە، بە سەرسامییەوە دەیانڕوانییە ئەو جەستە بەهێزەی خوارێ. وینستۆن کە تەماشای جموجۆڵی دەکرد، بازووی بەهێزی دەدی بەرەو تەنافەکە بەرز دەبوونەوە، سمتی توندوتۆڵی وەک سمتی ئەسپ دەرپەڕیبوون، بۆ یەکەم جار پێی جوان بوو. تا ئەو دەمە، هەرگیز بە بیریدا نەهاتبوو جەستەی ژنێکی پەنجا ساڵە – کە بە هۆی زاوزێوە وەک هەمبانە با دەکا و بە هۆی کاری نارەحەتەوە، وەک کەلەمی زیاد پێگەیشتوو زبر دەبێ –



جوان بێ. بەڵام جەستەی ئەو ژنە جوان بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: قەیدی چییە؟. جەستەی بە هێز و خڕی کە بە پارچە مەڕمەڕ دەچێ و پێستی سوورخنی، هەمان پەیوەندی (میوەی گوڵی سوور) و (گوڵی سوور)ی بە جەستەی کیژەوە هەیە. بۆ دەبێ میوە لە گوڵ کەمتر بێ؟."

لەسەرخۆ گوتی : ژنێکی جوانە.

جولیا گوتی: بەلای کەمەوە سمتی مەترێ پان دەبێ.

وینستۆن گوتی: ئاخر جوانییەکەی لەوەدایە.

کارگەران نەمرن. پیاو کاتێ لەوە دڵنیا دەبێ، تەماشای ئەو جەستە پاڵەوانەی خوارەوە دەکا. ئاخرێکەی ڕۆژی ئاگاداربوونەوەیان دێ. تارۆژی وەئاگاهاتنیان، ئەگەر هەزار ساڵیش بخایەنێ، دەبێ لە ژیاندا بمێنن و بەرگەی هەموو کارەساتێ بگرن. هێزی ژیان وەک پەلەوەر، لە جەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکی دی دەگوێزرێتەوە و حیزب نە دەسەڵاتی بە سەردا دەشکێ نە پێی دەکوژرێ.

باوەشی بە ناوقەدی باریکی جولیادا کرد. لاقیان، هەتا چۆکان پێکەوە لکابون. هەرگیز منداڵ لە جەستەیان پەیدا نەدەبوو. بە هیچ جۆرێ نەیاندەتوانی ئەو کارە بکەن و هەر لە ڕێی سینگ و هۆشەوە ئەو ڕازەیان بە یەکتر ڕادەگەیاند. بەڵام ئەو ژنەی خوارێ هۆشی نەبوو. هەر بازووی ئەستوور و دڵێکی گەرم و زگێکی بە بەرەکەتی هەبوو. چەند زگی کردبوو؟. ڕەنگە پانزەی کردبێ. سەردەمێ گوڵێکی کێوی بووە. ڕەنگە یەک ساڵ جوانیی گوڵی بووبێ. دوای ئەوە، لە پڕێکدا وەک میوەی پەین پێوەکراو ئاوساوە و ڕەق و سوور و زبر بووە. پاشانیش سی ساڵی ژیانی لە جلشۆری و ئاوڕشێن و ڕاوێستان و چێشت لێنان و گسکدان و سڕینەوە و پینەوپەڕۆ بۆ منداڵی خۆی و دواتریش بۆ نەوەکانی، بە بێ پشوو پێک هاتووە. دوای ئەوانە، هێشتا هەر گۆرانی دەچڕێ. ئەو ڕادە سۆفیگەرییەی کە ئەم بەرانبەر ئەو ژنە هەستی پێ دەکرد، تێکەڵاوی ئاسمانی ساف و ڕوون و بێ هەور دەبوو کە لە نێوان دوکەڵکێشەکانەوە بەرەو دوورێکی بێ کۆتایی دەکشا. جێی سەرسوڕمان بوو کە ئاسمان بۆ هەموو کەس؛ لە ئەوروئاسیا و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ئێرە هەر یەکێکە – لە هەموو جێ، لە هەموو دنیادا، سەدان، هەزاران ملیۆن بنیادەمی وەک ئەو ژنە، خەڵکانێک کە ئاگاداری بوونی یەکتر نین، خەڵکانێک کە بە دیواری ڕق لێک دابڕاون، کەچی تا بڵێی لە یەک دەچن – خەڵکانێک کە بیر لە هیچ ناکەنەوە و وزە لە ماسولکە و زگ و

دڵیاندا، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دنیا وەردەگێڕێ، کۆ دەکەنەوە. ئەگەر ئومێدێ هەبێ هەر لە پرۆلیتاردایە. بێ ئەوەی کتێبەکەی تەواو کردبێ، دەیزانی پەیامەکەی گۆڵدستەین هەر ئەوەیە. پاشەڕۆژ بە دەستی کارگەرانەوەیە. ئایە دەیتوانی لەوە دڵنیا بێ کە ئەو دنیایەی ئەوان سازی دەکەن دنیایەک دەبێ کە ڕێک وەک ئەوە نابێ حیزب دایمەزراندووە و بۆ ئەو، واتە وینستۆن سمیت نامۆ نابێ؟. بۆ؟. خۆ هەر نەبێ دنیای هۆشی سەلامەت دەبێ. درەنگ یا زوو دەبێ بێتە دی. دەبێ وزە بگۆڕێ و ببێتە هۆش. وینستۆن گوتی :

– ئەو مەلەت لە بیرە کە یەکەم جار لە دارستانەکەدا بۆی دەخوێندین؟.

– بۆ ئێمەی نەدەخوێند. بۆ وەی دەخوێند دڵی خۆی خۆش بکا. نا، هەروا دەیخوێند.

مەل گۆرانی دەڵێ. کرێکار گۆرانی دەڵێ. حیزب گۆرانی ناڵێ. لە هەمموو دنیاندا، لە لەندەن و نیویۆرک، لە ئەفریقیا و بەرازیل و جێیە پڕ نهێنییەکان، لە گوندەکانی ڕووپێوی بێ کۆتایی ڕووسیا، لە بازاڕەکانی چین و ژاپۆن، لە شەقامەکانی پاریس و بەرلین – لە هەموو جێیەک، هەمان پەیکەری بەهێزی لە شکاندن نەهاتوو وێستاوە. پەیکەرێک کە بە هۆی کار و زگپڕییەوە ترسناکە و لە ڕۆژی دروستبوونیەوە تا مردنی، کار دەکات و گۆرانی دەچڕێ. ئاخرێکەی نەوەیەکی بەهۆش لەو هەناوە بەهێزە دەکەوێتەوە. ئایندە هی ئەوانە و تۆش لە مردووانی. بەڵام وەک ئەوان جەستەیان بە زیندوویی دەهێڵنەوە، ئەگەر تۆش هۆشی خۆت بە زیندوویی ڕاگری و باوەڕی قەدەغەی دوو و دوو دەکاتە چوار بەرەو پێشێ بەری، تۆش دەتوانی بەشداری لە ئایندەدا بکەی.

وینستۆن گوتی: ئێمە لە مردووانین.

جولیا، وەک ئەوەی بە ئەرکی خۆی بزانێ گوتی: ئێمە لە مردووانین.

دەنگێکی گڕ لە پشتیانەوە گوتی: ئێوە لە مردووانن.

هەردووکیان ڕاپەڕین. وینستۆن هەستی کرد هەناوی دەرچێ. گشت لایەکی سپێنەی چاوی جولیای دەدی و ڕوخساری وەک چۆڕی شیر سپی ببوو. ئارایشی سەر ئێسکی گۆنای وا بە زەقیی دەرکەوتبوو، دەتگوت لە پێستی جیا بۆتەوە. دەنگە گڕەکە دووپاتی کردەوە: ئێوە لە مردووانن.

جولیا بە چپە گوتی: لە پشت تابلۆکەوە بوو.

دەنگە گڕەکە گوتی: لە پشت تابلۆکەوە بوو. ڕێک لە جێی خۆتاندا بوەستن. پێش ئەوەی فەرمانتان پێ بکرێ، لە جێی خۆتان نەبزوون.



قەوما. ئاخرێکەی قەوما!. هیچیان پێ نەدەکرا ئەوە نەبێ لە جێی خۆیان، ڕەق ڕاوێستن و بڕواننە ناو چاوی یەکتر. بیریان لەوە نەدەکردەوە هەڵبێن و خۆیان ڕزگار کەن. بەگوێنەکردنی دەنگەکە شتێ نەبوو بیری لێ بکرێتەوە. دەنگی شکاندنی شووشە هات. تابلۆکە کەوتە زەوی و تەلەسکرینێک لە پشتیەوە دەرکەوت.

جولیا گوتی: ئێستا دەتوانن بمانبینن.

دەنگەکە گوتی: ئێستا دەتوانین بتانبینین. لە ناوەندی ژوورەکە بوەستن. پشت بکەنە یەک. دەستتان لە پشتی سەرتانەوە تێکپەڕێنن. لەشتان بەر یەک نەکەوێ.

جەستەیان بەر یەک نەدەکەوتن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، وینستۆن هەستی بە لەرزینی جەستەی جولیا دەکرد. ڕەنگە جەستەی خۆی لەرزیبێ. دەیتوانی پێش بە چۆقەی ددانی خۆی بگرێ، بەڵام لەگەڵ لەرزینی چۆکیدا هیچی پێ نەدەکرا. لە خوارەوەڕا دەنگی پۆتین دەهات. دەتگوت حەوشەکە پڕە لە خەڵک. شتێ بە سەر بەردەکاندا ڕادەکێشرا. گۆرانی چڕینی ژنەکە کتوپڕ بڕا. دەنگی قڵپ کردنەوەی شتێ هات. ڕەنگە تەشتەکوڵەکە بووبێ. هێندێ دەنگی تووڕە بەرز بوونەوە و بە هاوارێکی ئازاراوی بڕان.

وینستۆن گوتی: دەورمان گیراوە.

دەنگەکە گوتی: دەورتان گیراوە.

وینستۆن گوێی لە چۆقەی ددانەکانی جولیا بوو، گوتی: "پێم وایە دوعاخوازی لێک بکەین چاکە". دەنگەکە گوتی: "واچاکە دوعاخوازی لێک بکەن". ئەوجا دەنگێکی دی هات. وینستۆن پێی وابوو ئەم دەنگەیانی پێشووتر بیستبێ: "چۆنی لە گەڵ: ئەوە مۆمێکە ڕێی پێ ڕووناک کە ئەوە تەورێکە ملت هەڵپاچە؟!". شتێ لە پشت وینستۆنەوە بەر تەختەخەوەکە کەوت. سەری نەردەوانێک لە پەنجەرەکەوە دەرکەوتبوو و یەکێ پێیدا هەڵدەگەڕا. دەنگی پێ لە سەر قالدرمەکانەوە دەهات. ژوورەکە پڕ بوو لە زەلامی بەهێزی جل ڕەش و ناڵچەی ئاسن بە پاژنە و تێلا بە دەست. وینستۆن چی دی نەلەرزی. هەوڵی دەدا چاویش نەتروکێنێ. تاکە یەک شتێ گرنگ بوو: ڕێک بووەستێ، ڕێک بووەستێ و بیانووی لێدان بە دەستەوە نەدا!. پیاوێک، بە غەبغەبەیەکی سافەوە کە زاری پێوە وەک کونێکی گچکە دیار بوو، بەرانبەری ڕاوێستا و بە کاوەخۆ، داردەستەکەی لە نێوان پەنجە کەڵە و پەنجەی شادەیدا، وەک تەرازوو ڕادەگرت. وینستۆن، چاوی بە چاویدا تەقی. بە دەستی تێکپەڕاوی پشت سەریەوە و بە سیما و لەشی لەبەرچاویەوە، هەستی ڕووتبوون

گرتبووی و بێ تاقەتی کردبوو. دیسان دەنگی شکاندنی شتێ هات. یەکێکیان پارچە شووشە بلوورەکەی لە سەر مێزەکە هەڵگرتبوو و کێشای بە وەجاخی ئاگردانەکەدا و وردوخاشی کرد. پارچە مەرجانەکە، شتێکی گچکەی قوپاوی پەمەیی بوو و بە گوڵی سەر کێک دەچوو، بە سەر بەردی بەردەمی ئاگردانەکەدا هەڵبەزییەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: "چەند بچووک بوو!". لە پشتەوە، گوێی لە دەنگی پێ و هەناسە بوو. لەقەیەکی توند بەر ئێسکی لاقی کەوت و زۆری نەما بڕمێ. یەکێ لە زەلامەکان مشتێکی توندی بە زگی جولیادا کێشا و وەک قەڵەمبڕ چەماندییەوە. جولیا لە سەر زەوی دەپلکایەوە و هەوڵی هەناسەوەرگرتنی دەدا. وینستۆن نەیوێرا تەنانەت یەک ملیمەتریش سەری وەرچەرخێنێ. بەڵام جاروبارێ سیمای تەڵخی جولیا دەکەوتە بەر چاوی. بە دەم ترسەوە، دەتگوت لە جەستەی خۆیدا هەست بە ئازار دەکا. ئازارێکی کوشندە بوو بەڵام پێداویستیی هەناسە گرینگتر بوو. دەیزانی چۆنە: ئەو ئێشە لە ڕادەبەدەرە بەردەوامە نابێ بیتلێنێتەوە چونکە بەر لە هەموو شتێ هەناسە پێویستە. دووان لە زەلامەکان، چۆک و شانی جولیایان گرت و وەک کیسە، لە ژوورەکەیان بردە دەرێ. وینستۆن سەیرێکی بە پەلەی کرد. سیمای زەرد و بزڕکاو و شێواو بوو و چاوی بەسترابوون. لەگەڵ ئەوەشدا، سووراوی بە گۆناوە هەر مابوو. ئەمە دوادیداری بوو.

وەک مشک لە جێی خۆیدا مات بوو. لەخۆڕا خەیاڵی بۆ دەهاتن و لە ناو سەریدا پاڵەپەستۆیان دەکرد بەڵام گرنگ نەبوون. نەیدەزانی چارینگتۆن گیراوە یا نا. نەیدەزانی ژنە گۆرانیبێژەکە چیی بە سەر هات. هەستی کرد پێویستی چوونە ئاودەستی هەیە، و سەرسامییەک گرتی، چونکە هەمووی دوو سێ سەعات بوو چووبوە سەر پێشاو. سەرنجی چووە سەر کاتژمێرە کۆنەکە. نۆ، واتە بیستویەکی پێشان دەدا. بەڵام دنیا زۆر ڕووناک بوو. ئەدی دوای سەعات بیستویەک، لە مانگی ئابدا دنیا تاریک دانایە؟. کەوتە گومانەوە کە خۆی و جولیا کاتیان لێ گۆڕابێ - خولێکی تەواوی سەعات نوستبن و پێیان وا بووبێ سەعات بیست و سی دەقیقەیە بەڵام لە ڕاستیدا هەشت و نیوی ڕۆژی دوایی بێ. چی دی دووی خەیاڵی خۆی نەکەوت و گرنگی پێ نەدا.

دەنگی لەسەرخۆی هەنگاو بە ڕێڕەوەکەدا دەهات. مستەر چارینگتۆن بەژوور کەوت. بە هاتنی ئەو، زەلامە بەرگڕەشەکان چوونەوە قاوغی خۆیانەوە. چارینگتۆن گۆڕابوو. چاوی بە کەرتە شووشەی بلوورەکە کەوت. گوتی: "ئەو کەرتە شووشانە کۆکەنەوە."



یەکێ لە زەلامەکان، بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکەی چەمایەوە. شێوە ئاخاوتنی پاینیی شاری نەمابوو. وینستۆن بیری کەوتەوە کە پێش چەند دەقیقەیەک، لە تەلەسکرینەکەوە گوێی لە دەنگی کێ بوو. مستەر چارینگتۆن، هێشتا چاکەتە قەدیفەکەی لە بەر بوو. بەڵام مووی کە سپی بوو، ڕەش ببوو. چاویلکەشی لە چاو نەبوو. سەیرێکی تیژی وینستۆنی کرد. دەتگوت دەیەوێ کەسایەتی دەسنیشان بکا. دوای ئەوە چی دی سەرنجی نەدا. هێشتا هەر دەناسرایەوە بەڵام پیاوەکەی جاران نەبوو. ڕاست ببۆوە و گەورەتر دیار بوو. هەرچەندە گۆڕانی کەم لە ڕوخساریدا کرابوو بەڵام ببوو بە کەسێکی دی. برۆ ڕەشەکانی وەک بەرێ پڕ نەبوون. لۆچەکانی نەمابوون و خەتەکانی گۆڕابوون. تەنانەت لووتیشی کورتتر دیار بوو. سیمای هۆشیار و ئارامی پیاوێکی سیی و چەند ساڵەی هەبوو. وینستۆن تێگەیشت کە لە هەموو تەمەنیدا، بۆ یەکەمین جار، بە دڵنیاییەوە، ئەندامی پۆلیسی خەیاڵ دەبینێ.

# بەشی سێیەم

١

نەیدەزانی لە کوێیە. لەوانەیە لە وەزارەتی ئەوین بووبێ. بەڵام چ ڕێیەکی دڵنیابوون نەبوو. لە ژوورێکی بڵندی بێ پەنجەرەدا بوو کە دیوارەکانی بە کاشیی سپی درەوشەدار کاشیرێژ کرابوون. گڵۆپی شاردراوە، بە تیشکی ساردوسڕی، ژوورەکەی دەشوشتەوە و وژەوژێکی هێواش و بەردەوامیش دەهات کە پێ دەچوو پانکەی هەواگۆڕین بێ. ستوول یا ڕەفتێکی تەخت کە هێندە پان بوو لە سەری دابنیشی، دەوراودەوری ژوورەکەی تەنی بوو، دەرگاکە و هێندێ لە دیواری بەرانبەر دەرگاکە نەبێ، کە ئاودەستێکی لێ بوو ئەوش لێواری قەعدەکەی داری پێوە نەبوو. چوار تەلەسکرینیش، هەر یەکەیان بە دیوارێکەوە هەڵواسرابوو.

باریکەژان گرتبووی. لەو دەمەوەڕا کە ڕاپێچیان کردبوو و بە ئۆتۆمبیلێکی داپۆشراو هێنابویان، ئەو ئازارەی هەر پێوە بوو. بەڵام برسیشی بوو و برسێتی وەک خۆرە لێی دابوو. بیستوچوار یا سی و شەش سەعات بوو هیچی نەخواردبوو. ئێستاش نەیزانی ئەو دەمەی گرتیان بەیانیی بوو یا ئێوارە. ڕەنگە هەرگیز ئەوە نەزانێ. ئیدی لەو کاتەوە هیچی نەخواردبوو.

هێندەی پێی کرا بە ئارامیی لە سەر ڕەفتە باریکەکە دانیشت و دەستی بە دەوری چۆکیدا تێکپەڕاندن. فێر ببوو بە ئارامیی دانیشێ. ئەگەر ڕەفتارێکی چاوەڕواننەکراوت بکردبا، لە تەلەسکرینەکەوە تێیان دەخوڕیت. بەڵام پێداویستی خواردن تا دەهات تەوژمی بۆ دەهێنا. لە هەموو شتێ زیاتر پێویستی بە لەتە نانێک بوو. پێی وابوو گیرفانی بەدلە شینەکەی وردەنانی تێدان. ڕێی تێ دەچوو وا بێ. هەستی دەکرد جاروبارێ، شتێ بە لاڕانیدا دەچەقێ. بە قەراغەنانی دەزانی. ئاخرێکەی ئارەزووی نان، بە سەر ترسدا زاڵ بوو و دەستی بۆ گیرفانی برد. دەنگێ لە تەلەسکرینەکەوە بە سەریدا قیژاندی: "سمیت!. ژمارە ٦٠٧٩ سمیت و!. دەبێ لە ژووری زینداندا دەستت بە دەرەوە بن!."

دەستی بە دەوری چۆکیدا تێکپەڕاندەوە و قنج دانیشتەوە. بەر لەوەی بۆ ئێرەی بێنن بۆ جێیەکی تریان بردبوو کە پێ دەچوو بەندیخانەیەکی ئاسایی یا وێستگەیەکی کتوپڕ بێ و



مەفرەزەکان بەکاری بێنن. نەیدەزانی لەوێ چەندیان هێشتەوە. بە هەرحاڵ چەند سەعاتێ بوو. بە بێ کاتژمێر و ڕووناکایی زەحمەتە کات بپێورێ. بۆنی ئەو جێیە یەکجار ناخۆش بوو. لە ژوورێکی وەک ئەمەیان دانابوو بەڵام هەتا بڵێیی پیس بوو و هەمیشە جمەی دەهات و دە پانزە کەسی تێ ئاخێندرابوون. زۆربەیان تاوانباری بازاڕیی بوون و چەند سیاسییەکیشیان تێدا بوون. بە بێدەنگی پاڵی بە دیوارەکەدا دابۆوە و لە هەموو لاوە جەستەی چڵکن پاڵەپەستۆیان لەگەڵدا دەکرد. بە هۆی ئازاری زگیەوە، ئاگای لە دەوروبەری خۆی نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی سەرسوڕهێنەری ڕەفتاری زیندانیانی حیزب و ئەوانی دی لێ پەنهان نەبوو. زیندانییانی حیزب، بێدەنگ و ترساو بوون، بەڵام ئەوانی دی گوێیان بە هیچ نەدەدا. جنێوی تەڕ و تازەیان بە گاردەکان دەدا. ئەگەر یەکێ دەستی بۆ شتێکی تایبەتییان ببردبا دەستیان دەوەشاند. وشەی ناشرینیان لە سەر زەوی دەنووسی. خواردنی قاچاغیان لە لۆچی جلەکانیانەوە دەردەهێنا و دەیانخوارد. ئەگەر لە تەلەسکرینەکەوە فەرمانی بێدەنگی دەرکرابا، ئەمان دەیانکرد بە هەرا و دەنگی تەلەسکرینەکەیان کپ دەکرد. لە لایەکی ترەوە، وێ دەچوو پەیوەندی چاکیان لەگەڵ گاردەکاندا هەبێ. بە ناوی خۆیانەوە بانگیان دەکردن و هەوڵیان دەدا لە کونی دەرگاکەوە جگەرەیان لێ وەرگرن. گاردەکانیش لەگەڵ ئەواندا، تەنانەت ئەگەر ناچاری لێدانیشیان ببوونایە، بە پشوو بوون. گەلێ باسی ئۆردوگای بێگار دەکرا کە هێندێکیان چاوەڕوانی ئەوە بوون بۆ ئەوێیان ڕەوانە بکەن. وینستۆن تێگەیی ئەگەر پیاو ناسیاوی لە ناو کاربەدەستاندا هەبێ و فرتوفێڵ بزانێ، ژیانی ئۆردوگاکان یەکجار وا خراپ نییە. بەرتیل و خاتر و یەکترڕووتاندنەوەی هەمەچەشنە، هەتیوبازی و قەحپەبازی و تەنانەت عارەقی قاچاغیش کە لە پەتاتە دروست دەکرا، لێی هەیە. لەوێ، بەندییە عادییەکان دەسەڵاتیان هەیە، و بە تایبەتی بەرەڵا و پیاوکوژەکان جێی باوەڕن. هەموو کارێکی پیس و پۆخڵ، بە بەندییە سیاسییەکان ئەنجام دەدرێ. بەردەوام بەندکراوی هەمەجۆرە دێن و دەچن: حەشیشەفرۆش، دز و ڕێگر، قاچاخچی بازاڕی ڕەش، دەسبەسەرداگری بازاڕ، سۆزانی و ئەوانەی خوویان بە کحوولەوە گرتووە. هێندێ لە عارەقخۆرەکان هێند زبر و بە زەبرن، بەندییەکانی دی ناچارن بۆ بەربەستکردنیان یەک بگرن. ژنێکی کەتەی شەست ساڵەی مەمکزل کە قژە سپییەکەی بە هۆی خۆڕاپسکاندنەوە شێوا بوو و بە دەست چوار گاردەوە دەیزریکاند، هێندرایە ژوورێ. بە هۆی لەقەفرتێوە پێڵاوەکانی لە پێ کرابوونەوە... هاویشتیانە باوەشی وینستۆنەوە و زۆری نەمابوو ڕانێکی بشکێنێ. ژنەکە جێی خۆی

خۆش کرد و شاتاندی: "ئفففف... زۆڵینه! ". له پڕ که زانی جێیەکەی تەخت نییە، لە سەر کۆشی وینستۆن هەستا و لە سەر ستوولەکە دانیشت. گوتی: "بەقوربان ببوورە. ئەو بێ ئەدەبانە لەوێیان دانام. ئەوانە نازانن چۆن لەگەڵ ژندا ڕەفتار دەکرێ".

کەمێ بێدەنگ بوو. دەستێکی بە سینگی خۆیدا هێنا و هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: "ببوورە. ئاگامان لەخۆمان نییە." سەری خوار کردەوە و ڕشایەوە. بە چاوی داخراوەوە سەری بە پشتدا برد و گوتی: "ئێستا باشە. دایم گوتوومە نابێ پێشی بگیرێ. هەر زۆری هێنا پێشی بەردە و ئەه."

هاتەوە سەرخۆ. ئاوڕێکی تری لە وینستۆن دایەوە و سەیرێکی کرد. دەتگوت یەکسەر ئولفەتی لەگەڵدا گرتووە. بازووی توندوتۆڵی لێ ئالاند و لە کاتێکدا بۆنی بیرەو ڕشانەوەی لێ دەهات، بەرەو خۆی ڕایکێشا.

- ناوت چییە ؟.

- سمیت.

- سمیت!. سەیرە. منیش ناوم سمیتە - کەمێ داما - لەوانەیە دایکت بم!.

وینستۆن لە دڵی خۆیدا: دوور نییە. تەمەن و هەیکەلی بۆ ئەوە دەشێن. خەڵک دوای بیست ساڵ بێگاری لە ئۆردوگادا، دەگۆڕێن.

کەسی دی قسەی لەگەڵدا نەکرد. بەندکراوی عادی بە چاوی سووکەوە دەیانڕوانییە سیاسییەکان و بە سووکایەتییەوە پێیان دەگوتن "سیاسی". پێ دەچوو سیاسییەکان نەوێرن لە گەڵ ئەوان و لە نێوان خۆیاندا بدوێن. تەنها یەک جار، دوو ژنی سیاسی کە لە سەر ستوولێک دانیشتبوون، لە کاتی دەنگەدەنگدا، ئەم گوێی لە چپەیان بوو. ناوی ژووری ژمارە (١٠١)یان هێنا. ئەم تێنەگەیشت.

هەر دوو سێ سەعاتێ بوو بۆ ئەوێیان بردبوو. ئازاری گرانی زگی بەردەوام بوو. هێندێ جار چاکتر دەبوو و هێندێ جاریش خراپتر. بەو پێیەش، خەیاڵی فەڕاح و کورژ دەبووەوە. کە خراپتر دەبوو، بیری لای خواردن و ئازار بوو. کە چاکتریش دەبوو ترسی لێ دەنیشت. هێندێ جار ئەو کارەساتانەی پێشبینی دەکرد کە بە سەری دێن. هەناسەی سوار دەبوو و دڵی بە تەپەتەپ دەکەوت. هەستی دەکرد بە کێبڵ لە ئانیشکی دەدرێ. بە پێڵاوی ناڵچەدارەوە، لەقە بە ئێسکی لاقیدا دەدرێ. خۆی لە سەر زەوی دەدی، بە ددانی شکاوەوە دەتلایەوە و دەپاڕایەوە. بە عاستەم جولیای بیر دەکەوتەوە. نەیدەتوانی هۆشی



خۆی وا وەگەڕ بخات کە بیر لەو بکاتەوە. خۆشی دەویست و نەدەبوو وابێ. ئەوە حەقیقەتێ بوو وەک حەقیقەتەکانی چوار شێوەکانی ژماردن. هەستی بە خۆشەویستیی نەدەکرد و بیری نەمابوو چۆنی لە گەڵدا گوزەراندووە. زیاتر بیری لە ئۆبراین دەکردەوە و بیرکردنەوەکەی بە هیوا پاراو بوو. دەبێ ئۆبراین ئاگاداری گرتنی بێ. برایەتی، هەرگیز ئەندامی خۆی ڕزگار ناکا. بەڵام گوێزان هەیە. دەبێ لە دەرفەتێکدا گوێزانی پێ بگەیەنن. لەوانەیە پێنج چرکەی پێ بچێ تا گاردەکە فریای ژوورەوە دەکەوێ. گوێزانەکە، بە قرچەیەکی ساردەوە بە گوشتەکەدا دەچێ و ڕەنگە ئەو پەنجانەش تا سەر ئێسک شەق بکا کە گوێزانەکەیان پێ دەگرێ. لە جەستەی نەخۆشیدا هەستی بە هەموو شتێ دەکرد و بە کەمترین ئازار لەرز دەیگرت. لەوەش دڵنیا نەبوو کە پێی بکرێ گوێزان بەکار بهێنێ ئەگەر دەستیشی بکەوێ. ئارەزووی مانەوە لە چرکەیەکەوە بۆ چرکەیەکی دی سروشتیترە. دە دەقیقەی دی بژی با بە ئازاریشەوە بێ.

هێندێ جار دەیویست کاشییەکانی ژوورەکە بژمێرێ. پێ دەچوو ژماردنیان هاسان بێ، بەڵام هەموو جارێک و هەر جارە و لە جێیەکدا لێی تێک دەچوو. زیاتر بیری لەوە دەکردەوە کە دەبێ لە کوێ بێ و سەعات چەند بێ. یەک جار دڵنیا بوو کە دەرەوە ڕووناکە و جارێکیش دڵنیا بوو کە دەرەوە زۆر تاریکە. دەیزانی لە جێیەکی وەک ئەو ژوورەدا، هەرگیز گڵۆپ ناکوژێتەوە. ئەوێ، ئەو جێیە بوو کە تاریکیی لێ نەبوو: ئێستا زانی ئۆبراین لە بەر چی وا وێ دەچوو لەو قسەیە حالی بووبێ. وەزارەتی ئەوین بێ پەنجەرە بوو. لەوانە بوو ژوورەکەی ئەم لە ناوەڕاستی بیناکەدا بێ یا بەرانبەر دیوارێکی دەرەوە بێ. لەوانە بوو دە نهۆم لە ژێر زەوی بووبێ یا سی نهۆم لە سەرەوەی بووبێ. بیری خۆی وەگەڕ خست تا بزانێ جەستەی خۆی لە بنی عەرددایە یا لە حەلحەلەی ئاسماندایە.

لە دەرەوەڕا دەنگی پێڵاو دەهات. دەرگا پۆڵاینەکە بە تەقەتەق کرایەوە. ئەفسەرێکی لاو بە قاتێکی ڕەشەوە کە وەک چەرمی بۆیاغکراو لە هەموو لاوە دەدرەوشایەوە، سیمای بزڕکابوو و بە دەمامکی لە مۆم دروستکراو دەچو، گورج وەژوور کەوت. دیاردییەکی بۆ گاردەکە کرد کە زیندانییەک بهێنێ. (ئەمپلفۆرت)ی شاعیر بوو و بە لارەلار بەژوور کەوت. دەرگاکە خڕ داخرایەوە.

ئەمپلفۆرت، بە دوودڵییەوە ڕوانییە دەور و بەری خۆی. دەتگوت بە نیازە دەرگایەکی دی ببینێت و پێیدا بچێتە دەرێ. بەڵام دوایی بە ژوورەکەدا کەوتە هاموشۆ. هێشتا وینستۆنی نەدیبوو. بە سەرسوڕمانەوە، مەترێ ژوور سەری وینستۆنی دابووە بەر دیققەت.

پێـخـاوس بوو. پەنجـە گـەورە و چڵکنەکـانی پێی، سـەریان لە کـونی گـۆرەوییـەکـانیـەوە دەرهێنابو. دەمـێکیش بـوو ڕدێنی نەتاشـیـبـوو. مـووی زبری ڕدێنی، تا ئێـسکی گـۆنای گـرتـبـۆوە و شـێـوەی بە جـۆرێ لات دەردەخـست کـە لە گـەڵ قـەڵافـەتـی زل و هەڵسـوکـەوتی شلەژاویدا نەدەگونجا.

وینسـتـۆن، کـەمێ خـۆی لە شلوشـاوی دەربـاز کـرد. دەبـوو بە هەر نـرخـێـک بێ لە گـەڵ ئەمپلفۆرتدا بدوێ و خۆی دوچاری قـیـژەیەکی تەلەسکرینـەکە بکا. دوور نەبوو ئەمپلفۆرت گوێزانەکەی هێنابێ.

– ئەمپلفۆرت.

چ قیـژە لە تەلەسکرینەکە هەڵنەستا. ئەمپلفۆرت کە کەمێ سەرسام بوو، لە جێی خۆیدا ڕاوێستا. وردە وردە سەرنجی چووە سەر وینستۆن.

– ها... سمیت!. تۆیش!.

– لە سەر چ تاوانێ لێرەی؟.

بە قورسیی لە سەر ستولەکەی بەرانبەر وینستۆن دانیشت و گوتی:

– ئەوەی ڕاستی بێ یەک تاوان لە ئارادا هەیە. لەوەی زیاتر چ هەیە؟.

– جا ئەوەت کردووە؟.

– بە زاهیریی، بەڵێ.

دەستێکی بە هەنیـەیدا هێنا و کـەمێ – وەک ئەوەی بیـەوێ شتـێکی بیر کەوێتەوە – بە پەنجەی، تەوژمی خستە سەر لاجانەکانی. بە شێوەیەکی مـەتەڵئامێزەوە گوتی: "شتی وا ڕوو دەدا. هۆیەکـەی دەزانم. لەوانەیە ئەوە بێ. بێگومـان بە ئانقـەست نـەبوو. خـەریکی دواچاپی شیـعرەکانی کیپلینگ بووین، لێگەڕام وشەی (خودا) لە کۆتایی مـەسرەعێکدا بمێنێتەوە." و سەری هەڵبڕی و تەماشایەکی وینستۆنی کرد. بە توندیی گوتی: "هیچی ترم پێ نەدەکرا. گۆڕینی ئەو مەسرەعە مـەحاڵ بوو. لەگـەڵ (دارعـەسا)دا هاوهەوا بوو. تۆ دەزانی وشەی عـەسا، لە هەموو زمانەکەدا تـەنها دوازدە هاوقـافییـەی هەیە؟. چەند ڕۆژ مێشکی خۆمم گوشی، بەڵام شتێکی ترم پێ پەیدا نەکرا و نەکرا."

شێوەی سیـمـای گـۆڕا. تاوێ بێتـاقـەتیی پێـوە دیار نەما و مـەیلەو خـۆشحاڵی جێی گرتەوە. گەرموگوڕیی و بەختەوەریی کـتوپڕ بەوەی کە شتێکی تازەی ئاشکرا کردووە، لە ناو چڵکنیی و ڕدێنەکەیدا دەچروسکانەوە.



– هەرگیز بیرت لەوە کردۆتەوە کە مێژووی شیعری ئینگلیزی ئەوە دەسەلمێنێ کە زمانی ئینگلیزی قافییەی تێدا نییە؟!.

نەخێر هەرگیز ئەو خەیاڵە بە بیری وینستۆندا نەهاتبوو. ئەو دەمەش ئەو باسەی پێ گرینگ نەبوو. گوتی:"دەزانی سەعات چەندە؟."

ئەمپلفۆرت هەڵوێستەیەکی کرد و گوتی: "بیرم لەوە نەکردبۆوە. دەتوانم بڵێم دوو یا سێ ڕۆژ دەبێ دەسگیر کراوم". چاوی بە دەوری خۆیدا گێڕا. دەتگوت هیوای بە پەنجەرە هەیە. "لەم جێیەدا جیاوازی نێوان شەو و ڕۆژ نییە. نازانم خەڵک چۆن تاقەتی حیسابکردنی کاتیان هەیە".

چەند دەقیقەیەک ئەم باس و ئەو باسی هێنایەوە و پاشان بە بێ هیچ بیانوو و هۆیەک، تەلەسکرینەکە بە سەریانیدا شیڕاند و داوای بێدەنگیی لێ کردن. وینستۆن دەستی خستنە سەر یەک و کپ دانیشت. ئەمپلفۆرت، بەو جەستە زلەوە، نەیدەتوانی بە ڕەحەتیی لە سەر ستووله باریکەکە دانیشێ. بەردەوام ئەملا و ئەولای دەکرد و دەستە نارێکەکانی لە سەر ئەم چۆک و ئەو چۆکی دادەنان. تەلەسکرینەکە داوای ئارامبوونی لێ کرد. کات ڕۆیی. بیست دەقیقە، نیو سەعات – زەحمەت بوو بزاندرێ. جارێکی تریش دەنگی پێڵاو لە دەرەوەڕا هات. وینستۆن هەستی دەکرد هەناوی دەپسێ. زوو، زۆر زوو، پێنج دەقیقەی دی، ڕەنگە هەر ئێستا دەنگی پێڵاو نۆرەی ئەم ڕابگەیەنێ.

دەرگا کرایەوە. ئەفسەرە لاوە ڕوخسار ساردەکە وەژوور کەوت. بە دیاردیەکی کورتی دەستی، ئەمپلفۆرتی پێشان دا: ژووری ژمارە (١٠١).

ئەمپلفۆرت بە کاوە خۆ بە نێوان گاردەکاندا ڕەت بوو. ڕوخساری بە جۆرێ گۆڕابوو کە نەدەزاندرا چۆنە.

زەمـانێک – پێ دەچوو درێژ بێ – ڕۆیی. زگـهێشـەکـەی وینسـتۆن سەری هەڵدایەوە. هۆشی بە هەمـان شـوێنەواری جـارانیـدا دەخـولایەوە و وەک تۆپی ڕۆلێت دەوێستـا و دەوێستایەوە، بەڵام هەمیشە لە یەک جێ. تەنها شەش شتی هەبوو بیریان لێ بکاتەوە: ئازاری زگی، کـەرتێ نان، خـوێن و هاوار، ئۆبراین، جـولیـا و گـوێزان. جـارێکی تریش هەناوی بەربووەوە. پارسۆنز وەژوور کەوت. شۆرتێکی خاکی و فانیلەیەکی وەرزشی لەبەر بوون.

– تۆ و ئێرە!.

پارسۆنز، بێ ئەوەی چ سەرسوڕمانێکی پێوە دیار بێ تەماشایەکی وینستۆنی کرد، بەڵام ئەوپەڕی بەستەزمانیی پێوە دیار بوو. بە شڵەژاویی کەوتە هاموشۆ. دیار بوو نەیدەتوانی ئارام بگرێ. هەر جارێ کە چۆکە خڕەکانی ڕاست دەکردنەوە، دیار بوو دەلەرزین. زەق زەق دەیڕوانییە یەک جێ و دەتگوت ناتوانێ سەیری شتێکی دوور نەکا.

بە دەم هەناسەیەکەوە گوتی: " تاوانی بیرا!". لە شێوەی گوتنەکەیدا، هەم دانپێدانان درک پێ دەکرا هەم جۆرە ترسێکی بێ ڕەزا لە گوتنی وشەکە. بەرانبەر وینستۆن وێستا و دەستودامێنی کەوت: "خۆ لەو باوەڕەدا نیت تیرباران بکرێم؟. وایە؟. خەڵک لە سەر تاوانێک تیرباران ناکەن کە ئەنجامی نەدابێ. هەر بیرکردنەوە هیچی پێ ئەنجام نادرێ. وا نییە؟. دەزانم دادگایەکی بەویژدانم بۆ دادەنێن. ئاه، لەو لایەنەوە پشتم قایمە. ناخم دەناسن. وا نییە؟. دەزانی بە منداڵی چەند باش بووم. زیرەک نەبووم بەڵام وریا بووم. پیاوی وەکی من، لە ئۆردوگاکاندا کاری چاکی پێ دەکرێ. خۆ لە سەر ئەوە تیرباران ناکرێم کە یەک جار لە ڕێ لام دابێ.

وینستۆن گوتی: تاوانباریت؟.

پارسۆنز، لە بنەوە سەیرێکی تەلەسکرینەکەی کرد و هاواری کرد: "دیارە تاوانبارم. چما پێت وایە حیزب هەر لەخۆڕا پیاوی بێ تاوان دەگرێ؟." ڕوخساری بۆقئاسای ئارامتر بوو. تا ڕادەیەک، شێوەی پاکژی بە خۆی دا. بە شێوەی ڕێنماییکردنەوە گوتی:" تاوانی بیر خەتەرە. ئاگری ژێر کایە. بێ ئەوەی بە خۆت بزانیت دێتە گیانت. دەزانی چۆن هاتە گیانم؟. لە خەوندا!. بەڵێ ئەوە ڕاستییەکەیە. کارم دەکرد و هەوڵم دەدا ئەرکی خۆم بەجێ بگەیەنم، هەر ئاگاشم لێ نەبوو خەیاڵی خراپ لە کەللەمدا بوو. دوایی بە دەم خەونەوە کەوتمە قسەکردن. دەزانی چییان لە زاری من بیستووە؟.

دەنگی نەوی کرد. وەک یەکێ وشەی ناشرین، بە ناچاری و بۆ دەرمانی دەرد بڵێ، گوتی: "بمرێ ڕێبەری گەورە!. بەڵێ وام گوتووە. بیستم چەند جارێ ئەوەم دووپات کردۆتەوە. لە بەینی خۆماندا بێ، خۆشحاڵم بەوەی کە بەر لەوەی کارەکە گەندتر بێ دەسگیر کرام. دەزانی بە تەمام لە دادگادا بڵێم چی؟. دەمەوێ بڵێم: سوپاستان دەکەم بۆ دەربازکردنم بەر لەوەی کار لە کار بترازێ". وینستۆن گوتی: " کێ بە دەستەوەی دای؟ "

پارسۆنز بە خۆهەڵکێشانێکی خەمناکانەوە گوتی:" کیژە بچکۆلەکەم. لە کونی کلیلی دەرگاوە گوێی گرتبوو. گوێی لە قسەکانم ببوو و ڕۆژی دوایی هەمووی خستبوونە مشتی



پۆلیسەوە. ئەمە بۆ منداڵێکی حەوت ساڵان وریاییە. چ قینم لێی نییە. بە ڕاستی سەریشم پێوە بەرزە. ئەمە، ئەوە دەگەیەنێ کە لە پەروەردە کردنیدا درێغیم نەکردووە."

چەند جارێکی تریش ئەمسەر و ئەوسەری کرد و چاوی بڕیبووە کونی ئاودەستەکە. کتوپڕ، شۆرتەکەی داماڵاند و گوتی: هاوڕێ بمبەخشە، لە دەسەڵاتی خۆمدا نییە. بە هۆی چاوەڕوانییەوەیە.

پاشەڵی پانی خستە سەر قەعدەکە. وینستۆن، بە هەردوو دەستی ڕووی خۆی داپۆشی. دەنگێ لە تەلەسکرینەکەوە قیژاندی: "سمیت!. ژمارە ٦٠٧٩ سمیت و!. ڕووی خۆت دامەپۆشە. نابێ لە بەندیخانەدا ڕووت داپۆشی."

وینستۆن دەستی لابردن. پارسۆنز بە دەم دەنگی ئاشکراوە زگی خۆی بەتاڵ کرد. دوای ئەوە دەرکەوت کە بۆڕییەکانی ئاودەستەکە گیراون، و تا ماوەی چەند سەعاتێ، بۆگەنی بە ژوورەکەدا دەخولایەوە.

پارسۆنزیان برد. گیراوی دی، بێ ئەوەی هیچیان لە بارەوە بزانێ، دەهێندران و دەبران. یەکێکیان ژنێ بوو کە ژووری ژمارە (١٠١)یان پێ ڕاگەیاند، وینستۆن چاوی لێ بوو کورژ بووەوە و ڕەنگێکی هێناو ڕەنگێکی برد. کات دەڕۆیشت. ئەگەر بەیانی بۆ ئەوێیان بردبێ، ئەو دەمە عەسر بوو. ئەگەر عەسریش بردبێتیان، نیوە شەو بوو. شەش گیراوی ژن و پیاو لە ژوورەکە بوون. کڕیان لە خۆ چنیبوو و دانیشتبوون. پیاوێکی بێ چەنەگەی ددانەدرپەڕیو بەرانبەر وینستۆن دانیشتبوو کە بە (قرتێنەر)ی[٢١] گەورەی بێ زەرەر دەچوو. هەردوو گوپی وا دەرپەڕیبوون، نەدەکرا گومان نەکرێ کە نانیان تێدا شاردراوەتەوە. چاوە کاڵە خۆڵەمێشییەکانی، بە ترسەوە، لە ڕوخسارێکەوە بۆ یەکێکی دی دەگواستەوە و هەر کە چاوی بە چاوی یەکێکدا بتەقیبان، زوو دایدەخستنەوە.

دەرگا کرایەوە و گیراوێکی دی وەژوور کەوت. دیمەنی، لەرزی لە وینستۆن هێنا. پیاوێکی ئاسایی بوو. لەوانەبوو ئەندازیار یا تەکنیکی یا شتێکی لەو بابەتانە بووبێ. بەڵام ئەوەی سەرنجڕاکێش بوو ڕوخساری لاوازی بوو. بە هەیکەلی ئێسک دەچوو. بە هۆی لاوازییەوە، چاوی و زاری زۆر گەورە دیار بوون. دەتگوت چاوی پڕن لە ڕق و کینە لە کەسێ یا لە شتێ.

کەمێ لەولای وینستۆنەوە لە سەر ستوولەکە دانیشت. وینستۆن سەیری نەکرد. بەڵام

---

٢١ – قرتێنەر : قوارض – وەک مشک و جرج . – وەرگێڕ

سیمای ئازاردیدەی مردەلۆخەی، وا لە زەینیدا چەسپیبوو، دەتگوت وا بەرانبەری دانیشتووە. کتوپڕ کارەساتەکەی لێ عەیان بوو. ئەو پیاوە، لە برسان بە هیلاک چووبوو. دەتگوت هەمان بۆچوون بە زەینی هەموو زیندانییەکاندا گوزەری کردووە. هەمووان، کەمێ لە جێی خۆیان بزوان. پیاوە بێ چەنەگەکە، بێ وچان سەیری کەللەسەرە مردەلۆخەکەی دەکرد. دوایی، وەک ئەوەی هەست بە بەزەیی بکا، چاوی دادەخستنەوە و دیسان سەیری دەکردەوە. ئاخرێکەی هەستا و بە لارەلار بەرەو لای چوو. دەستی بە گیرفانی بەدلەکەیدا کرد و لەتێ نانی دەرهێنا و بە شەرمێکەوە بۆی درێژ کرد.

قیژەیەکی تووڕەی گوێکەرکەر لە تەلەسکرینەکە هەستا. کابرای بێ چەنەگە لە جێی خۆی ڕاپەڕی. کابرای مردەلۆخەش، وەک ئەوەی بە هەموو دنیا پێشان بدا ئەو دیارییە ڕەت دەکاتەوە، بە پەلە هەردوو دەستی خستنە پشتەوە.

دەنگەکە گوتی: "بۆمستید. ژمارە **٢٧١٣** بومستید ج! ئەو لەتە نانە فڕە دە!".

پیاوە بێ چەنەگەکە بە گوێی کرد. گوپە خڕەکانی دەلەرزین. دەرگا کرایەوە. کە ئەفسەرە لاوەکە وەژوور کەوت و بە لایەوە ڕاوێستا، گاردێکی کورتەبنەی چوارشانە، بە خۆی و شان و پیلی وەک هی دێوەوە، لە پشتیەوە دەرکەوت. بە دیاردییەکی ئەفسەرەکە، بە هەموو هێزی خۆی مشتێکی هەواڵەی دەمی پیاوە بێ چەنەگەکە کرد. پیاوە بێ چەنەگەکە، لە جێی خۆی هەڵکەندرا و ڕما. یەک چرکە، دەتگوت بروسکەی بەر کەوتووە. خوێنێکی زۆر لە دەم و لووتیەوە فوارەی بەست. نووزەیەکی وای لێوە هات دەتگوت بێ ئاگایانەیە. وەرچەرخایەوە و کەوتە سەر چۆک و دەست. بە کاوەخۆ، بە لارەلار جەستەی خۆی ڕاست کردەوە. لە گەڵ خوێن و لیکاوی دەمیدا، جووتێ ددانی دەسکردیش دەرپەڕیبوون.

زندانییەکان، دەستیان ڕاست و چەپ لە سەر چۆکیان دانابوون و کرکەیان لێوە نەدەهات. پیاوە بێ چەنەگەکە گەڕایەوە جێیەکەی خۆی. لایەکی ڕووی شین ببۆوە. زاری وەک زەردەلووی نارێک ئاوسا بوو و شەقێکی ڕەش لە ناوەڕاستیدا بوو. جاروبارێ، دڵۆپێ خوێن دەکەوتە سەر بەدلە شینەکەی. وەک جاران، چاوە خۆڵەمێشییەکانی بە بەندییەکاندا گێڕا، بەڵام ئەم جارەیان شەرمەزار دیار بوو. دەتگوت دەیەوێ بزانێ بە هۆی ئەو تێکشکانەوە، بە چ چاوێکی سووکەوە تێی دەڕوانن.

دەرگا کرایەوە. ئەفسەرە لاوەکە، دیاردی بۆ پیاوە مردەلۆخەکە کرد و گوتی: "ژووری ژمارە(١٠١) ".



وینستۆن لەولای خۆیەوە، گوێی لە هەناسەیەک و دارمانێکی توند بوو. مردەلۆخەکە، خۆی لە سەر چۆک بە زەویدا دابوو و هەردوو دەستی تێکپەڕاندبون. دەستی کرد بە هاوار:
– هاوڕێ!. جەنابی ئەفسەر!. پێی ناوێ بۆ ئەوێم ببەن!. چما هەموو شتێکم نەگوتووە؟. هیچم پەڕاندووە؟. هیچ نییە بیشارمەوە. بەس پێم بڵێ چییە تا دانی پێدا بنێم. دە تۆ بینووسە و من مۆری دەکەم – هەرچییەک بێ. بەڵام ژووری ١٠١ نا.

ئەفسەرەکە گوتی: ژووری (١٠١).

سیمای مردەلۆخەکە گەلێ بێ ڕەنگ بوو. ڕەنگێکی لێ نیشت کە وینستۆن باوەڕی بە چاوی خۆی نەدەکرد. بە بێ هیچ گومانێک سەوز بوو.

هاواری کرد: – چم لێ دەکەن بیکەن. چەند حەفتەیە بە برسێتی ماومەتەوە. ئیدی با کۆتایی پێ بێ و با بمرم. تیربارانم کەن. هەڵمواسن. بیست و پێنج ساڵم بۆ ببڕنەوە. کەس هەیە بتانەوێ بە دەستەوەی بدەم؟. بەس دەمت بکەرەوە هەموو شتێ دەڵێم. گرینگ نییە کێیە و چی بەسەر دێ. ژنێک و سێ منداڵم هەن کە گەورەکەیان شەش ساڵانە. حەزێ دەکەن لە بەر چاوی خۆم سەریان بڕن. ڕادەوێستم و تەماشایان دەکەم. بەڵام ژووری ١٠١ نا.

ئەفسەرەکە گوتی: ژووری (١٠١).

کابرا بە ترس و لەرزێکەوە تەماشای گیراوەکانی تری کرد، دەتگوت دەیەوێ یەکێکی دی لە جێی خۆی بنێرێ. چاوی بە ڕوخساری پیاوە بێ چەنەگەکەوە گیرسایەوە. دەستە ئێسقانییەکەی بۆ درێژ کرد و هاواری کرد: "دەبێ ئەمە بەرن نەک من. گوێتان لێ نەبوو دوای لێدانەکە چی گوت؟. لێم گەڕێن تا وشە بە وشە پێتانی بڵێم. ئەوە، ئەوە کە دوژمنی حیزبە نەک من". گاردەکانی لێ هاتنە پێش. کابرا دەنگی بوو بە زریکە: "ئێوە گوێتان لێ نەبوو!. تەلەسکرینەکە سەقەتە. دەبێ ئەو بەرن... ئەو بەرن نەک من!".

دوو گاردەکە چەمابوونەوە تا باسکی بگرن. لە پڕێکدا، بە زگەخشکە خۆی گەیاندە پایەی ئاسنینی ستوولەکە و چنگی لێ گیر کرد. دەیوبقاند. گاردەکان دەیانویست دەستی پێ بەردەن بەڵام ئەو پێوەی لکا بوو و لێی نەدەبووەوە. دەوری سیی چرکە ڕاکێش و بکێش بوو. بەندییەکان، دەست لە سەر چۆک لە زەوی ڕامابوون و کرکەیان لێوە نەدەهات. ویقەویق بڕا. بایی خۆ گرتن نەبێ چ هەناسەی تێدا نەمابوو. لەقەی یەکێ لە گاردەکان پەنجەکانی شکاندن... جۆرە ویقەیەکی تری لێ هەستا. هەڵیانساندە سەر پێ.

ئەفسەرەکە گوتی: ژووری (١٠١).بەو حاڵەوە، بە بێ هێزی بەرگریکردن، بە پەنجەی شکاو و سەری خوارەوە، بە لارەلار بردیان.

ماوەیەکی زۆری پێ چوو. ئەگەر ئەو دەمەی مردەلۆخەکەیان برد نیوەشەو بووبێ، بەیانی بوو. ئەگەر بەیانی بووبێ، ئەوا دوای نیوەڕۆ بوو. چەند سەعاتێکیش بوو وینستۆن بە تەنها بوو. دانیشتنی سەر ستوولە باریکەکە هێند بێزاری کردبوو، جاروبارێ بێ ئەوەی ڕوخسەت لە تەلەسکرینەکە بخوازێ، هەڵدەستا و پیاسەی دەکرد. ئەو تیکە نانەی کە پیاوە بێ چەنەگەکە جێی هێشتبوو هەر لەوێ بوو. لە سەرەتاوە، هەوڵی زۆری دەویست تا سەیری نەکا. بەڵام دوایی توینێتی جێی برسێتی گرتەوە. زاری چرێشاوی و تامی ناخۆش بوو. زرینگەی سەری و تیشکی سپی و بەردەوامی گلۆپەکە بێتاقەتیان دەکرد. ئازاری لە وزە بەدەری ئێسکەکانی ناچاری هەستانی دەکرد بەڵام زوو دادەنیشتەوە چونکە هێند گێژ ببوو خۆی بە پێوە پێ ڕاگیر نەدەکرا. ئەگەر بە سەر ئازاردا زاڵ بوایە ترس هەراسانی دەکرد. جاروبار، بە هیوایەکەوە بیری لە ئۆبراین و گوێزان دەکردەوە. خواردنیان پێ بدابا، لەو باوەڕەدا بوو گوێزانی تێدا شاردرابێتەوە. زۆر جار، هەر لەخۆڕا جولیای بیر دەهاتەوە. دوور نەبوو بارودۆخی ئەو خراپتر بێ. ڕەنگە لەم کاتەدا بزریکێنێ. بیری کردەوە: "بمتوانیبا جولیا بەوە ڕزگار کەم کە لە بری ئەویش ئازار بدرێم. پێم دەکرێ؟. ئا پێم دەکرێ". بەڵام لە خەیاڵێ بەولاوە نەبوو کە بە هۆشیدا هات و هیچ پەیوەندییەکی بە واقیعەوە نەبوو، هەستی پێ نەدەکرد. لە جێی وادا هەست بە هیچ ناکرێ ئازار و چاوەڕوانکردنی ئازار نەبێ. باشە دەکرێ یەکێ بە دەم ئازارەوە بتلێتەوە و لە بەر هەر هۆیەک بێ بیەوێ ئەو ئازارە زیاد بکرێ؟. بەڵام جارێ ئەو پرسیارە بە بێ وەڵام بوو.

دەنگی پێڵاو نزیک دەبووەوە. دەرگا کرایەوە و ئۆبراین بەژوور کەوت.

وینستۆن، جووتەپێ هەستا. سەرسامی، هەموو جۆرە وریابوونێکی بیر بردەوە. دوای ئەو هەموو ساڵانە، بۆ یەکەم جار تەلەسکرینی بیر نەما. هاواری کرد: " تۆشیان گرت؟!."

ئۆبراین بە گاڵتەیەکی خەمئامێزەوە گوتی: "دەمێکە منیان گرتووە". کەمێ لاکەوت. گاردێکی سینگ پان و تێلابەدەست لە پشتیەوە وێستابوو.

ئۆبراین گوتی: وینستۆن بەمەت دەزانی. خۆت فریو مەدە... بەمەت دەزانی و هەمیشە لە خەیاڵتدا بوو".

ئا... ئێستا بۆی دەرکەوت کە هەمیشە لە بیری بوو. بەڵام ئێستا کاتی بیرکردنەوەی



نەبوو. ئەوەی کە بیری لێ دەکردەوە، تێلاکەی دەستی گاردەکە بوو. بۆی هەیە بەر هەر شوێنێ بکەوێ: سەر، گوێ، مەچەک، ئانیشک...

ئانیشکی!. وەک ئیفلیج کەوتە سەر چۆک و دەستی بە ئانیشکیەوە بوو. هەموو شتێ لە ناو تیشکێکی زەرددا تەقییەوە. باوەڕ نەدەکرا نەدەکرا یەک لێدان ئەو هەموو ئێشەی پێ بگەیەنێ!. تیشکە زەردەکە بەر چاوی بەر دا و ئەو دووەی دیتن کە سەیریان دەکرد. گاردەکە، بە تلانەوەی ئەو پێدەکەنی. بە هەرحاڵ، وەڵامی پرسیارێ درایەوە. هیچ کاتێک، لە بەر هیچ هۆیەک، حەز ناکەیت ئازارت زیاد بکا. لە بارەی ئازارەوە یەک شت دەگوترێ : "نەمێنێ". هەر وا لە سەر زەوی کەوتبوو و دەپلکایەوە و بێ هوودە دەستی بە بازووە لە کارکەوتووەکەیەوە بوو، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: هیچ شتێ لە دنیادا وەک ئێشی لەش ناخۆش نییە. بەرانبەر ئێش، قارەمان نییە نا.

## ۲

له سەر شتێ ڕاکشابوو، کە بە قەرەوێڵەی ئۆردوو دەچوو هێندە نەبێ کە بنەوەی بەرزتر بوو و بە جۆرێ پێوەی شەتەک درابوو کە نەبزوێ. تیشکێکی بەتین بەر ڕوخساری دەکەوت. ئۆبراین بە دیاریەوە ڕاوێستابوو و سەرنجی دەدا. پیاوێکی بەرگ سپی و شرینقە بە دەست لە لایەکەی تریەوە بوو.

کە چاوی کردنەوە و ڕوانییە دەوروبەری خۆی، پێی وابوو لە جیهانێکی ترەوە، لە جیهانی ژێر دەریاوە، بە مەلە گەیشتۆتە ئەو ژوورە. نەیدەزانی لە کەیەوە لەوێیە. لەو دەمەوەڕا کە گیرابوو، نە ڕووناکایی ڕۆژی دیبوو نە تاریکایی شەو. جگە لەوەش، هۆشی خۆی پێ گرد نەدەکرایەوە. گەلێ جار، تەنانەت ئەو بابەتە هۆشەشی کە لە خەوندا دەمێنێ، لە کار دەکەوت و دوای مەودایەکی وەک بۆشایی، پەیدا دەبووەوە. بەڵام لەگەڵ یەکەم لێدانی ئانیشکیدا دێوەزمە سواری سەری ببوو. دوایی تێدەگا کە هەموو ئەوانەی ڕویان دا، پێشەکییەکی ئاسایی لێکۆڵینەوە بوون و وەک ڕۆتین، هەموو بەندکراوێکیان پێدا ڕەت دەبن. ڕیزێ خەتا هەبوو - جاسووسێتی، گێرەشێوێنی و شتی لەو بابەتانە - دەبوو هەموو کەسێ لەخۆڕا دانیان پێدا بنێ. نەیدەزانی چەند جار و ماوەی چەندێ لێیانداوە. بەردەوام، بە پێنج شەش زەلامی بەرگ ڕەش لێیان دەدا. بە مشتەکۆڵە، بە دار، بە شیش و پێڵاو. گەلێ جار وەک ئاژەڵ، بە بێ هیچ شەرمێک دەپلکایەوە و خۆی بەملا و ئەولادا دەدا تا خۆی لە لەقە چەپارە بدا. هەر ئەوەش دەبووە هۆی ئەوەی کە لەقەی زیاتر بەر ددانی، زگی، ئانیشکی، قاچی، ڕانی، گونی و کلێنچکی بکەوێ . بەعزێ جار کە لێدان بەردەوام دەبوو، دەرد و ئازاری نەدەخستە ئەستۆی گاردەکان بەڵکو بۆ نەبوورانەوەی خۆی دەیگێڕانەوە. زۆر جار بەر لە دەسپێکردنی ئازار هاواری پاڕانەوەی لێ هەڵدەستا و کە چاوی بە مشتێ دەکەوت بۆی حازرە، هێندەی نەدەما لێشاوی دانپێدانانی ڕاست و درۆ بە زاریدا بێ. هێندێ جاریش بڕیاری دەدا دان بە هیچدا نەنێ تا هەر وشەیەک کە دەیلێ بە ناو یەک دنیای ئازاردا تێپەڕ نەبێ. هێندێ جاریش چارەسەری مام ناوەندی بە خەیاڵدا دەهات و بە خۆی دەگوت : "دانی پێدا دەنێم بەڵام جارێ نا. دەبێ خۆڕاگر بم تا ئەو دەمەی ئازار لە ڕادە بەدەر دەبێ. سێ پێلەقەی دی، دووی دی، ئەوجا چییان بوێ دەیلێم". هێندێ جار، هێندەیان لێ دەدا خۆی بە پێوە پێ ڕاگیر نەدەکرا. وەک گونیە پەتاتە لە ژوورەکەیان فڕە دەدا تا کەمێ دەهاتەوە هۆش. دیسان بەر دەبوونەوە



وێزەی. مەودای سەلامەتی دوور و درێژیش هەبوون کە بە زەحمەت بیری دەکەوتنەوە، چونکە یا بە خەو بە سەر دەچوون یا بە بوورانەوە. ژوورێکی بیر کەوتەوە کە تەختەیەکی دارینی تێدا بوو و وەک ڕەفت لە دیوارەکەوە دەرهاتبوو. دەسشۆر و شۆربای گەرم و جاروبارێ قاوەشی لێ بوو. سەرتاشێکی عەبووسیش دەهات و سەر و ڕیشی دەتاشی و خەڵکی سپی پۆش و بەدعەمەلیش، لێدانی دڵیان دەپێوا و ڕادەی کاردانەوەیان تاقی دەکردەوە و پێڵوی چاویان هەڵدەدایەوە و بە توندی پەنجەیان بە جەستەیدا دەهێنا تا ئێسکی شکاو بدۆزنەوە و دەرزی خەویان لێ دەدا.

ئەشکەنجەی کەمتر دەبوو و زیاتر هەڕەشەی لێ دەکرا. واتە، ئەگەر وەڵامی بەجێی نەداباوە هەڕەشەی ئەشکەنجەی لێ دەکرا. ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان لە گەڵدا دەکرد، ئیدی جل ڕەشە دڵڕەقەکانی پێشوو نەبوون بەڵکو هەرەوەزکەرانی حیزب، پیاوی خرکەڵەی گورجوگۆڵ بە چاویلکەی بریقەدارەوە، بە نۆرە بە دیارییەوە بوون - ئەو پێی وابوو، بەڵام دڵنیا نەبوو - هەر جارە و دە دوانزە سەعات چاودێرییان دەکرد تا ئێشێکی کەم، بەڵام بەردەوامی هەبێ. ئەرکی سەرەکییان ئێش نەبوو کە خۆی پێوە خەریک کەن. بە شەپازلە پێییاندا دەکێشا، لووتیان با دەدا، قژیان ڕادەکێشا، بە زۆر لە سەر یەک پێ ڕایاندەگرت، ڕێی مێزکردنیان نەدەدا، تیشکی بەهێزیان ئاراستە دەکرد تا ئاو بە چاویدا دادەچۆڕا. مەبەستی سەرەکییان ئەوە بوو سووکایەتی پێ بکەن و توانای بیر کردنەوەی پێ لە دەست بدەن. چەکی بێ ئامانی ڕاستەقینەی ئەمانە درێژە کێشانی چەند سەعاتە بوو. گەلێ جار بە هەڵەیاندا دەبرد و دەیانخستە تەڵەوە و قسەکانیان دەگۆڕی و بە درۆزن و گوتنی قسەی بێ سەر و پێ، تاوانباریان دەکرد تا وای لێ دەهات لە بەر شەرمەزاری و ماندووبوون دەگریا. گەلێ جار جنێویان پێ دەدا و لە کاتی پێویستدا هەڕەشەی گاردەکانیان لێ دەکرد. بەڵام هێندێ جار شێوەی ئاخاوتنیان دەگۆڕا. بە "هاوڕێ" بانگیان دەکرد و بە ناوی سۆسینگ و ڕێبەری گەورەوە دەستودامێنی دەکەوتن و دەیانویست بزانن ئاخۆ هێندەی وەفا بۆ حیزب تێدا ماوە دەردی ڕابردووی چار بکات - دوای چەندین سەعات لێکۆڵینەوەی وزەبڕ، ئەم دەستودامێنکەوتنەش ئەشکی بە چاویدا دەهێنایە خوارێ. ئەم گفتوگۆیە، لە مشت و پێلەقەی گاردەکان پتر کاری تێ دەکرد و تێکی دەشکاند. ڕێک ببوو بە زارێک و قسانی دەدا. ببوو بە دەستێک و بۆ هەموو شتێ مۆری دەکرد. خەمە هەرە گەورەکەی ئەوە بوو بزانێ چییان لێ دەوێ تا زوو بیلێ و شەڕەشەق دەست پێ نەکاتەوە. دانی بەوەدا نا کە ئەندامی پێشکەوتووی حیزبی کوشتووە، پڕوپاگەندەی بڵاو کردۆتەوە، دزیی لە داهاتی

گشـتی کردووە، نهێنی سەربازیی فرۆشـتووە، خراپەکاریی هەمەچەشنەی کردووە. دانی بەوەدا نا کـە سالّی ١٩٦٨ جاسـووس و پیاوی ڕۆژهەلاّتی ئاسـیا بووە. دانی پێدا نا کە لایەنگری باوەڕی سەرمایەداری بووە و دووەکیش بووە. دانی بەوەدا نا کە ژنەکەی خۆی کوشتووە هەرچەندە دەیزانی کە ئەوانیش دەزانن ژنەکەی ماوە. دانی بەوەدا نا کە سالّەهای سالّ پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەلّ گۆلّدستەیندا هەبووە و ئەندامی حیزبێکی نهێنی بووە و زۆربەی خزم و ئاشنایانی لەگەلّ بوون. دانپێدانان بە هەموو شتێک و گرفتارکردنی هەموو کەسێ ئاسان بوون. هەرچیشی دەگوت جۆرە ڕاستگۆییەکی تێدا بوو. ڕاست بوو دوژمنی حیزب بوو، و لە دیدی حیزبەوە جیاوازی لە نێوان بیرکردنەوە و کرداردا نەبوو. شێوەی بیرکردنەوەی تریشی هەبوو کە وەک تابلۆی دوورەدەست جاروبارێ دەردەکەوت.

لە ژوورێکدا بوو کـە دەشێ بلّـێی تاریـک بوو، ڕووناکـیش بوو چونکە ئەوەی ئەو پێی دەبیندرا جـووتێ چاو بوو. ئامێـرێکی بە دیارەوە بوو کـە بە کاوەخۆ و بەردەوام چکەچکی دەکرد. چاوەکان، گەورەتر و ڕووناکـتر دەبوون. کتوپڕ، بە حەوادا بەرز دەبووەوە و چاوەکان لووشیان دەکرد.

لە ژێر تیشکێکی بەتیندا، بە کورسییەکەوە بەسترابۆوە کە ژمارە بە هەمـوو لایەکیـەوە بوو. پیـاوێکی جل سـپی ژمـارەکـانی دەخـوێندەوە. لە دەرەوەڕا دەنگی هەنگاو دەهات. دەرگا کرایەوە و ئەفسەرە ڕوخسار مۆمەکە بەژوور کەوت و دوو گاردی بە دوودا هاتن.

ئەفسەرەکە گوتی: "ژووری ژمارە ١٠١ ".

پیاوە جل سپییـەکە هیچی نەگوت. تەماشای وینستۆنیشی نەکرد. هەر لە ژمارەکان ڕامابوو.

بە کـۆریدۆریکی گـەورەدا کـە یەک کیلۆمەتر پان دەبوو و پڕ بوو لە چرای زەردی گـەش، بەرەوخوار دەبووەوە و یەک بە خۆی پێدەکـەنی و پڕ بە دەنگی دانی بە تاوانەکانی خۆیدا دەنا. دانی بە هەمـوو شـتـێکدا نـا تەنانەت ئەوانەش کـە لە ژێر ئازاردا ڕایگـرتبـوون و نەیگوتبـوون. باسی مـێژووی ژیـانی خـۆی بۆ ئەوانە گـێـڕایەوە کـە بە خـۆیان دەیانزانی. چاودێری گـارد و لێکۆلّەرەوەکـانی تر و بەرگ سـپـییـەکـان و ئۆبراین و جـولیـا و چارینگتـۆنیشی لەگەلّدا بوون و هەمـوو وێکڕا دەڕۆیشتن و قـاقا پێدەکەنین. ڕووداوێکی تۆقـێنەر کە لە هەناوی داهاتوودا بوو، بە جـۆرێ لە جـۆرەکـان، لە کـار خـرا و ڕوودانی بۆ نەما. هەمـوو شـتێ ڕێکوپێک بوو، ئازاری نەمابوو، بچووکـترین لایەنی ژیـانی ئاشکرا و زاندراو و بوردراوبوو.



بەو بڕوایەوە کە دەنگی ئۆبراینی گوێ لێ بوو، لە سەر تەختە دارینەکە ڕاست بووەوە. لە مـاوەی هەمـوو لێکـۆلّینەوەکـاندا، پێی وا بوو ئۆبراین بە دیاریەوەیە، بەلاّم لە پەنایـەکـدا دەوێستا کە لێیەوە دیار نەبێ. ئەو بوو کە سەرپەرشتی گشت شتێکی دەکرد. ئەو بوو کە گاردی تێ بەردەدان و ئەو بوو لێ نەدەگەڕا بیکوژن. ئەو بوو بڕیاری دەدا کەنگێ وینستۆن لە دەست ئازار بقـیـژێنێ و کەی پشـوو بدا و کەی نان بـخوا و کەی بخەوێ و کەی دەرزی مۆرفیون لە باسکی بدرێ. ئەو بوو کە پرسیاری دەکرد و پێشنیاری وەلاّمدانەوەشی دەکرد. ئەو ئەشکەنجەدەر و پشتیـوان و چاودێریکەری باوەڕ، و دۆستیـش بوو. جارێکیـان – بیری نەدەکەوتەوە. ئایە بە دەم سەرخۆشی مۆرفینەوە بوو یا لە خەونێکی ئاسایی وەئاگا هاتبۆوە – دەنگێ بە پەناگـوێیـدا چپـاند: "وینسـتـۆن، چ خـەمـت نەبێ. تۆ لە ژێر سایەی مندای. ڕەفتاری حەوت سالّتم چاودێری کردووە. ئێستا کاتی وەرچەرخانەوەت هاتووە. ڕزگارت دەکـەم. دەتگەیەنمە حـالّەتی کـەمـالّ". دلّنیـا نەبوو ئەوە دەنگی ئۆبراین بێ. بەلاّم هەمـان دەنگ بوو بەر لە حەوت سالّ پێی گوتبوو: "لەو جێیە یەکتر دەبینین کە تاریکی لێ نییە".

چ کۆتایی پێهێنانی لێکۆلّینەوەی لە بیر نەبوو. ماوەیەکی تاریکی بە سەردا ڕەت بوو. لە ژوورێک، یا لە ژوورێکی تەنهـاییدا بوو و وردە وردە دەوراودەوری خۆی لێ دەرکەوت. ڕێک لە سـەر تەختـێک، پان ببـۆوە و نەیدەتوانی ببـزوێ. هەمـوو جێـیـەکی جەسـتـەی بەسترابۆوە. تەنانەت پشتەسەریشی قایم کرابوو. ئۆبراین، بە سیمای مۆن و خەماوییەوە سەرنجی دەدا. کە لە خوارەوەڕا سەیری ڕوخساری ئۆبراینت دەکرد، دڕ و بلّ دیار بوو. دوو کیـسـەکـانی خـوار چاوی و ئەو لۆچانەی کـە لە لووتیـەوە بەرەو چەنەگەی دەکشـان، لەوە پیرتریان دەردەخست کە وینستۆن بە بیریدا دەهات. چل و هەشت یا پەنجا سالّ دیار بوو. میتالّێکی بە میلی بە دەستەوە بوو کە ژمارەی بە دەورەدا نووسرابوون. ئۆبراین گوتی: پێم گوتی ئەگەر یەک ببینین لێرە یەک دەبینین.

وینستۆن گوتی: وایە.

بە بێ هیچ پێـشـەکی و ئاگـادارکـردنەوەیەک، هەر بە بزواندنی پەنجـەیەکی ئۆبراین، شەپۆلی ئازار بە جەستـەی وینسـتـۆندا گەڕا. ئازارێکی تۆقێنەر بوو چونکە نەیدەزانی چ قەوما. هەستیشی بە ئازارێکی کوشندە دەکرد و نەیدەزانی ئەوە لە ڕاستیدا ڕوو دەدا یا تەزوویەکی کارەبایە و پێیدا دێ. شێوازی جەستەی دەگۆڕا و جمگەکانی لێک دەترازان. هەرچەندە ئازار بووە هۆی ئەوەی نمێ عـارەقـە لە هەنیـەی بنیـشێ بەلاّم ئەوەی لە هەمـوو شتێ زیاتر دەیترساند ئەوە بوو کە گرێکانی بڕبڕەی پشـتی لێک بترازێن. ددانی پێکەوە

نووساندن و له لووتیەوە هەناسەی دەدا و هەوڵی دەدا تا پێی بکرێ بێدەنگ بێ.

ئۆبراین کە سەیری ڕوخساری دەکرد، گوتی: "دەترسیت کەمێکی دی جێیەکت بشکێ. ترسی ڕاستەقینەی تۆ ئەوەیە گرێکانی پشتت بترازێن و مۆخی ناویان بڕژێ. بیر لەوە دەکەیتەوە، وا نییە؟".

وینستۆن وەڵامی نەدایەوە. ئۆبراین دوگمەکەی با دا. ئازارەکە، چۆن کتوپڕ پەیدا بوو کتوپڕیش بڕا. ئۆبراین گوتی: چل بوو. ئەها تەماشا کە، ژمارەکان دەگەنە سەد. تکایە بە درێژایی وتووێژەکانمان لە بیرت بێ کە هەر ساتێ بمەوێ و تا چەندم بوێ، ئازار بە جەستەت دەگەیەنم. ئەگەر درۆیان بکەی یا نیازی ئەوەت هەبێ قسەی دوو لایەنە بکەین یا تەنانەت هۆشی ئاسایی خۆت بە کار نەهێنی، یەکسەر هاوارت دەگاتە حەوا. تێگەیشتیت؟.

– بەڵێ تێگەیشتم.

ئۆبراین کەمتری قین پێوە دیار ما. چاویلکەکەی، بە دەم بیرکردنەوەوە لە سەر لووتی ڕێک خست و یەک دوو هەنگاو ئەمسەر و ئەوسەری کرد. کە کەوتە ئاخاوتن، لە سەرخۆ دەدوا. شێوەی پزیشک و مامۆستا و تەنانەت (کەشیش)ی پێوە دیار بوو. بە پەرۆشەوەهاتنی خۆی ڕوون کردەوە و باوەڕپێهێنانی لەوە زیاتر پێوە دیار بوو کە سزای بدا. گوتی: وینستۆن بە هۆی تۆوە تووشی سەرێشە دێم، چونکە نرخی ئەو سەرێشەیەت هەیە. ڕێک دەزانی چیتە. ساڵەهای ساڵە دەزانیت و بە گژی زانستدا دەچیتەوە. پارسەنگی عەقڵت تێک چووە و دوچاری دەردی کەمهۆشیی بووی. ڕووداوی ڕاستەقینەت بیر ناکەونەوە و ئەگەر ڕووداوێکیشت بیر کەوتبێتەوە، پێت وایە هەرگیز ڕووی نەداوە. خۆشبەختانە چارەسەر دەکرێی. هەرگیز هەوڵی چارەسەرت نەداوە، چونکە نەتویستووە. کەمێ ئارەزووی دەوێ تا ئەوە بکەیت. دەزانم ئێستا پێوەی چەسپاویت، چونکە پێت وایە ئەوە مەردایەتییە. با نموونەیەکت بۆ بهێنمەوە. لەم ساتەدا، کامە زلهێز لە گەڵ ئۆقیانووسیادا لە شەڕدایە؟.

– ئەو دەمەی من گیرام، ئۆقیانووسیا لە گەڵ ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا شەڕی بوو.

– ئافەرین. ئۆقیانووسیا هەمیشە لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا شەڕی بووە. وا نییە؟.

وینستۆن هەناسەیەکی هەڵکێشا. دەمی کردەوە تا بدوێ بەڵام هیچی نەگوت. نەیتوانی چاوی لە میتاڵە میلدارەکە بگوێزێتەوە.



– وینستۆن، بێ زەحمەت ڕاستی بێژە. ئەو ڕاستییەی کە خۆت باوەڕت پێی هەیە. ئەوە بڵێ کە لە بیرتە.

– لە بیرمە کە تەنها یەک حەفتە بەر لە گرتنم، لە گەڵ ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا شەڕمان نەبوو. ڕۆژهەڵاتی ئاسیا هاوپەیمانمان بوو. شەڕ دژی ئەوروئاسیا بوو. چوار ساڵی کێشا. پێش ئەوەی ...

ئۆبراین دیاردی بێدەنگی بۆ کرد و گوتی:

– نموونەیەکی دی. چەند ساڵێ لەمەوبەر دووچاری نەخۆشی واهیمە ببووی. وات دەزانی سێ کەس لە ئەندامانی پێشووی حیزب کە ناویان جۆنز و هارسۆن و ڕۆتەرفۆرت بوو – ئەوانەی کە دوای دانپێدانانی تەواو و بە هۆی خیانەتکاری و خراپەکارییەوە عیدام کران – بێ تاوان بوون. وات دەزانی بەڵگەنامەت بەر چاو کەوتووە کە ناڕاستی تاوانەکانیان دەسەلمێنێ. وێنەیەکیش هەبوو کە دووچاری گومانی کردی. وا لە خەیاڵتدا چەسپی بوو کە بەڕاستی بە دەستی خۆتەوە گرتووە. وێنە یا شتێکی تری لەو بابەتە بوو.

پارچە ڕۆژنامەیەک لە نێوان پەنجەکانی ئۆبراینەوە دەرکەوت. دەوری پێنج چرکە لە بەر چاوی وینستۆن ڕایگرت. چ دوودڵی پێ نەدەویست هەمان وێنە بوو. کۆپییەکی تری وێنەکەی جۆنز و هارسۆن و ڕۆتەرفۆرت بوو کە کاتی خۆی بۆ کاری حیزبی چووبوونە نیویۆرک و بەر لە یانزە ساڵ وینستۆن دیبووی و دەمودەست فەوتاندبووی. ماوەیەکی کەم لە بەر چاوی بوو، دوایی ون بوو. بەڵام دیتی. گومانی نەدەویست کە دیتی!. وەک مریشکی سەربڕاو کەوتە هەڵپە تا نیوەی سەرەوەی جەستەی خۆی ڕاست کاتەوە. بەڵام لە هیچ لایەکەوە لە یەک سانتیمەتر پتر خۆی بۆ نەدەبزوا. لەو دەمەدا میتاڵە میلدارەکەی بیر چووبوو. هەموو هەوڵێکی ئەوە بوو جارێکی تریش ئەو وێنەیە بە دەستەوە بگرێ یا هیچ نەبێ ببینێتەوە. هاواری کرد: ئەو وێنەیە بوونی هەیە!.

ئۆبراین گوتی: "نا" و بەرەو ئەوسەری ژوورەکە ڕۆیشت. چالێکی خەیاڵ بە دیوارەکەی ئەوبەرەوە بوو. قەپاغەکەی هەڵبڕی. پارچە ڕۆژنامەکە، بێ ئەوەی لە بەر چاو بێ، هەوای گەرم دەیخولاندەوە و لە ناو گڕی ئاگردا مەحف بووەوە. ئۆبراین پشتی لە دیوارەکە کرد و گوتی: "خۆڵەمێش، خۆڵەمێشی ئاسایی نا. گەرد. وێنە لە ئاردا نییە. هەرگیز بوونی نەبووە".

– بەڵام ماوەیەک بوونی هەبوو. ئێستاش بوونی هەیە. لە هۆشمدا بوونی هەیە. من لە هۆشی خۆمدا هەڵمگرتووە. تۆش هەڵتگرتووە.

– من ئەوەم لە هۆشدا نییە.

تەپە لە دڵی وینستۆنەوە هات. قسەکەی ئۆبراین بەڵگەی باوەڕی دووفاقانە بوو. هەستی بێدەسەڵاتییەکی کوشندە چنگی لە گیانی وینستۆن گیر کردبوو. ئەگەر دڵنیا بوایە کە ئۆبراین درۆ دەکا قەیدی نەبوو. بەڵام ڕێی تێ دەچوو ئۆبراین بە تەواوی وێنەکەی لە بیر کردبێ. ئەگەر وابێ، وەیادهێنانەوەکەشی لە بیر کردووە. چۆن دڵنیا بێ کە فێڵ نییە؟. لەوانەیە، ئەو جێگۆڕکێیە شێتانەیە لە ڕاستیدا ڕوو بدا. ئەو بیرکردنەوانە دەیانهاڕی.

ئۆبراین، بە دەم بیرکردنەوەوە سەرنجی دەدا. شێوەی بە مامۆستایەک دەچوو کە لە پێناوی منداڵێکی لاسار بەڵام ژیردا ڕەنج بکێشێ. گوتی: "یەکێ لە دروشمەکانی حیزب لە بارەی دەستەمۆکردنی ڕابردووەوەیە. دەکرێ بیڵێی؟".

وینستۆن بەگوێی کرد و گوتی: "ئەوەی ڕابردوو دەستەمۆ بکا ئێستاش دەستەمۆ دەکا، ئەوەی ئێستا دەستەمۆ بکا پاشەڕۆژ دەستەمۆ دەکا".

ئۆبراین کە سەری ڕەزامەندی بۆ لەقاند، گوتی: "ئەوەی ئێستا دەستەمۆ بکا ڕابردووشی پێ ڕام دەکرێ. تۆ لەو باوەڕەدای کە ڕابردوو بوونی ڕاستەقینەی هەبێ؟".

هەستی بێدەسەڵاتی وینستۆنی گرتەوە. چاوی ئاراستەی میتاڵە میلدارەکە بوون. نەیدەزانی بە (ئا) لە ئازار دەخەلەسێ یا بە (نا). نەشیدەزانی باوەڕی بە کامەیان هەیە. ئۆبراین بزەیەکی کرد و گوتی: "وینستۆن! تۆ فەیلەسوف نیت. تا ئێستا بیرت لەوە نەکردۆتەوە کە مەبەست لە بوون چییە. وردتر بڵێم، ئایە ڕابردوو جێی لە ناو بووندا هەیە؟. ئایە لێرە و لەوێ دنیایەک هەیە ڕابردووی بە شێوەی ماددی تێدا بێ".

– نەء.

– دەی باشە، ئەگەر ڕابردوو هەبێ لە کوێ هەیە؟.

– لە بەڵگەنامەدا تۆمار کراوە.

– بەڵگەنامە و...

– هۆش... لە بیرەوەری بنیادەمدا.

– بیرەوەری. زۆر باشە. ئێمە، واتە حیزب، هەموو بەڵگەنامە و بیرەوەریەکمان لە ژێر دەسەڵاتدان. بەو پێیە، ڕابردووشمان لە ژێر دەسەڵاتدایە. وا نییە؟.

وینستۆن کە دیسان بۆ ساتێ میتاڵە میلدارەکەی بیر چوو، قیژاندی: "بەڵام چۆن



دەتوانی پێش لە بنیادەم بگریت و نەهێڵی ڕووداو بخاتە هۆشی خۆیەوە؟. ئەوە لە سەرووی دەسەڵاتی مرۆڤەوەیە و هەر لە خۆڕا دێ. چۆن دەکرێ هۆش بخەیتە ژێر ڕکێفی خۆتەوە؟. خۆ دەسەڵاتتان بە سەر هۆشی مندا ناشکێ!".

ڕوخساری ئۆبراین گرژ بوو. دەستی خستە سەر میتاڵە میلدارەکە و گوتی: "بە پێچەوانەوە. خۆت دەسەڵاتت بە سەریدا ناشکێ. هەر لە بەر ئەوەشە لێرەی. لێرەی چونکە لە تاقیکردنەوەی خۆڕاگری و خۆ بە بچووکزانین دەرنەچووی. لە خۆ بە دەستەوەداندا کە نرخی عاقڵبوونە سەرنەکەوتوی. تۆ بڕیارت داوە شێت بیت، کەمایەسییەکی تاکەکەسی بیت. تەنها مێشکی ساغ پێی دەکرێ ڕاستی ببینێ. وینستۆن! وا دەزانی حەقیقەت دیاردەیەکی ئۆبجەکتیڤە، شتێکە لە دەرەوەی ئێمەدا بوونی سەربەخۆی خۆی هەیە. هەروەها پێت وایە سروشتی حەقیقەت بەڵگەنەویستە. کاتێ خۆت فریو دەدەی تا هۆشت بە بوونی شتێ بخەڵەتێنی وا دەزانی هەموو کەس، هەمان شت دەبینێ.بەڵام وینستۆن با پێت بڵێم، حەقیقەت لە دەرەوەی ئێمەدا بوونی نییە. حەقیقەت تەنها لە هۆشی بنیادەمدا بوونی هەیە و تەواو. ئەوەش لە هۆشی تاکە کەسدا نا کە بۆی هەیە فریو بخوا یا بشێوێ، بەڵکو لە هۆشی حیزبدا کە گشتی و نەمرە بوونی هەیە. ئەوەی حیزب بە ڕاستی بزانێ، ڕاستە. حەقیقەت بە چاوی حیزب نەبێ نابیندرێ. ئا ئەو ڕاستییەیە کە دەبێ تۆ سەر لە نوێوە فێری بیت. وینستۆن! ئەوەش پێویستی بە خۆ لەناوبردن و پشووی درێژ هەیە. دەبێ پێشەکی خۆت زەلیل کەی تا عاقڵ بیت".

تاوێ بێدەنگ بوو. دەتگوت چاوەڕێیە وشەکانی لە سەر دڵی وینستۆن بنیشنەوە. پاشان گوتی: "لە بیرتە لە دەفتەری یاداشتەکانتدا نووسیوتە: "ئازادی ئەوەیە کە بتوانی بڵێی دوو و دوو دەکاتە چوار؟".

– بەڵێ لە بیرمە.

ئۆبراین دەستەچەپی هەڵبڕی. پشتی دەستی لە وینستۆن کرد و پەنجە کەڵەی نوشتاندەوە.

– وینستۆن، چەند پەنجەم پێشان داوی؟.

– چوار.

– ئەدی ئەگەر حیزب بڵێ چوار نییە و پێنجە – ئەو کاتە چەندە؟.

– چوار.

وشەکە بە ئازارێکی هەناسەبڕ بڕایەوە. میلەکە گەیشتبوە سەر پەنجاوپێنج. عارەقە هەموو جەستەی گرتەوە. هەوا، ڕێی خۆی بەرەو ناو سییەکانی دەکردەوە و بە زەحمەت بە دەم ناڵەیەکەوە بە نێوان دانە پێکەوە نوساوەکانیدا دەهاتەوە دەرێ. ئۆبراین تەماشای دەکرد و چوار پەنجەی بە دیار سەریەوە ڕاگرتبوو. کەمێ میلەکەی بەرەو دواوە گێڕایەوە، کەمێ ئازاری کەمی کرد.

– وینستۆن! چەند پەنجەن؟.

– چوار.

– میلەکە بەرەو شێست هەڵکشا.

– وینستۆن! چەند پەنجەن؟.

– چوار! چوار! دەتەوێ بڵێم چەند؟. چوار!.

دەبێ میلەکە دیسان هەڵکشابێ، بەڵام وینستۆن نەیدی. ڕوخسارە گرژەکە و چوار پەنجەکە، وەک شێلمانی گەورە، وەک پەڵەی گەورە، بەرچاویان تەنی بوو و دەلەرانەوە. بەڵام گومانی نەدەویست کە چوار پەنجە بوون.

– وینستۆن! چەند پەنجەن؟.

– چوار! بەسە، بەس!. بۆ هێندەم ئازار دەدەی؟. چوار! چوار!.

– وینستۆن! چەند پەنجەن؟.

– پێنج، پێنج، پێنج!.

– نا وینستۆن نا، وا نابێ. درۆ دەکەی. هەر بیر لە چوار دەکەیتەوە. بێ زەحمەت ئەمانە چەند پەنجەن؟.

– چوار! پێنج! چوار!. چەندت دەوێ ئەوەندەن. بەس واز بێنە و ئازارم مەدە.

کاتێ بە خۆی زانی، هەردوو شانی لە نێوان بازووی ئۆبرایندا بوون. ڕەنگە ماوەی چەند چرکەیەک بوورابێتەوە. قایشەکانی کرابوونەوە. هەستی بە سەرمایەکی بێ ڕەزا دەکرد، هەڵدەلەرزی و چۆقەی ددانی دەهات و فرمێسکی لە چاو دەباری. وەک منداڵ خۆی بە ئۆبراینەوە نووساندبوو. بازووی قورسی سەر شانی، بە شێوەیەکی سەیر، هەستی ئارامییان پێ دەبەخشی. هەستی دەکرد ئۆبراین پشت و پەنایەتی و ئەو ئازارە، لە دەرەوەڕا، لە سەرچاوەیەکی ترەوە سەریان هەڵداوە و ئۆبراین لێیانی دەرباز دەکا.

ئۆبراین، لە سەرخۆ گوتی: "وینستۆن! زەحمەتە فێر بیت".



وینستۆن بە نقەنق گوتی: "چۆن فێر دەبم؟. چۆن دەتوانم شتێکی بەر چاوم بە جۆرێکی دی ببینم؟. دوو و دوو دەکاتە چوار".

– هێندێ جار. هێندێ جاریش دەکاتە پێنج. جاری واش هەیە دەکاتە شەش. جاروبارێ، بە یەک جار، دەکاتە هەموو ئەو ژمارانە. دەبێ هەوڵی پتر بدەی. عاقڵبوون هاسان نییە.

وینستۆنی لە سەر تەختەکە درێژ کرد. قایشەکانی توند کردنەوە، بەڵام ئازار و لەرزی نەمابوون. ئەوەی مابۆوە، بێ تاقەتی و سەرما بوو. ئۆبراین، بە سەری دیاردییەکی بۆ پیاوە بەرگ سپیەکە کرد کە لە هەموو ئەو ماوەیەدا، بە بێدەنگی لەولاوە ڕاوێستابوو. پیاوە بەرگ سپییەکە چەمایەوە و لە چاوی وینستۆن ڕاما، لێدانی دڵی پێوا، گوێی نایە سینگیەوە، پەنجەی بەملاولای جەستەیدا هێنا. ئەوجا سەری ڕەزامەندی ڕاوەشاند.

ئۆبراین گوتی: "سەرلەنوێوە" .

ئازار بە جەستەی وینستۆندا گەڕا. بێ گومان دەبێ میلەکە لە سەر حەفتا – حەفتاو پێنج بووبێ. ئەم جارە چاوی بەستڕابوونەوە، بەڵام دەیزانی قامکەکان بە دیار سەریەوە ڕاگیراون و هەر چوار دانەن. ئەوەی گرینگ بوو، تا ئەوسەری ئازار، بە زیندویی بمێنێ. ئیدی پێی گرینگ نەبوو هاوار دەکا یا بێدەنگە.

ئازاری کەم بووەوە. چاوی کرایەوە. ئۆبراین میلەکەی گێڕابۆوە دواوە.

– وینستۆن! چەند پەنجەن؟.

– چوار. وا بزانم چوارن. بمتوانیبا پێنجم دەدی. هەوڵ دەدەم پێنج ببینم.

– حەز لە کامەیان دەکەی: خەڵەتاندنی من بەوەی کە گوایە پێنج دەبینی یا بە ڕاستیی پێنج ببینیت؟.

– حەز دەکەم بە ڕاستی پێنج ببینم .

ئۆبراین گوتی: "سەرلەنوێوە" .

ڕەنگە میلەکە گەیشتبێتە هەشتا یا نەوەد. وینستۆن هەر هێندەی پێ مابوو کە جاروبارێ هۆی ئازارەکە بزانێ. بەرانبەر پێڵۆی داخراوی چاوی، دارستانێکی پەنجە بوو و بە جۆرە سەمایەکەوە دەهات و دەچوو، و پەنجەکان لە پەنای یەکدا بزر دەبوون و دەردەکەوتنەوە. هەوڵی دەدا بیانژمێرێ. دەیزانی ژماردنیان مەحاڵە، چونکە چوار و پێنجی لێک جودا نەدەکردەوە. دیسان ئازارەکە کەم بووەوە. کە چاوی کردەوە، بۆ ئەوەی

کردەوە تا بزانێ ئاخۆ هەمان شت دەبینێ. پەنجەی لە ژمارەنەهاتوو، وەک داری دەم با بە لێشاو بەملا و بەولادا ڕەت دەبوون و لە پەنای یەکدا بزر دەبوون. چاوی داخستنەوە.

– وینستۆن! چەند پەنجەت پیشان دەدەم؟.

– نازانم. نازانم. ئەگەر جارێکی تر وام لێ بکەیتەوە دەمکوژی. چوار، پێنج، شەش – نازانم، بە شەرەفم نازانم.

– باشترە.

دەرزییەک چوو بە باسکی وینستۆندا. لە هەمان چاوتروکاندا، گەرماییەک بە هەموو لەشیدا بڵاو بووەوە. نیوەی ئازارەکەی برا. چاوی هەڵبڕی و بە پێزانینەوە ڕوانییە ئۆبراین. بەرانبەر دیمەنی ئەو ڕوخسارە بەتین و خەتخەتە کە هەم ناشرین بوو هەم وریا، دەتگوت دڵی لە جێی خۆی هەڵدەکەندرێ. ئەگەر توانای بزاوتنی هەبوایە، دەستی درێژ دەکرد و دەیخستە سەر بازووی ئۆبراین. تا ئەو دەمە، لە دڵەوە خۆشی نەویستبوو. ئەوەشی هەر لە بەر ئەوە نەبوو کە کۆتایی بە ئازارەکانی هێنا. هەستەکەی جارانی هەبوو. واتە، گرینگ نەبوو ئاخۆ ئۆبراین دۆستە یا دوژمن. ئۆبراین کەسێ بوو قسەی لەگەڵدا دەکرا. ڕەنگە پیاو هێندەی حەز دەکا بناسرێ حەز نەکا خۆشبویسترێ. ئۆبراین تا سنووری شێتکردن ئازاری دابوو و بێ گومان ماوەیەکی دی بەردەوام بوایە دەیکوشت. جیاوازی نەبوو. بە شێوەیەک مەسەلەکە لە دۆستایەتی قووڵتر بوو. هەرچەندە هەرگیز باسیان نەکردبوو، بەڵام شتێ هەبوو لە سەری پێک بێن و پێکەوە لێی بدوێن. ئۆبراین بە جۆرێ سەیری کرد وەک ئەوەی هەمان بیرکردنەوەی لە مێشکدا بێ. کە هاتە گۆ، شێوەی ئاخاوتنی ئارام و گفتوگۆئامێز بوو.

– وینستۆن، دەزانی لە کوێی؟.

– نازانم. بەڵام بە مەزەندەی عەقڵم، لە وەزارەتی ئەوینم.

– دەزانی ماوەی چەندە لێرەی؟.

– نازانم.چەند ڕۆژ، چەند حەفتەیە، چەند مانگێک... وابزانم چەند مانگێکە.

– دەزانی بۆ خەڵکی دەهێننە ئێرە؟.

– بۆ ئەوەی ناچاریان بکەن دان بە تاوانی خۆیاندا بنێن.

– نا، لە بەر ئەوە نییە. بیری لێ بکەوە.

– تا سزایان بدەن.



ئۆبراین گوتی: "نەء!". دەنگی بە تەواوی گۆڕا و کتوپڕ ژیان زایە سیمای و گوتی: "نەء! بە هیچ جۆرێ دەرکێشانی نهێنی یا سزادان نییە!. پێت بڵێم لەبەرچی بۆ ئێرەمان هێناوی؟. تا شفات بدەین!. تا عاقڵت کەین!. وینستۆن، دەزانی کەس لێرە ناچێتە دەرێ ئەگەر شفای نەیات؟. کارمان بە تاوانی کەرانەتەوە نییە کە دووچاری بووی. حیزب کاری بە ڕەفتاری ئاشکراوە نییە. تەنها... تەنها گرینگی بە خەیاڵ دەدەین. خۆ مەبەستم تێگەیشتیت؟.

بە سەر وینستۆندا داچەمیبوو. سیمای، لە بەر نزیکی لە وینستۆنەوە، زەبەلاح دیار بوو و لە بەر ئەوەی لە خوارەوەڕا تەماشای دەکرد بێ ڕەزا ناشرین بوو. بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا، گەورەیی و شارەزایی لێ دەباری. دیسان دڵی وینستۆن ڕاچەنی. ئەگەر پێی بکرابا، زیاتر خۆی لە ناو تەختەکە نقوم دەکرد. دڵنیا بوو کە ئۆبراین، هەر بە کەیف، دیسان دوگمەکە با دەدا. لەو ساتەدا، ئۆبراین وەرچەرخایەوە و یەک دوو هەنگاو ئەمسەر و ئەو سەری کرد. بە قینێکی کەمترەوە، لە سەر قسەی خۆی ڕۆیشت:

– یەکەم شت کە دەبێ بیزانیت ئەوەیە باسی شەهیدبوون لێرە، لە ئارادا نییە. دەربارەی کوشتن و بڕینی زەمانی زوو، لە سەر ئاین، زۆرت خوێندۆتەوە. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دەزگای لێکۆڵینەوەی سەر بە کڵێسای کاتۆلیک هەبوو. سەرکەوتوو نەبوو. بۆ ئەوە دامەزرا تا لادان لە ڕیشەدا دەربهێنێ بەڵام بە مردنیان کۆتایی هات، چونکە لە جێی هەر لادەرێ کە دەسووتێندرا هەزارانی دی ڕاست دەبوونەوە. بۆ وا بوو؟. ئا، چونکە دەزگای لێکۆڵینەوە دوژمنی خۆی بە ئاشکرا دەکوشتن. دەیکوشتن بێ ئەوەی تۆبەیان پێ بکا. لە ڕاستیدا، دەیکوشتن چونکە تۆبەیان نەدەکرد. خەڵک دەمردن و دەسبەرداری باوەڕی خۆیان نەدەبوون. سەروەری بۆ قوربانییەکان دەمایەوە و شەرمەزاریش بۆ دەزگای لێکۆڵینەوە کە دەیانسووتاندن. دوایی،لە سەدەی بیستەمدا، تۆتالیتێر پەیدا بوو. سەروسەکوتی نازی و کۆمۆنیست دەرکەوت. ڕووسەکان، لە لێکۆڵەرەوە کۆنەکان بێ بەزەییانەتر چەقۆیان لێ تیژ کرد. وایان دەزانی دەرسیان لە هەڵەی ڕابردوو وەرگرتووە. بە هەر حاڵ، پێیان وابو کە نابێ ناوی شەهید بە کوژراوەکانی دەستیان بدرێ. بەر لەوەی قوربانییەکانی دەستی خۆیان بدەنە دادگای ئاشکرا، دەبوو حورمەت و کەسایەتییان بشکێنن. ئەوەندە لە ژێر ئەشکەنجە و تەنهاییدا دەیانهێشتنەوە، وایان لێ دەهات سووکی و نابووتییان لێ دەباری وهەر کە زاریان دەکردەوە دانیان بە تاواندا دەنا، یەکتریان تاوانبار دەکرد و خۆیان لە پەنای یەکدا مات دەدا و دەپاڕانەوە. لە گەڵ هەموو ئەوانەشدا، چەند ساڵێ لەمەوبەر

هەمان مەسەلە ڕووی دایەوە. مردووەکان چوونە ڕیزی شەهیدانەوە و سووکایەتییەکانیان لە بیر کران. جارێکی دی، بۆ وای لێ هات؟. چونکە بە ئەشکەنجەی ئاشکرا نهێنییان دەدرکاند و گوتەکانیان ناواقیعیی بوون. هەڵەی وا لە ئێمە ناوەشێتەوە. هەموو دانپێدانانێک کە لێرە بە سەر زاردا دێ، واقعییە، دەیکەین بە واقعیی. لە هەمووی گرینگتر ئەوەیە کە لێناگەڕێین خەڵکمان لێ بوروژێ. وینستۆن! دەبێ دەست لەوە بشۆی کە نەوەی داهاتوو پەی بە بێ تاوانیت ببا. هەواڵت ناگاتە نەوەی داهاتوو. لە ڕەوتی مێژوو لادەبرێی. دەتکەین بە هەوا و هەواڵەی حەوات دەکەین. هیچت لێ نامێنێتەوە: نە ناوت لە دەفتەردا دەمێنێ نە یادت لە مێشکی کەسدا. لە تەختەی ڕابردوو دەسڕدرێیتەوە. لە سەر تەختەی داهاتووش. تۆ هەرگیز لە بووندا نەبوویی.

وینستۆن بە پەژارەوە بیری دەکردەوە: " ئەدی بۆ ئەشکەنجەم دەدەن؟ ".

ئۆبراین هەنگاوەکانی خاو کردنەوە. دەتگوت وینستۆن بیرکردنەوەکەی بە زاریدا هێناوە. ڕوخساری گەورە و ناشرینی ئۆبراین، بە چاوی کەمێ بچووکەوە، لێی نزیکتر کەوتەوە. گوتی: " ئێستا بیر لەوە دەکەیتەوە کە مادام بەتەواوی و گردەبڕ نیازی لە ناوبردنتمان هەیە، ئیدی کوا گرینگە چی دەڵێی یا چی دەکەیت؟ بۆ سەری خۆمان بە لێکۆڵینەوە، لەگەڵتدا دەهێشێنین؟. وات بیر دەکردەوە، وا نییە؟.

– بەڵێ وایە.

بزەیەک کەوتە سەر لێوی ئۆبراین و گوتی: – وینستۆن تۆ بابەتێکی خراپیت. لەکەیەکی و دەبێ لابرێی. چما پێتم نەگوتیت ئێمە لە گەڵ ئەشکەنجەدەرانی ڕابردوودا جیاوازیمان هەیە؟. بەگوێکردنی کوێرانە وتەسلیم بوونی سەرشۆڕانە ڕازیمان ناکەن. کە خۆت بە دەستەوە دەدەی، دەبێ بە حوسن و ڕەزای خۆت بێ. ئێمە، لادەر لەبەر ئەوە ناکوژین کە بەرانبەرمان لێ دەگرێ و ململانێ دەکا. مادام ململانێ دەکا نایکوژین. کاتێ دەیکوژین، دەسەڵات بە سەر ناخ و بیرکرنەوەیدا بگرین، سەرلەنوێوە دایدەڕێژینەوە. هەموو شەڕ و خەیاڵێکی تێدا دەسووتێنین. بەرەو لای خۆمان ڕایدەکێشین. بە ڕواڵەت نا، بەڵکو وای لێ دەکەین بە دڵ و بە گیان لایەنگرمان بێ. ناتوانین ڕێی لادان بە خەیاڵی، تەنانەت سەرەمەرگیش بدەین. لە سەردەمە کۆنەکاندا، کاتێ لادەر بەرەو مردن دەبرا، هەر بە لادەری دەمایەوە و شانازی و سەربەرزی خۆشی ئاشکرا دەکرد. قوربانییەکی پاکسازییەکانی ڕووسیا کە بەرانبەر جەللادەکان ڕادەوەستا، دەیتوانی بۆچوونی یاخیگەرێتی خۆی کە لە



ناو مێشکیدا هەڵیگرتبوو، بڵاو بکاتەوە. بەڵام ئێمە، بەر لەوەی ئەو مێشکە بە فیشەکێ بسمین، ڕاستی دەکەینەوە. فەرمانی دیکتاتۆرە کۆنەکان (وابە!) بوو و فەرمانی تۆتالیتێرەکان (وامەبە!) بوو و فەرمانی ئێمەش(تۆ ئەوەی)[٢٢] یە. هیچ کەسێ لەوانەی کە دەهێندرێنە ئێرە، بەرانبەرمان ناوێستێ. لێرە هەموو کەسێ پاک دەشۆردرێ. تەنانەت ئەو سێ خائینەی کە ماوەیەک پێت وا بوو بێ تاوانن، جۆنز و هارسۆن و ڕۆتەرفۆرت دەڵێم، ئاخرێکەی هاتنە سەر چۆک. لە لێکۆڵینەوەی ئەوانیشدا بەشدار بووم. وردە وردە داڕمانیان – ناڵەناڵ و هەڵپلکان و گریانیانم دی. لە ئەنجامدا، ناڵە و پلکانەوە و گریانیان لە ترسەوە نەبوو بەڵکو بە هۆی پەشیمانییەوە بوو. کاتێ لە گەڵیاندا لێ بووینەوە، پێستی بنیادەم نەبێ هیچیان لێ نەمابوو. پەشیمانی و عەشقی ڕێبەری گەورە نەبێ هیچیان لە هۆشدا نەبوو. خۆشەویستییان بۆ ڕێبەری گەورە، کاری لە مرۆ دەکرد. دەپاڕانەوە تا تیرباران بکرێن و بە هۆشی خاوێنەوە بمرن .

دەتگوت دەنگی ئۆبراین لە خەوندا دەبیسێ. گەورەیی و دانایی هەر پێوە دیار بوو. وینستۆن لە دڵی خۆیدا گوتی: "بە ڕاستی دوو ڕوو و ڕیاکار نییە. باوەڕی بە هەر وشەیەک هەیە کە دەیڵێ". سەرنجی ئەو قەڵافەتە سەنگین و فریودەرەی دەدا کە دەهات و دەچوو. جاروبارێ دەکەوتە بەر گۆشە نیگایەوە و جاروباریش ون دەبوو. ئۆبراین زەلامێک بوو، لە هەموو شتێکدا لەم گەورەتر بوو. بیرکردنەوەیەک نەبوو بە هۆشی وینستۆندا هاتبێ، ئەو پەی پێ نەبردبێ و زوو لێکی نەدابێتەوە و بەرپەرچی نەدابێتەوە. هۆشی ئۆبراین، هۆشی وینستۆنی گرتبووە خۆی. کەوابێ چۆن دەکرێ ئۆبراین بە شێت بزانێ؟. دەبێ خودی خۆی، وینستۆن شێت بێ. ئۆبراین بە دیاریەوە وێستابوو و سەرنجی دەدا. دیسان دەنگی گڕ بووەوە: – وینستۆن، پێت وا نەبێ بە خۆبەدەستەوەدان تەواو ڕزگارت دەبێ. هەر کەسێ یەک جار دووچاری گومڕایی بێ، ڕزگاری نابێ. تەنانەت ئەگەر ویستیشمان لێت گەڕێین بە زیندویی بمێنی، هەرگیز لە چنگی ئێمە دەرباز نابیت. ئەوەی کە ئێستا بە سەرت دێ هەمیشەییە. پێشەکی ئەوەت لە یاد بێ. هێندەت تێهەڵدەدەین، یەک تۆزقاڵ ورەت تێدا نامێنێ. دەردێکت دەدەینێ ئەگەر هەزار ساڵی تریش بژیت لە بیرت ناچێتەوە. ئیدی هەرگیز هەستی مرۆڤی ئاساییت تێدا نابێ. هەموو شتێ لە ناختدا دەمرێ. هەرگیز جارێکی دی جێی خۆشەویستی و دۆستایەتی و تامی ژیان و بزە و ئارەزووی زانین و غیرەت و شەرەف، لە تۆدا نابێ. بۆش دەبیت. بەتاڵت دەکەین و بە

٢٢– ئەو سێ فەرمانە: 1-Thou art, Thou Shalt not, Thou Shalt

خۆمـان پڕت دەکەینەوە. کەمێ بێدەنگ بوو. دیاردییەکی بۆ پیاوە بەرگ سپیەکە کرد. وینستۆن هەستی کرد دەزگایەکی قورس، لە پشت سەریەوە هێندرایە ژووری. ئۆبراین، بە جۆرێ لە قەراغ تەختەکە دانیشتبوو، ڕوخساری لە گەڵ ڕوخساری وینستۆندا تەرازوو بوو. بە دیار وینستۆنەوە تەماشایەکی بەرگ سپیەکەی کردو گوتی:"دووهەزار". دوو بالیفچەی گچکەی نماک و نەرمیان بە هەردوو لاجانیەوە قایم کرد. وینستۆن هەڵلەرزی. ئازاری پێ گەیشت، بەڵام جۆرە ئازارێکی تر. ئۆبراین دەستی بەزەیی خستە سەر دەستی و گوتی:- ئەم جارە ئازارت نابێ. چاو ببڕە چاوم.

لەو ساتەدا، تەقینەوەیەک یا شتێکی تۆقێنەری لە بابەتی تەقینەوە پەیدا بوو، هەرچەندە مەعلووم نەبوو دەنگ بیسترابێ. بەڵام گومانی نەدەویست کە بلاچەیەکی چاوکوێرکەر لەبەرچاوی هەستا. وینستۆن، ئازاری نەگەیشتێ بەڵام دارما. هەرچەندە لە جێیەکەی خۆی لە سەر پشت ڕاکشابوو کەچی بە توندی، بە بێ ئازار ڕما. شتێ لەو ناو کەللەسەریدا قەوما. کە توانای بیرکردنەوەی هاتەوە بەر، بیری کەوتەوە کە کێیە و لە کوێیە و ئەو سەروچاوەشی ناسییەوە کە لێی ڕامابوو. لایەکی مۆخە سەری بۆش بوو، دەتگوت کەرتێکی گەورەی لێ کراوەتەوە. ئۆبراین گوتی: "زۆر ناخایەنێ. سەیری چاوم کە. ئۆقیانووسیا لە گەڵ کێدا لە شەڕدایە؟."

وینستۆن بیری کردەوە. دەیزانی مەبەست لە ئۆقیانووسیا چییە و دەیزانی خۆی خەڵکی ئەوێیە. ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ئەوروئاسیاشی بیر کەوتنەوە بەڵام نەیدەزانی لە گەڵ کامیاندا لە شەڕدان.لە ڕاستیدا نەیدەزانی شەڕ هەیە یا نا.

- لە بیرم نییە.

- ئۆقیانووسیا لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا شەڕێتی. بیرت کەوتەوە؟.

- بەڵێ.

- هەموو دەمێ ئۆقیانووسیا لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا شەڕی بووە. لەوەتەی تۆ هەی، لەوەتەی مێژوو هەیە، شەڕ و هەمان شەڕ، بێ پشوو دەگەڕێ. ئەمەت لە بیرە؟.

- بەڵێ .

- بەر لە یانزە ساڵ، لە بارەی سێ خیانەتکارەوە، کە بڕیاری مەرگیان بە سەردا درابوو ئەفسانەیەکت ساز کردبوو. پێت وابوو کەرتە ڕۆژنامەیەکت دیوە و بێتاوانیی ئەوان دەسەلمێنێ. شتی وا هەرگیز نەبووە. ئەوەت لە خۆڕا دروست کردووە و دوایی باوەڕیشت



پێ هێناوە. ئێستا ئەو دەمەت لە بیرە کە ئەو ئەفسانەیەت ساز کرد؟. لە بیرتە؟.

- بەڵێ.

- پەنجەکانم بۆ ڕاگرتویی. پێنج پەنجە دەبینی. لە بیرت دەبێ؟.

- بەڵێ.

ئۆبراین دەستە چەپی هەڵبڕی و پەنجەکەڵەی چەماندەوە.

- ئەمانە پێنج پەنجەن. پێنج پەنجە دەبینی؟.

- بەڵێ.

بینی. لە ماوەی ساتێکی کورتدا، بەر لەوەی پێوانەی هۆشی بگۆڕێ دیتی. پێنج پەنجەی دی بێ ئەوەی هیچ نوقوستانییەک لە دەستەکەدا هەبێ. پاشان هەموو شتێ گەڕایەوە دۆخی جاران، و ترس و ڕق و پەژارەی دێرین، سەر لە نوێ پەیدا بوونەوە. ئەو دەمەی پێشنیارەکانی ئۆبراین کەرتە بەتاڵەکەی مۆخیان پڕ دەکردەوە و حەقیقەت گردەبڕ بوو و دوو و دوو، چەند بە هاسانی دەیکردە پێنج، هەر بەو هاسانییەش دەیکردە سێ، ساتێکی دڵنیایی ڕووناک پەیدا ببوو - نەیدەزانی چەندی خایاند، ڕەنگە سیی چرکە، و بەر لەوەی دەستی ئۆبراین لاکەوێ، لە ناوچوو. هەرچەندە پێی نەدەکرا ئەو ساتە بگێڕێتەوە بەڵام لە بیری مابوو، وەک چۆن بنیادەم تاقیکردنەوەی کاریگەری زەمانێکی زووی ژیانی خۆی، هی ئەو دەمەی کە بنیادەمێکی دی بووە، بیر دەکەوێتەوە ئاوها بیری مابوو.

ئۆبراین گوتی: بە هەر حاڵ ئێستا دەزانیت کە دەکرێ.

وینستۆن گوتی: بەڵێ.

ئۆبراین بە دڵخۆشییەوە هەستا. وینستۆن، پیاوە بەرگ سپییەکەی بە لای دەستە چەپی خۆیەوە دی کە شووشە دەرمانێکی شکاند و بە دەرزی شرینقە هەڵیمژییە ناو سرنجێ. ئۆبراین بە بزەوە لە وینستۆن ڕامابوو. وەک پیشەی پێشای چاویلکەکەی لە سەر لووتی ڕێک خست. گوتی: "بیرت دێ لە دەفتەری بیرەوەرییەکانتدا نووسیبووت کە گرینگ نییە دۆستت بم یا دوژمن، چونکە هەرچی بم، درک بە بوونت دەکەم و قسەم لەگەڵدا دەکرێ؟. ڕاستت گوتووە. ئاخاوتنم لە گەڵ تۆدا پێ خۆش دێ. هۆشت لەگەڵ هۆشمدا ڕێک دەکەوێ. بە هۆشی من دەچێ هێندە نەبێ کە دووچاری شێتیی هاتووە. بەر لەوەی دانیشتنەکەمان تەواو بێ، بۆت هەیە پرسیار بکەی .

– هەر پرسیاریٚ؟.

ئۆبراین گوتی: "هەر پرسیاریٚ" و کە دیتی وینستۆن چاوی لە تەختە میتاڵەکە بڕیوە، گوتی: " کوژاوەتەوە. یەکەم پرسیارت چییە؟ ".

– چت بە سەر جولیادا هێنا؟.

ئۆبراین دیسان بزەیەکی کرد و گوتی: "وینستۆن! دەسخەڕۆی کردی. یەکسەر و بێ ئەملا و ئەولا. کەم کەسم دیوە وا بە خێرایی بێتە ڕیزمانەوە. ئەگەر بیبینی زەحمەتە بیناسیتەوە. هەموو ئارەزوویەکی یاخیگەرێتی و فرتوفێڵ و بێ عەقڵی و خەیاڵێکی پێشامان تێدا سووتاند. گەڕانەوەیەکی ڕێکوپێک بوو و شیاوی ئەوەیە بکرێ بە بابەتێکی ناو کتێبی فێرکردن".

– ئازارتان دا؟.

ئۆبراین وەڵامی نەدایەوە. گوتی:"پرسیاری دی" .

– ڕێبەری گەورە بوونی هەیە؟.

– دیارە هەیەتی. حیزب هەیە و ڕێبەری گەورە سیمبۆلێتی.

– وەک من هەم ئەویش وا هەیە؟.

– تۆ نیت.

هەستی زەلیلی وینستۆنی داگرت. ئاگای لەو باسانە هەبوو کە نەبونی ئەویان دەسەلماند، یا دەیتوانی بیریان لێ بکاتەوە. بەڵام ئەو باسانە گرینگ نەبوون، تەنها دەسکاریکردنی وشە بوون. ئایا گوتەی "تۆ نیت" لۆژیکی ماقوڵی تێدایە؟.. ئەدی گوتنی شتی وا سوودی چییە؟. بە هۆی خەیاڵ و بیرکردنەوە لەو باسە شێتانە و بێ وەڵامانەی کە ئۆبراین ئەمی پێیان ڕوخاند، مۆخی ماندوو بوو. بە بێزارییەوە گوتی: "لەو باوەڕەدام من بوونم هەبێ. ئاگاداری پێناسەی خۆمم. هاتوومەتە دنیاوە و لە دنیاش دەڕۆم. دەست و پێم هەن. بۆشاییەک پڕ دەکەمەوە، هیچ شتێکی دی ناتوانی لە هەمان کاتدا هەمان بۆشایی پڕ کاتەوە. ئایە ڕێبەری گەورە بەو چەشنە بوونی هەیە؟".

– گرینگ نییە. ئەو بوونی هەیە.

– ڕێبەری گەورە دەمرێ؟.

– دیارە کە نەء . پرسیاری دی .



– ڕێکخراوی برایەتی بوونی هەیە؟.

– وینستۆن! هیچ کاتێک ڕێت نییە ئەوە بزانیت. دوای ئەوەی لەگەڵتدا لێ دەبینەوە، ئەگەر بمانەوێ بەرەڵات کەین و نەوەد ساڵیش بژیی، هەرگیز نازانی وەڵامی ئەو پرسیارە (ئا)یە یا (نا)یە. تا ماوی ئەو وەڵامەت وەک مەتەڵێکی هەڵنەهێندراو بۆ دەمێنێ.

وینستۆن بێدەنگ بوو. هەناسەی لە جاران خێراتر دەهات و دەچوو. هێشتا ئەو پرسیارەی نەکردبوو کە لە سەرەتاوە بیری لێ کردبۆوە. ناچار بوو بیکا بەڵام دەتگوت زمانی نایەوێ بیڵێ. ئۆبراین سەرگەرم دیار بوو. دەتگوت چاویلکەکەشی تیشکی گەمەپێکردن دەداتەوە. لە پڕێکدا وینستۆن بە بیریدا هات: "خۆ دەیزانێ... دەزانێ دەمەوێ چی بپرسم!". بەدەم ئەو بیرەوە زمانی گەڕا: "لە ژووری ١٠١دا چی هەیە؟".

ئۆبراین خۆی تێک نەدا. بە ڕەقی وەڵامی دایەوە: "دەزانی ژووری ١٠١ چی لێیە. هەموو کەس ئەوە دەزانێ". پەنجەی بەرەو پیاوە سپیپۆشەکە بەرز کردەوە. پێ دەچوو دانیشتنەکە کۆتایی بێ. دەرزییەک بە باسکی وینستۆندا چەقی. یەکسەر بە گەرووی خەوێکی قووڵدا ڕۆچوو.

## ٣

ئۆبراین گوتی: "بۆ دروستکرنەوە و دارشتنەوەت سێ پلە هەیە: فێرکردن، تێگەیشتن، قایلبوون. ئێستا کاتی ئەوەت هاتووە بچیتە پلەی دووەم."

وینستۆن وەک هەمیشە، یەکتەختە لە سەر پشت ڕاکشابوو. بەڵام بەو دواییە قایشەکانی شلتر دەبەستران. قایشەکان هەر بە تەختەکەوەیان بەستابوو بەڵام کەمێ چۆکی پێ دەبزوا و دەیتوانی کەمێ سەری بەملاولادا وەرچەخێنێ و باسکی، لە ئانیشکی بەرەخوار هەڵبرێ. میتاڵە میلدارەکە وەک بەرێ ترسناک بوو. ئەگەر خێرایی بیرکردنەوەی بە خەرج بدابا، دەیتوانی خۆی لە ئازار ببوێرێ. هەر کاتێ خۆی گێل پێشان بدابا ئۆبراین میلەکەی بەرز دەکردەوە. جاری وا هەبوو دانیشتنەکەشیان کۆتایی دەهات بێ ئەوەی میتاڵەکە بەکار بهێنێندرێ. ژمارەی دانیشێنەکانی نەدەزانی. پێ دەچوو ڕەوەندی گشتیی کارەکان، هێڵێکی درێژی بێ کۆتایی بێ – چەندین هەفتەی خایاندبوو و مەودای نێوان دانیشتنەکانیش هێندێ جار چەند ڕۆژێ بوو و هێندێ جاریش یەک دوو سەعات .

ئۆبراین گوتی: لەو جێیەی کە درێژ بویی، گەلێ جار پرسیارت لە خۆت کردووە – تەنانەت لە منیشت کردووە – کە دەبێ بۆ وەزارەتی ئەوین ئەو هەموو کات و ناڕەحەتییە بە خەرج بدا. کە ئازادیش بووی بە دوای هەمان پرسیاردا وێڵ بوویت. دەتوانی سەر لە چەند و چۆنیی ئەو کۆمەڵگەیە دەرکەیت کە تێیدا دەژیای، بەڵام شێوەی پێکهاتنیت نەدەزانی. لە بیرتە لە دەفتەرەکەتدا نووسیبووت: "دەزانم چۆن بەڵام نازانم بۆ"؟. ڕێک ئەو دەمەی کە بیرت لە (بۆ) دەکردەوە، گومانت لە هۆشی خۆت هەبوو. هەموو یا هیچ نەبێ هێندێ لە کتێبەکەی گۆڵدستەینت خوێندۆتەوە. ئایا هیچی تازەی پێ گوتی کە پێشتر نەتزانیبێ؟.

وینستۆن گوتی: چما خوێندووتەوە؟.

ئۆبراین گوتی: من نووسیومە. واتە هاوکاریم لە نووسینیدا کردووە. وەک دەزانی هیچ کتێبێ بەرهەمی یەک قەڵەم نییە.

– ئەوەی کە باسی دەکا ڕاستە؟.

– وەک باسکردن بەڵێ. ئەو بەرنامەیەی کە باسی دەکا پشتگوێ خراوە. کۆکردنەوەی زانیاری بە نهێنی – بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری بە نهێنی – و لە کۆتاییدا یاخیبوونی



کرێکاران – لەناوچوونی حیزب. بەخۆت ئەو پێشبینییانەت کردووە. هەمووی نەفەسبڕ کراوە. کرێکاران هیچ کاتێ یاخی نابن، نە ئێستا و نە هەزار یا ملیۆنێ ساڵی دی. ناتوانن. پێی ناوێ بەڵگەت بۆ بهێنمەوە چونکە بەخۆت دەیزانی. ئەگەر دڵی خۆت بە خەیاڵی ڕاپەڕینی خوێناوی خۆش کردبێ، خراپ حاڵی بووی. هیچ ڕێیەک بۆ لەناوبردنی حیزب لە ئارادا نییە. دەسەڵاتی حیزب هەمیشەییە. ئەمە لە سەر تەختەی خەیاڵی خۆت تۆمار بکە.

ئۆبراین لە تەختەکە نزیک بووەوە. "هەمیشەیی" ی دوپات کردەوە و لە سەر قسەی خۆی ڕۆیشت: "چاکتر وایە بێینەوە سەر پرسیاری (چۆن) و (بۆ). باشە خۆ دەزانیت حیزب (چۆن) دەسەڵاتی خۆی دەپارێزێ. ئێستا پێم بڵێ (بۆ) بە دەسەڵاتەوە چەسپاوین و مەبەستمان چییە؟. بۆ دەسەڵاتمان دەوێ؟". لە بەر ئەوەی وینستۆن بێدەنگ بوو، دەستی پێ کردەوە: "یاڵڵا قسە بکە".

وینستۆن تاوێکی دی بێدەنگ بوو. بێزاریی، هەموو گیانی گرتبۆوە. کەمێ ڕووناکایی گەڕابۆوە سەر ڕوخساری ئۆبراین. وینستۆن، پێی وا بوو دەیزانی ئۆبراین دەیەوێ چی بڵێ. دەڵێ گوایە حیزب لە پێناوی خۆیدا دەسەڵاتی ناوێ بەڵکو لە پێناوی بەرژەوەندی زۆربەی خەڵکیدا دەیەوێ. دەسەڵاتی دەوێ چونکە جەماوەری بەربەرین لاواز و ترسنۆکن و ناتوانن ڕووبەڕووی ڕاستی ببنەوە. دەبێ خەڵکی لە خۆیان بەهێزتر دەسەڵاتیان هەبێ و بەڕێوەیان بەرن. مرۆ لە نێوان ئازادی و بەختەوەریدا سەرپشکە و بەختەوەریش بۆ ژمارەیەکی زۆری بنیادەم گرینگترە. حیزب پارێزەری هەمیشەیی بێ توانایانە. کۆمەڵێ، خراپەکاری بۆ ئەوە دەکەن تا چاکە بەرپا بێ و بەختەوەریی خۆیان دەکەنە قوربانی بۆ بەختەوەری خەڵکی دی. وینستۆن بیری لەوە دەکردەوە کە کارەسات لەوەدایە ئۆبراین باوەڕی بەوە هەیە کە دەیڵێ. سیمای، ئەوەی دەردەخست. ئۆبراین هەموو شتێکی دەزانی. هەزار بار لە وینستۆنی چاکتر دەزانی دنیا چۆنە و جەماوەری خەڵک لە چ ناهەمواریییەکدا دەژین و حیزب بە چ درۆ و دەلەسەیەک لەو بارەیاندا دەهێڵێتەوە. ئەمانە دەزانێ و سووک گران دەکا و جیاوازی ناکا. وینستۆن بیری کردەوە: چت لەگەڵ شێتێکدا پێ دەکرێ کە لە خۆت وشیارترە و چاک گوێ بۆ بەڵگەت دەدێرێ و پاشان دەگەڕێتەوە دۆخی خۆی؟. بە کزییەوە گوتی: "لە پێناوی خێروبێری ئێمەدا حوکمڕانیمان دەکەن. پێتان وایە خەڵکی توانای ئەوەیان نییە خۆیان بەڕێوە بەرن بۆیە... "

ڕاچەنی و هێندەی نەما هاوار بکا. کزەئازارێک بە جەستەیدا گەڕا. ئۆبراین، میلەکەی گەیاندبووە سی و پێنج .

ئۆبراین گوتی: "وینستۆن! قسەیەکی قۆڕت کرد. دەبێ لەوە زیاتر بی قسەی وا بکەی". میلەکەی گێڕایەوە دواوە و لە سەر قسەی خۆی ڕۆیشت:

– ئێستاوەڵامی پرسیارەکەت بۆ دەدەمەوە. ئەوەش ئەمەیە: حیزب تەنها لە پێناوی خۆیدا دەسەڵاتی دەوێ. هەقمان بە سەر خێر و بێری خەڵکەوە نییە. مەبەستمان تەنها دەسەڵات و دەسەڵاتی پەتییە. دەسەڵاتی پەتی چییە؟. ئێستا پێت دەڵێم. جوداوازی ئێمە لەگەڵ ڕژێمە هەمەچینەکانی کۆندا ئەوەیە ئێمە دەزانین چی دەکەین. هەموو ئەوانە، تەنانەت ئەوانەش کە لە ئێمە دەچوون، ترسنۆک و ڕیاکار بون. نازیەکانی ئەڵمانیا و کۆمۆنیستەکانی ڕووسیا بۆچوونیان لە ئێمەوە نزیک بوو بەڵام هەرگیز نەیانوێراوە بە ئاشکرا مەبەستی خۆیان بڵێن. ئەوانە ڕایاندەگەیاند، یا تەنانەت باوەڕیشیان وابوو کە ئارەزووی دەسەڵاتیان نییە و هەر بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە دەستیانەوە دەبێ تا بەهەشتی نزیک بەرپا دەبێ و مرۆڤی تێدا یەکسان و ئازاد دەبن. ئێمە وا نین. ئێمە دەزانین کە کەس بۆ ئەوە دەسەڵات ناگرێتە دەستەوە تا لە دەستی بدا. دەسەڵات ڕێباز نییە، ئامانجە. دیکتاتۆر بۆ ئەوە پەیدا نابێ تا شۆڕش بپارێزێ بەڵکو شۆڕش دەکا تا ببێتە دیکتاتۆر. ئامانجی کوشتن، کوشتنە. ئامانجی ئەشکەنجە ئەشکەنجەیە. ئامانجی دەسەڵاتیش دەسەڵاتە... ئێستا لە مەبەستم تێگەیشتیت؟.

وینستۆن وەک بەرێ، لە ماندوێتی چارەی ئۆبراین سەرسام ببوو. سەروچاوی ئۆبراین گۆشتن و بەتین و دڕندانە بوو، و پڕ بوو لە سووربوون و جۆرە هێز و دەسەڵاتێ کە وینستۆن لە عاستیدا پەلوپۆی پێ نەدەکرا. دوو کیسەی بە خوار چاوەوە بوون، پێستی ڕوومەتی شۆڕ ببۆوە. ئۆبراین بە سەریدا داچەمی و بە ئانقەست ڕووی لێ بردە پێشتر.

– بیر لەوە دەکەیتەوە کە سەروچاوم ماندووە. بیر لەوە دەکەیتەوە کە باسی دەسەڵات دەکەم و پێم ناکرێ پێش بە نەمانی جەستەی خۆم بگرم. وینستۆن، چما نازانیت تاکەکەس تەنها شانەیەکە؟. ماندوێتی شانە نیشانەی بەهێزی جەستەیە. چما بە قرتاندنی نینۆکت دەمریت؟.

ڕووی وەرگێڕا و دەستێکی خستە گیرفانی و کەوتە هاموشۆ. گوتی:

– ئێمە ئیمامی دەسەڵاتین. خودا دەسەڵاتە. بەڵام جارێ ئەوەندەی پەیوەندی بە تۆوە



بێ، دەسەڵات تەنها وشەیەکە. کاتی ئەوەت هاتووە شتێ لە بارەی دەسەڵاتەوە بزانیت. یەکەم شت کە دەبێ بیزانی ئەوەیە دەسەڵات هەرەوەزییە. تاکەکەس ئەو دەمە دەسەڵاتی دەبێ کە لە تاکەکەسی بکەوێ. ئەو دروشمەی حیزب دەزانی کە دەڵێ ئازادی کۆیلایەتییە. هەرگیز بیرت لەوە کردۆتەوە کە دەکرێ ئەو دروشمە ئاوەژوو بکرێتەوە؟. کۆیلایەتی ئازادییە. تەنهای ئازاد هەمیشە تێکدەشکێ. دەبێ وابێ چونکە دەبێ هەموو تاکەکەسێ لەناوچێ و بمرێ. مردنیش گەورەترین شێوەی تێکشکانە. بەڵام ئەگەر کەسێ بتوانێ بە تەواوی خۆ بە دەستەوە بدا، ئەگەر بتوانێ دەست لە کەسایەتی خۆی بەر بدا، ئەگەر بتوانێ بە جۆرێ لە حیزبدا بتوێتەوە کە ببێ بە حیزب، ئەوسا دەبێتە دەسەڵات و نەمر دەبێ. دووەم شت کە دەبێ بیزانیت ئەوەیە: دەسەڵات کاتێ دەسەڵاتە کە بە سەر خەڵکدا بێ، بە سەر جەستەیاندا، بەڵام زیاتر بە سەر هۆشیاندا بێ. دەسەڵات بە سەر ماتریالدا کە ناوی واقعی دەرەکی لێ دەنێی، گرینگ نییە. دەسەڵاتمان بەسەر ماتریالدا جێی خۆی گرتووە. وینستۆن، کەمێ میلی میتاڵەکەی لە بیر چوو. هەوڵی دەدا خۆی ڕاست کاتەوە بەڵام ئەنجام ئازارێکی زۆر بوو. جڵەوی زمانی خۆی شل کرد: چۆن دەکرێ ماتریال بخەیتە ژێر دەسەڵاتی خۆتەوە؟. تۆ دەستت بە سەر ئاو و هەوا، یا کێشی زەویدا ناشکێ. خۆ نەخۆشی و ئازار ومەرگیش هەن کە.."

ئۆبراین، بە دیاردی دەست بێدەنگی کرد و گوتی: "بە سەر مەتریالدا زاڵین چونکە بە سەر هۆشدا زاڵین. واقیع لەو کاسە سەرەدایە. وینستۆن، خەریکە وردە وردە فێر دەبێت. شتێ نییە پێمان نەکرێ. نەبیندراوکردن، فڕاندن – هەر چیت بە زەیندا بێ. ئەگەر بمەوێ، پێم دەکرێ لە سەر عەردی ئەم ژوورەوە وەک کەف بە حەوادا بچم. نامەوێ ئەوە بکەم چونکە حیزب نایەوێ. دەبێ خۆت لە دەست یاساکانی سروشت، یاساکانی سەدەی نۆزدە دەرباز بکەی. ئێمە یاسای سروشت دادەڕێژین.

– وا نییە. دەستت بە سەر گۆی زەویدا ناڕوا. چی لە ئەوروئاسیا و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دەکەی؟. هێشتا ئەوانەت نەخستوونەتە ژێر ڕکێفی خۆت.

– گرینگ نییە. هەر کاتێ بەرژەوەندی بخوازێ دەیانخەینە ژێر ڕکێفی خۆمانەوە. ئەگەر وا نەکەین چی دەگۆڕێ؟. دەتوانین دەرگای هۆش داخەین. ئۆقیانووسیا هەموو جیهانە و بڕایەوە.

– بەڵام دنیا بەخۆی، لە گەردیلەیەک پتر نییە و مرۆڤیش خەلقەندەیەکی ورد و بێ

دەسەڵاتە. لە کەیەوە مرۆڤ خولقاوە؟. ملیۆنان ساڵ زەوی بەشەری لێ نەبووە.

– ئەمە هەر قسەیە. زەوی هەر هێندەی مرۆڤ کۆنە. چۆن دەشێ کۆنتر بێ؟. هیچ شتێ لە دەرەوەی جغزی هۆشی مرۆڤدا بوونی نییە.

– بەڵام بەرد پڕن لە ئێسکی گیانداری لەناوچوو – مامووت و فیلی زلە و خشۆکی زەبەلاح – کە زۆر بەر لە دروستبوونی مرۆ لە سەر زەوی ژیاون.

– وینستۆن! ئایە هیچ کاتێ ئەو ئێسقانانەت دیوە؟. نەخێر. زیندەوەرناسانی سەدەی نۆزدە هەر لە خۆڕا ئەوانەیان گوتووە. بەر لە مرۆ هیچ شتێ نەبووە. دوایی ئەگەر مرۆڤیش نەمێنێ، هیچ شتێ نامێنێ. هیچ شتێ لە دەرەوەی جغزی مرۆڤدا بوونی نییە.

– بەڵام هەموو گەردوون لە دەرەوەی ئێمەدایە. تەماشای ئەستێرەکان بکە. هێندێکیان یەک ملیۆن ساڵی تیشکی لێمانەوە دوورن و بۆ هەمیشە لە دەرەوەی دەسەڵاتی ئێمەدان.

ئۆبراین، بە بێ گرینگی پێدان گوتی: "ئەستێرە چییە؟. پارچە ئاگرێکە و چەند کیلۆمەترێ لێمانەوە دوورە. ئەگەر بمانەوێ دەیگەینێ. دەتوانین نەیانهێڵین. زەوی چەقی گەردوونە و خۆر و ئەستێرەی بە دەورەدا دەخولێنەوە".

وینستۆن، جارێکی تریش نائاگایانە بزوا. ئەمجارەیان هیچی نەگوت. ئۆبراین، وەک ئەوەی بەرپەرچی ناقایلبوونی بداتەوە، بەردەوام بوو: – دیارە بۆ هێندێ مەبەستی تایبەتی ئەوانە ڕاست نین. کاتێ بە ئۆقیانووسیادا گەشتێ دەکەین یا پێشبینی خۆرگیران دەکەین، ئاسانترە بڵێین زەوی بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە و ئەستێرەکان، ملیۆنەها ملیۆن کیلۆمەتر لێمانەوە دوورن. بەڵام ئەنجام؟. ئایە گومان دەکەی کە ئەستێرەناسی دووفاقانە لە دەرەوەی دەسەڵاتماندایە؟. ئەستێرەکان، بە پێی پێداویستی ئێمە دوور یا نزیک دەبنەوە. پێت وایە ماتماتیکزانەکان دەروەستی ئەو کارە نایەن؟. باوەڕی دوو فاقانەت بیر چۆتەوە؟.

وینستۆن یەکتەختە لێی ڕاکشابوو. هەرچی دەگوت وەڵامی بروسکە ئاسا، وەک کوتەک بەری دەکەوت و دەیپێچایەوە. لە گەڵ ئەوەشدا دەیزانی، بەڵێ دەیزانی کە خۆی ڕاست دەکا. ئەو باوەڕەی کە گوایە هیچ شتێ لە دەرەوەی هۆشتدا بوونی نییە – بێگومان دەبێ بەرپەرچدانەوەی هەبێ. چما سەردەمێکی دوور و درێژ ئەو باوەڕە باوی نەبووە؟. ناویشی هەبووە، بەڵام لە بیری کردووە. بزەیەکی کەم گۆشەی لێوی ئۆبراینی بزواند و لێی ڕاما. پاشان گوتی:



– وینستۆن! من پێم گوتی کە باوەڕی میتافیزیکی لایەنی بەهێزی تۆ نییە. ئەو وشەیەی بۆی دەگەڕێی (سۆلیپسیزم)[٢٣]ە. بەڵام بە هەڵەدا چووی. مەسەلەکە سۆلیپسیزم نییە. ئەگەر حەزیش دەکەی ناوی دەنێین سۆلیپسیزمی گشتی. بەڵام ئەمە شتێکی ترە و لە ڕاستیدا پێچەوانەی سۆلیپسیزمە.

کەمێ شێوەی دەنگی گۆڕا. پاشان گوتی:

– خەریکە لە مەبەست دوور دەکەوینەوە. دەسەڵاتی ڕاستەقینە، ئەو دەسەڵاتەی کە شەو و ڕۆژ هەوڵی بۆ دەدەین دەست ڕۆیشتن نییە بە سەر ماتریالدا بەڵکو دەسترۆیشتنە بە سەر مرۆڤدا.

کەمێکی دی بێدەنگ بوو. دیسان خۆی وەک مامۆستایەک پێشان دا کە پرسیار ئاراستەی قوتابییەک بکا: "وینستۆن، مروڤ بە چ جۆرێ دەسەڵاتی خۆی بە سەر مرۆڤی تردا دەسەپێنێ؟".

وینستۆن کەوتەوە بیرکردنەوە. گوتی: "بە ئازاردانی".

– ڕێک وایە. بە ئازاردانی. گوێڕایەڵیی بەس نییە. ئەگەر ئازار نەچێژێ چۆن دڵنیا دەبیت کە بە ئارەزووی تۆ ئازار دەچێژێ نەک هی خۆی؟. دەسەڵات ئەوەیە ئازار و سەرپێشۆڕکردن بخولقێنێ. دەسەڵات ئەوەیە مۆخی مرۆ لەتوپەت کەیت و سەرلەنوێوە، بە شێوەیەکی دی، وەک خۆت گەرەکتە دایڕێژیتەوە. دەی باشە. تۆ دەزانیت ئێمە خەریکی پێکهێنانی چۆن جیهانێکین؟. ڕێک پێچەوانەی ئەو جیهانەی کە (هێدۆنیست)[٢٤]ەکانی زەمانی زوو، هەوڵی پێکهێنانیان دەدا. جیهانێک، لە ترس و خیانەتکاری و ئەشکەنجە و شەق وەشاندن و شەق خواردن پێک بێ. جیهانێک، کە بە پێشکەوتن بێبەزەیی دەبێ. پێشکەوتنی جیهانی ئێمە پێشکەوتنی ئازاردانە. دەیانگوت گوایە شارستانیەتی کۆن لە سەر خۆشەویستی و دادپەروەری پێکهاتووە. جیهانی ئێمە لە سەر بناغەی ڕق هەڵچندراوە. لە جیهانی ئێمەدا، جگە لە ترس و تووڕەبوون و سەرکەوتن و ئاهەنگ و خۆزەلیل کردن هەستی دی لە ئارادا نییە. شتی دی لە بەین چوون.

٢٣ – Solipsism بۆچوونێکی فەلسەفییە کە دەڵێ: تەنها ئەو شتە بوونی هەیە کە لە (من)ی خۆمدا هەیە. یائەوە هەیە کە پەیوەندی بە (من)ی خۆمەوە هەیە – وەرگێڕ.

٢٤ – Hefonist ئەو کەسەیە کە بەختەوەری بە شای چاکەکان دەزانێ. ئەمەش مەزهەبێکی فەلسەفی کۆنە – وەرگێڕ.

شوێنەواری بیرکردنەوەی پێش شۆڕش دەسڕینەوە. پەیوەندی نێوان کوڕ و باوک، پیاو و پیاو، ژن و مێردمان نەهێشتووە. ئیدی کەس ناوێرێ پشت بە ژن و منداڵ و دۆستی خۆی ببەستێ. لە داهاتوودا، هاوسەرێتی و دۆستایەتی نامێنن. منداڵ، لە کاتی لەدایکبوونیاندا، ڕێک وەک ئەوەی هێلکە لە بن مامر هەڵدەگیرێ، لە بەر دایک هەڵدەگیرێن. ڕەحەتبوون ناهێڵێن. زاوزێ، وەک نوێ کردنەوەی پیتاقەی جیرە، دەبێتە کاری ڕەسمی سالانە. ئارەزووی سێکس ناهێڵێن. پسپۆرانی (ئەعساب)مان، ئێستا خەریکی ئەو کارانەن. وەفا بۆ حیزب نەبێ نامێنێ. ئەوین بۆ ڕێبەری گەورە نەبێ نابێ هەبێ. پێکەنین، بە تێکشکانی دوژمن نەبێ نابێ هەبێ. هونەر و ئەدەب و زانست نامێنن. ئەگەر بووین بە خاوەنی دەسەڵات پێویستمان بە زانست نامێنێ و جیاوازی لە نێوان جوان و ناشریندا نابێ. حەزی زانین و ئارەزووی ژیان نامێنن. ململانێ، بۆ وەدەسهێنانی بەختەوەری لە بەین دەچێ. بەڵام ئەوەی کە هەمیشە دەبێ هەبێ، لە بیرت بێ وینستۆن، مەستبوونە بە بادەی دەسەڵات کە هەمیشە گەشە دەکا و جوان دەبێ. هەمیشە و هەموو ساتێ، ئارەزووی سەرکەوتن و تێکشکاندنی دوژمنی قوڕبەسەر، دەبێ هەبێ. ئەگەر دەتەوێ پاشەڕۆژ بێنیتە بەر چاوی خۆت، بیر لە تاکە پێڵاوێ بکەرەوە کە بەردەوام بە سەروسەکوتی مرۆدا دەنرێ.

وەک ئەوەی چاوەڕوانی ئاخاوتنی وینستۆن بکا، کەمێ بێدەنگ بوو. وینستۆن هەوڵی دەدا ڕاست بێتەوە. هیچی پێ نەدەگوترا. دەتگوت دڵی ڕچیوە. ئۆبراین لە سەر قسەی خۆی ڕۆیشت:

– بیریشت نەچێ کە ئەوە هەمیشەییە. هەمیشە سەروسەکوتێک هەیە کە پێی پێدا بنێی. لادەر و دوژمنی کۆمەڵگە هەر دەبن تا دووبارە و دووبارە زەلیلیان بکەیت و تێکیانبشکێنی. هەرگیز ئەشکەنجەدان و هەڵواسین نابڕێنەوە. ئەو دنیایە، هێندەی دەبێتە دنیای سەرکەوتن هێندەش دەبێتە دنیای ترس و لەرز. حیزب، چەندە دەسەڵاتی زیاد بکا، ئەوەندە لێبوردنی کەم دەکا: بەرهەڵستکار چەند لاواز بێ، زنجیری دیکتاتۆری ئەوەندە شەتەک دەدرێ. گۆڵدستەین و باوەڕی ڕافزیگەرانەی ئەو، دەبێ هەمیشە بە زیندویی بمێنن. هەموو ڕۆژێ، هەموو ساتێ تێکدەشکێن و تاوانبار دەکرێن و قەشمەرییان پێ دەکرێ و تف دەکرێتە چارەیان. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ هەبن. ئەم درامایەی کە حەوت ساڵە بە تۆی ئەنجام دەدەم، پشتاوپشت، نەوە دوای نەوە باس دەکرێ و باس دەکرێتەوە و دەڕازێندرێتەوە. لادەر لێرە دەهێڵینەوە، بە دەم ئازارەوە هاوار دەکا، تێک و پێک دەشکێ



و سووکایەتی پێ دەکرێ – لە ئەنجامدا، لە خۆی ڕەها دەبێ و بە کەیفی خۆی ژیوان دەبێتەوە و خۆی بە سەر پێڵاواندا دەدا. ئەو جیهانەی کە پێکی دێنین وایە، وینستۆن. جیهانێکە، سەرکەوتنی دوای سەرکەوتنی تێدایە. زاڵبوون بە دوای زاڵبووندا: بەکارهێنانی بەردەوام و بەردەوام و بەردەوامی دەسەڵات. دەبینم وا خەریکە ئەو جیهانە بێنیتە بەر چاوی خۆت. بەڵام لە ئەنجامدا لە تێگەیشتن زیاتر دەڕۆی. بە چاکی دەزانیت و پێشوازی لێ دەکەیت و دەبیتە بەشێکی.

وینستۆن بایی ئەوە هاتبۆوە سەرخۆ کە وەڵام بداتەوە:"ناتوانن!."

– وینستۆن مەبەستت چییە؟.

– هەرگیز ناتوانن ئەو جیهانە ساز بکەن کە ئێستا باست کرد. ئەوە خەیاڵە. ئەوە نەکردەیە.

– بۆ؟.

– مەحاڵە شارستانییەت لە سەر بناغەی ترس و ڕق و ستەم هەڵچندرێ. دەوامی نابێ.

– بۆ نابێ؟.

– چونکە مەرجی ژیانی تێدا نییە. بەخۆی هەڵدەوەشێتەوە. خۆی دەکوژێ.

– قسەی بێ مەعنا!. پێت وایە ڕق لە ئەوین زیاتر مرۆ سەرف دەکا؟. بۆ؟. ئەگەر واش بێ کوا جیاوازی هەیە؟. وا دانێ گورجتر دەڕۆین. وا دانێ خێرایی ژیان زیاد دەکەین و تەمەنی پیربوون دەکەینە سیی ساڵ. چی دەگۆڕێ؟. ناتوانی تێبگەی کە مردنی تاکەکەس مردن نییە؟. حیزب نەمرە.

ئەو دەنگە وەک هەموو جارێ وینستۆنی لە پەلوپۆ خستبوو. ترسی ئەوەشی هەبوو ئەگەر بەرپەرچی بداتەوە و باوەڕ نەهێنێ، ئۆبراین میلەکە با بدا. لەگەڵ ئەوەشدا دەمی خۆی پێ نەگیرا. بە بێتاقەتی، بێ پێشەکی و هیچ بەڵگەیەک کە پشتی پێ ببەستێ ئەو ترس و سامە نەبێ کە ئۆبراین باسی کرد، هێرشی برد:

– نازانم. وەک یەکە. دەبێ تێکبشکێن. شتێک دەبێ کە بە سەرتاندا زاڵ بێ.

– وینستۆن، دەسمان بە سەر هەموو پلەیەکی ژیاندا دەڕوا. تۆ پێت وایە شتێ بە ناوی سروشتی مرۆڤەوە هەیە و لە کرداری ئێمە تەنگەتاو دەبێ، ئەوسا لێمان هەڵدەگەڕێتەوە. بەڵام ئێمە خۆمان سروشتی مرۆ دروست دەکەین. مرۆ توانای بێ بڕانەوەی گۆڕینی هەیە. باتداوەتەوە سەر باوەڕە کۆنەکەت کە گوایە پرۆلیتار و کۆیلە، لێمان ڕادەپەڕن و

دەمانڕوخێنن. حیزب مرۆڤایەتییە. شتی دی لە دەرەوە، لە دوای هیچەوەن.

– بێ سوودە. ئاخرێکەی سەردەکەون. وەک چۆن هەن واتان دەبینن. بەڵام درەنگ و زوو کەوتووە. ئەوسا لەتوپەتتان دەکەن.

– هیچ بەڵگەت هەیە کە وای لێ دێ؟. یا چ هۆیەک هەیە تا وای لێ بێ؟.

– نەء. بەڵام باوەڕم وایە. دەزانم ئێوە تێکدەشکێن. شتێ لە گەردووندا هەیە – نازانم هەناسەیە، ڕوحە – شتێکە و ئێوە پێی ناوەستن.

– وینستۆن، باوەڕت بە خودا هەیە؟.

– نەء .

– ئیدی ئەو شتە چییە وا پێی ناوەستین؟.

– نازانم. ڕوحی بنیادەمە.

– تۆ خۆت بە بنیادەم دەزانیت؟.

– بەڵێ.

– وینستۆن، ئەگەر تۆ بنیادەم بیت، بنیادەم دوای براوەتەوە. بابەتی تۆ قەلفڕی کردووە. ئێمە بەرۆگرین. زانیوتە کە تۆ بە تەنهای؟. تۆ، لە دەرەوەی ڕەوتی مێژووی. تۆ، بوونت نییە.

ڕەفتاری ئۆبراین گۆڕا و توندوتیژ بوو. بە ڕەقییەوە گوتی:

– تۆ خۆت لە سەرەوەی درۆ و دڵڕەقی ئێمەوە دەبینیت؟.

– بەڵێ، خۆم لە سەرەوەی ئێوە دەبینم.

ئۆبراین وەڵامی نەدایەوە. وینستۆن دوو دەنگی تری بیستن. پاش کەمێ، دەنگی خۆی ناسییەوە. شریتی دەنگی خۆی و ئۆبراین بوو. هی ئەو شەوە بوو کە پەیوەندی بە ئەنجومەنی برایەتییەوە کرد. دەنگی خۆی بیست کە بەڵێنی درۆکردن و دزی و فرتوفێڵ و کوشتنی دەدا و پشتگیری بڵاوکردنەوەی هیرۆین و فەسادی و نەخۆشی جنسی و ڕشتنی ئەسیدی بە منداڵاندا دەکرد. ئۆبراین لەبەر بێ حەوسەڵەیی بزووت. وەک ئەوە بوو بڵێ خۆنواندن دادت نادا. دوگمەیەکی بادا و دەنگەکە بڕا.

– هەستە!.

قایشەکانی شل کرابوونەوە. پێی نانە زەوی و بە لارەلار هەستا. ئۆبراین گوتی: – تۆ



دوا بنیادەمیت . چاودێری ڕوحی بنیادەمیت. خۆت وەک هەیت دەبینی. دەی خۆت ڕووت کەرەوە .

وینستۆن، گرێی بەدلەکەی کردەوە. دەمێ بوو زنجیرەکەی تێک چووبوو. بیری نەبوو، لەو دەمەوەی کە گیرابوو خۆی ڕووت کردبێتەوە. لە ژێر بەدلەکەیەوە، پارچە پەڕۆی چڵکنی زەردباو بە جەستەیەوە لکابوون. کە ئەوانەی دادەنان، ئاگادار بووەوە کە ئاوێنەیەکی سێگۆشە بەوسەری ژوورەکەوە هەڵواسرابوو. لێی نزیک بووەوە، و ڕێک لە جێی خۆیدا چەقی و لە خۆی ڕاما و لەخۆڕا هاوارێکی کرد.

ئۆبراین گوتی: "بچۆرە پێشتر. لە نێوان ئاوێنەکاندا بووەستە با لاونیویش خۆت ببینی".

وێستابوو چونکە ترسابوو. دەعبایەکی بۆری چەماوەی وەک هەیکەلە ئێسکی لێ هاتە پێش و بە ترسەوە سەیری دەکرد. مەسەلەکە هەر ئەوە نەبوو کە خۆی ناسییەوە. لە ئاوێنەکە نزیک بووەوە. ئەو خەلقەندە چەماوەیە، ڕوخساری بەرەو پێشەوە دەرپەڕیبوو و سیمای بەستەزمانی، هەنیەیەکی زەقی بە سەرەوە بوو. ئێسکی گۆنا تێکشکاوەکانی، دوو چاوی زەقیان بە سەرەوە بوون و لووتێکی خواروخێچیان لە نێواندا بوو. ئەو هەستەی کە ئەو ڕوخسارە تێیدا پێکی دەهێنا لەگەڵ هەستی خۆیدا جیاوازی هەبوو. هێندێ لە قژی وەریی بوو. لە سەرەتاوە پێی وابوو قژی مۆر بووە بەڵام بۆی دەرکەوت کە پێستی سەری مۆر هەڵگەڕاوە. هەردوو دەستی و هێندێ لە دەموچاوی نەبێ، هەموو گیانی چڵک داپۆشیبوو و بۆر ببوو. لە ژێر چڵکەکەوە، لێرە و لەوێ جێی زام دیار بوون. لای برینەکەی قاچیەوە، پێستی پیسی کردبوو و ئاوسابوو. بەڵام لە هەمووی ترسناکتر شێوەی جەستەی لاوازی بوو. پەراسووی، وەک پەراسووی هەیکەلە ئێسقان باریک بوون. لاقی هێند باریک بوو، چۆکی لە ڕانی ئەستوورتر بوو. زانی ئۆبراین مەبەستی چی بوو کە پێی گوت لە لاوە سەیری خۆی بکا. کەمەی بڕبڕەپشتی تۆقێنەر بوو. شانە باریکەکانی، بە جۆرێ بەرەو پێشەوە چەمیبوون، سینگی وەک چاڵ دەردەکەوت. ملە باریکەکەی لە ژێر قورسایی کەللەیدا خوار ببوو. دەکرا بڵێی جەستەی، هی پیاوێکی شێست ساڵە بوو کە گرفتاری دەردێکی گران بووبێ.

ئۆبراین گوتی: "هێندێ جار بیرت لەوە کردۆتەوە کە سیمای من – سیمای ئەندامی ناوەندی حیزب – پیر و ماندووە. چۆن بیر لە سیمای خۆت دەکەیتەوە؟."

شانی وینستۆنی گرت و وای بادا کە ڕووبەڕووی بووەوە. گوتی: "بزانە چت بە سەر هاتووە. تەماشا چۆن چڵکت لێ دەبارێ. سەیری چڵکی نێوان پەنجەکانی پێی خۆت بکە. سەیری برینە پیسەکەی قاچت بکە. بۆنی تەگەوڕت لێ دێ. ڕەنگە چی دی بۆن نەکەی. سەیری لەڕیی خۆت بکە. چاوت لێیە؟. پەنجە شادە و پەنجە کەڵەم دەگاتەوە دەوری بازووت. دەتوانم ملت وەک گێزەر بشکێنم. دەزانی لەوەتەی لای ئێمەی بیست و پێنج کیلۆ کەمت کردووە؟. تەنانەت قژیشت، گەبەڵ گەبەڵ دەوەرێ. سەیر کە!". چنگی لە قژی وینستۆن گیر کرد و گەبەڵێکی لێ هەڵکەند. " ئا دەی دەمت کەرەوە. نۆ، دە، یانزە ددانت ماون. کە هاتیتە ئێرە چەند ددانت هەبوون؟. ئەوانەی ماویشن دەکەون. ئەها تەماشا!".

بە پەنجەی بەهێزی شادە و کەڵەی، یەکێ لە ددانەکانی پێشەوەی گرت کە مابۆوە. کسپە لە چەنەگەی وینستۆن هەستا. ئۆبراین، ددانەکەی لە ڕیشە دەرهێنابوو. فڕەیدایە ئەوسەری ژوورەکە و گوتی:" خەریکە دەڕزیی. خەریکە هەڵدەوەشێیتەوە. تۆ چیت؟. کیسە پیسییەکی. بسووڕێوە و تەماشای ئاوێنەکە بکە. ئەو شتە دەبینی وا بەرانبەرت وێستاوە؟. ئەوە دوا بنیادەمە. ئەگەر بنیادەم بیت ئا ئەوە بنیادەمبوونە. دەی جلەکانت لەبەرکە".

وینستۆن لە سەرخۆ و بە بێ تاقەتی دەستی کرد بە پۆشینی بەرگەکانی. تا ئەو کاتە نەیدەزانی هێندە لاواز و بێتاقەتە. بیری لە یەک شت دەکردەوە: "دەبێ لەوە زیاتر لەو جێیە بووبێ کە خۆی بیری لێ دەکردەوە. بە پێچانەوەی پەڕۆوپاڵ بە دەوری جەستەی وێرانیدا، هەستی بەزەیی هەموو گیانی گرتەوە. بەر لەوەی بزانێ چی دەکا، لە سەر لێواری ستۆلێکی باریک کە بە لای تەختەکەوە بوو گرمۆڵە بوو و دەستی بە گریان کرد. ئاگای لە ناشرینی و نارێکی ئەو جەستەیە بوو کە لە ژێر پەڕۆ پیسەکانەوە، لە بەر تیشکی سپی و گەشی گلۆپەکە دانیشتبوو و دەگریا و نەیدەبڕییەوە. ئۆبراین، بە مەیلەو سۆزێکەوە دەستی خستە سەر شانی و گوتی: – هەر وا نابیت. هەر کاتێ بتەوێ دەرباز دەبیت. هەموو شتێ لە سەر خۆت بەندە.

وینستۆن بە دەم هەنسکەوە گوتی: "تۆ ئەم بەڵایەت بە سەر هێنام!. تۆ منت گەیاندە ئەم حاڵە " .

– نا، وینستۆن تۆ خۆت بە خۆتت کرد. کاتێ دژی حیزب بزوای، ئەمەت بە خۆت کرد. ئەمەی کە بە سەرت هات، لە هەناوی یەکەم کردارتدا بوو. هیچ شتێ نەبووە تۆ بەخۆت پێشبینیت نەکردبێ.



ئۆبراین پشوویەکی دا و وا بەردەوام بوو:

– وینستۆن، بە سەرتدا زاڵ بووین. تێکمانشکاندی. جەستەی خۆتت دی چی لێ هاتووە. هۆشیشت هەمان دەردی بە سەر هاتووە. پێم وا نییە لە خۆباییبوونت تێدا مابێ. قامچی و شەقی زۆرت خواردووە، سووکایەتیت پێ کراوە، بە دەم ئازارەوە ناڵاندووتە، لە ناو خوێن و ڕشانەوەی خۆتدا گێنگڵت داوە، هاوارت کردووە، هەموو کەس و هەموو شتێکت بە دەستەوە داوە. کەتنێ ماوە پێت نەکرابێ؟.

وینستۆن لە گریان ببۆوە هەرچەندە فرمێسکیشی بە چاواندا دەهاتە خوارێ. سەری هەڵبڕی و سەیرێکی ئۆبراینی کرد و گوتی: جولیام دەسخەڕۆ نەکردووە.

ئۆبراین، بە دەم بیرکردنەوەوە لێی ڕاما و گوتی: نەء . جولیات دەسخەڕۆ نەکردووە.

ڕێزە تایبەتییەکەی بۆ ئۆبراین کە پێی نەدەکرا لە هەستی خۆی دەربهێنێ، دیسان لە دڵی وینستۆندا سەری هەڵدا. لە دڵی خۆیدا گوتی:"چ هەستێکە! چ هەستێکە!". شتێ نەبوو بە ئۆبراین بگوترێ و درکی پێ نەکا. هەر کەسێکی دی بوایە دەیگوت جولیات دەسخەڕۆ کردووە. ئاخر چی مابوو لە ژێر ئەشکەنجەدا لێیان دەرنەهێنابێ؟. هەرچی لە بارەی جولیاوە زانیبێ، عادەت و هەڵسوکەوت و ڕابردووی، بۆ باس کردبوون. دانی بە بچووکترین نهێنی بازاڕیی نێوانیاندا نابوو کە لە ژوان و دیدارەکانیاندا ڕوویان دابوو. باسی ئەو خواردنانەی کە لە بازاڕی ڕەشدا کڕیبوونی، باسی جووتبوونیان و هەڵگەڕانەوەیان لە حیزب و هەموو شتێکی تری کردبوو. لەگەڵ ئەوانەشدا، بە پێی باوەڕی خۆی جولیای دەسخەڕۆ نەکردبوو. دەستی لە ئەوینی بەر نەدابوو و هەستی بەرانبەری نەگۆڕابوو. ئۆبراین بێ ئەوەی پێویستی بە ڕوونکردنەوە بێ، مەبەستی تێگەییبوو.

– کەی تیربارانم دەکەن؟.

– ڕەنگە زۆری پێ بچێ. تۆ شتێکی زەحمەتیت. بەڵام هیوابڕاویش مەبە. هەموو دەردێ، درەنگ یا زوو، دەرمان دەکرێ. لە ئەنجامدا تیربارانت دەکەین.

## ٤

وەزعی زۆر چاکتر ببوو. ڕۆژ بە ڕۆژ - ئەگەر بشێ بگوترێ ڕۆژ بە ڕۆژ - قەڵەوتر دەبوو و هێزی وەبەر دەهاتەوە.

تیشکە سپییەکە و وژەوژەکە وەکی خۆیان بوون، بەڵام ژوورەکە لەوانەی بەرێ فەڕاحتر و خۆشتر بوو. قەرەوێڵە دارەکە، دۆشەک و سەرینی لە سەر بوون و کورسییەکیشی بە لاوە بوو. گەرماوی پێ کرابوو و مەودا دەدرا سەروچاوی خۆی، زوو زوو لە دەسشۆرێکدا بشوا. تەنانەت ئاوی گەرمیشیان پێ دابوو. جلی نوێی ژێرەوە و بەدلەیەکی شینی تازەشیان پێ دابوو. هەتوانی ئازارشکێنیان لە زامەکەی قاچی دابوو. ددانەکانی تریشیان دەرهێنابوون و تاخمیان بۆ کردبوو. دەبێ چەند حەفتەیەک یا چەند مانگێک تێپەڕیبێ. ئەگەر بیویستبا، دەیتوانی بە هۆی ژەمە خواردنەکانەوە کە لە کاتی خۆیاندا دەهاتن، کات بژمێرێ. ڕۆژی سێ ژەم خواردنیان دەدایێ. هێندێ جار بیری لەوە دەکردەوە کە دەبێ بە ڕۆژ خواردنی وێ دەن یا بە شەو. خواردنەکە، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بەتام بوو و یەک لەو سێ ژەمە، گۆشتیشی تێدا بوو. جارێ، تەنانەت پاکەتە جگەرەیەکیشیان وێ دا. شقارتەی نەبوو. بەڵام ئەو گاردەی - هەرگیز قسانی نەدەکرد - و خواردنی لە کاتی خۆیدا بۆ دەهێنا، ئاگری دەدایێ. یەکەم جگەرەی کێشا، باری تەندروستی تێک چوو. دەستی پێوە گرت و وای کرد بەشی زۆری بکا. لە دوای هەر ژەمە خواردنێ، نیو جگەرەی دەکێشا.

تابلۆیەکی سپییان بۆ نووسین پێ دابوو و قەڵەمێکیش بە سووچییەکییەوە بوو. لە سەرەتادا بە کاری نەدەهێنا. تەنانەت لە کاتی وەئاگابوونیشدا هەر پاڵ دەکەوت. لە دوای ژەمە خواردنێکەوە بۆ ژەمێکی دی ڕادەکشا. هێندێ جار دەنوست و هێندێ جار کەروێشکەخەوی دەکرد و لە دەریای خەیاڵدا نقوم دەبوو و چاوی نەدەکردنەوە. دەمێ بوو ڕاهاتبوو لە بەر تیشکی بە تیندا بنوێ. ئەو تیشکە چ کاری نەدەکردە سەری هێندە نەبێ خەونەکانی ڕوونتر بن. زۆربەی کات خەونی دەدی و خەونەکانیشی گەش بوون. لە سەرزەمینی زێڕین دەبوو یا لە ناو کەلاوەی گەورە و بە شکۆی ڕووناکدا، لەگەڵ دایکیدا، لەگەڵ جولیادا، لەگەڵ ئۆبرایندا، بێ ئەوەی هیچ بکا، لە بەر خۆر دادەنیشت و باسی بابەتی ئاشتیانە و هێمنی دەکرد. لە کاتی وەئاگابوونیدا، بیری لە خەونەکانی دەکردەوە. پێ دەچوو بە نەمانی ئازار، توانای هۆشی لە دەست دابێ. بێزار نەبوو، پێویستی بە



ئاخاوتن یا تێپەڕبوونی کات نەبوو. دەیویست بە تەنها بێ، لێی نەدرێ و لێکۆڵینەوەی لە تەکدا نەکرێ، خواردنی بە ئەندازەی پێویست بێ و هەموو جێیەکی پاک بێ و تەواو.

وردە وردە، کەمتر کاتی بە خەو بە خەرج دەدا. بەڵام هەر حەزی نەدەکرد هەستێ. هیچی نەدەویست جگە لەوەی پاڵ کەوێ و هەست بکا جەستەی هێزی وەبەردا دێتەوە. دەستی بە جەستەی خۆیدا دەگێڕا. هەوڵی دەدا دڵنیابێ کە ماسولکەکانی گرد دەبن و پێستی سفت دەبێ. ئیدی دوودڵی نەدەویست کە قەڵەوتر ببوو. ڕانی لە چۆکی ئەستوورتر بوون. دوای ئەوە، لە سەرەتاوە بە زۆرەملێ دەستی بە وەرزش کرد. زۆری نەبرد، بە پێی ژمارەی هەنگاوەکانی بە ژوورەکەدا، دەیتوانی سێ کیلۆمەتر ڕێ بکا. شانە خواروخێچەکانی کەمێ ڕاست ببوونەوە. دەستی بە ڕاهێنانی قورستر کرد. ئەوانەی کە پێی نەدەکران، دووچاری سەرسامی و تێکشکانیان دەکرد. ڕێکردن نەبێ هیچی تری پێ نەدەکرا. کورسییەکەی پێ هەڵنەدەگیرا. نەیدەتوانی لە سەر یەک لاق بوەستێ. کە دادەچەمی ئازاری کوشندەی ڕانی و سەر پێی، بۆیان دەردەخست کە هەر هێندەی لە دەست دێ بە پێوە بێ. لە سەر دەم ڕادەکشا و هەوڵی دەدا شناو بکا. فایدەی نەبوو، یەک سانتیمەتریش جەستەی خۆی پێ هەڵنەدەبڕدرا. بەڵام پاش چەند ڕۆژێ - دوای چەند ژەمە خواردنێکی دی، ئەو پلەیەشی بڕی و وای لێ هات کە شەش جاران لە سەر یەک شناو بکا. خەریک بوو دڵی بە تاقەتی خۆی خۆش دەبوو و ئەو هومێدەشی هەبوو ڕوخساری شێوەی ئاسایی خۆی وەرگرتبێتەوە. بەڵام کە دەستی بە کاسەسەری خۆیدا دێنا، ئەو سیما چەوت و چێڵە تێکشکاوەی بیر دەکەوتەوە کە لە ئاوێنەکەیدا دیبوو. هۆشی کەوتبۆوە کار. لە سەر قەرەوێڵەکە دادەنیشت و پشتی بە دیوارەکەوە دەدا و تابلۆ سپییەکەی لە سەر چۆکی دادەنا. بە قووڵیی بیری لە خۆفێرکردن دەکردەوە.

خۆی بە دەستەوە دابوو. لە ڕاستیدا، تازە بۆی دەرکەوتبوو کە لە سەرەتاوە ئامادەی خۆ بە دەستەوەدان بووە. لەو ساتەوە کە پێی کەوتە وەزارەتی ئەوین و تەنانەت لەو دەمەوە کە لەگەڵ جولیادا، بێ دەسەڵاتانە وێستابوون و دەنگی گڕی تەلەسکرینەکە فەرمانی پێ دەدان چی بکەن، پەی بە بێ هودەیی و بێ کەڵکی هەوڵی خۆی بەرانبەر حیزب بردبوو. تازە دەیزانی کە ماوەی حەوت ساڵی تەواو، وەک سیسرک، لە ژێر زەڕەبینی پۆلیسی خەیاڵدا بووە. هیچ بزاوێکی و هیچ دەنگێکی بڵندی، لەوان پەنهان نەبووە و ئاگاداری گشت بیرکردنەوەیەکیشی بوون. تەنانەت گەردی سەر بەرگی یاداشتەکانیشیان، جوان لە جێی خۆیدا دانابۆوە. شریتی تۆمارکراویان بۆ لێدا و وێنەیان پێشان دا. هێندێ لە

وێنەکـان، هی خـۆی و جولیـا بوون. ئا، ئەوەش . چی دی ململانێی لەگەڵ حیـزبدا پێ نەدەکرا. نەک هەر ئەوە، بەڵکو حیزب لە سەر هەقیش بوو. دەبێ وا بێ: چۆن مێشکێکی نەمری هاوبەشی گشتی بە هەڵەدا دەچێ؟. چ پێوانەیەک هەیە بۆچوونەکانی پێ بپێورێ؟. هۆشی ساغ ڕێژەییـە. مـەسـەلەکـە هەر هێندەیە هۆشی خـۆت وا ڕابێنی کـە لەگـەڵ هۆشی ئەواندا تاقوفیق نەکەوێ. هەر ...!

قـەڵەمەکەی نێوان پەنجەکانی ئەسـتوور و سـەیر هەست پێ دەکرا. دەستی بە نووسینی ئەو خەیاڵانە کرد کە بۆی هاتن. لە سەرەتاوە بە پیتی درشت و ناڕێک نووسی:

کۆیلایەتی ئازادییە

بێ ڕاوێستانیش لە خوارترەوە نووسی:

دوو و دوو دەکاتە پێنج

دوای ئەوە، مـاوەیەکی بۆشـایی پەیدا بـوو. دەتگوت هۆشی لە ژێر بارێک ڕەها بووە و خـۆی پێ نەدەگـیـرایەوە. دەیزانی کـە دەزانێ دوای ئەوە چی دێ بەڵام ئەو کـاتە بۆی نەدەهاتەوە یاد. کە وەبیری خۆشی هێنایەوە، لە ڕێی بەڵگەی ئاگایانەوە، پەی بە چەند و چۆنی برد. نووسی:

خوا دەسەڵاتە

هەمـوو شـتـێکی قـەبووڵ بوو. ڕابردوو دەسکاری دەکرا. هەرگیـزیش ڕابردوو دەسکاری نەکراوە. ئۆقیـانووسیا لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا شەڕی بوو. ئۆقیانووسیا، هەمیشە لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ئاسـیـادا لە شـەڕدا بووە. جـۆنز و ئارۆنسـۆن و ڕۆتـەرفـۆرت، ئەو تاوانانەیان ئەنجام دابوو کە پێیان تاوانبار کرابوون. هەرگیز وێنەیەکی نەدیوە کە بەڵگەی بێتاوانییان بووبێ. هەرگیز ئەو وێنەیە نەبووە و ئەم کاتی خۆی، لەخۆڕا دروستی کردووە.

بەڵام ئەم خـەیاڵانە خـەیاڵی درۆ و خـۆفـریودان بوون. چەند هاسـان بـوو!. تەنها خـۆ بە دەستەوە دە، ئیـدی هەمـوو شتێکی بە دوودا دێ. بەوە دەچوو پێچەوانەی خوڕی ئاو مەلە بکەیت و کـتـوپڕ بڕیاری وەرچەرخـان بدەیت و لەگـەڵ ڕەوتی ئاوەکـەدا بڕۆی. دیدت نەبێ هیچت ناگۆڕێ کە لە هەموو حاڵەتێکدا دەبێ بگۆڕدرێ. بە زەحمەت هۆی یاخیبوونی خۆی دەزانی. هەموو شتێ هاسان بوو تەنها...

دەکرا هەموو شتێ ڕاست بێ. ئەوانەی پێیان دەگوترێ یاسای سروشت، پڕوپووچ بوون. یاسای کێش فشە بوو. ئۆبراین گوتبووی: "ئەگەر بمەوێ پێم دەکرێ لە سەر عەردی ئەم



ژوورەوە، وەک کەف بە حەوادا بچم". وینستۆن بیری لێ کردەوە: "ئەگەر ئەو پێی وابێ کە دەتوانێ وەک کـەف بە حـەوادا بچێ و لە هەمـان کـاتدا منیش پێم وابێ کـە دەیبـینم ئەوە دەکا، کەوابێ کردی". کتوپڕ وەک تەختە کەشتییەکی شکاو کە لە بنی دەریاوە سەرکەوێ، ئەم خەیاڵە خزایە هۆشیەوە: "بە ڕاستی ڕوو نادا. دەیهێنینە هۆشی خۆمانەوە. خەیاڵە". یەکسەر ئەو بۆچوونەی لە زەینی خۆیدا چەسپاند. بۆچوونێکی ڕەوان بوو.

پێشەکی وا دادەنرێ کە لە جێیـەک، لە دەرەوەی بنیـادەمدا دنیـای "حەقیـقـەت" هەیە و ڕووداوی "حـەقـیـقـەت"ی لێ ڕوو دەدەن. بەڵام دنیـایەکی لەو بابەتە چۆن دەبێ هەبێ؟. لە مێـشک و هۆشی خـۆمـاندا نەبێ، زانیـاریمان لە بارەی شـتـەوە لە کـوێ بوو؟. هەرچی ڕوو دەدا، لە مێـشکدا ڕوو دەدا و هەرچی لە هەمـوو مێشکەکاندا ڕوو بدا، لە ڕاسـتیـدا ڕوو دەدا.

چ پێی عـەسـتـەم نەبوو بەرپەرچی گـوتەی بێ سەروبەر بداتەوە وەمەترسی ئەوەشی نەبوو بێ بە قوربانیی بۆ ئەوە. پێی وابوو کە نەدەبوو وا بێ. هەر کاتێ خەیاڵێکی ترسناک ڕوو بدا، دەبێ هۆش کـوێرەڕێیـەک بدۆزێتەوە. ئەمـەش دەبێ لە خۆڕا و خـۆکرد بێ. لە گـوتەی نوێدا بەمە دەگوترێ ڕاگرتنی تاوان.

دەستی بە خۆڕاهێنان، لە سەر ڕاگرتنی تاوان کرد. هێندێ مەسەلەی دادەهێنا: "حیزب دەڵێ زەوی تەختـە"، "حـیـزب دەڵێ سـەهۆڵ لە ئاو قـورسـتـرە" و خـۆی فـێـری نەدیتن و تێنەگەیشـتـنی بابەتی پێچەوانە دەکـرد. هاسان نەبوو. توانای هێنانەوەی بەڵگەی زۆر و دەسبەجێی گەرەک بوو. بۆ نموونە، مەسەلەی بیـرکاری وەکو "دوو و دوو دەکاتە پێنج" لە دەرەوەی توانـای هۆشی کـاتیی ئەودا بوو. مـێـشـک پێـویسـتی بە ڕاهێنان هەیە تا لە چرکەیەکی دیاریکراودا جوانترین بەهرە لە لۆژیک وەرگرێ و لە چرکەی دواتردا ئاگای لە دزێوترین هەڵە نەبێ. کـەرایەتی و دانایی وەک یەک گـرینگن و وەک یەکـیش زەحـمـەتە وەدەست بێن. بە لایەکی مێشکی، هەمیشە ئەو پرسیارەی دەکرد کە دەبێ کەی تیرباران بکرێ. ئۆبراین پێی گوتبوو:"هەموو شتێ لە دەستی خۆتدایە". بەڵام دەیزانی هیچ کارێکی بەئاگایانە نییە مەسەلەکەی پێ نزیک بخرێتەوە. لەوانە بوو دە دەقیقەی دی جێبەجێ بکرێ لەوانە بوو دە ساڵی دی. لە دەستیـان دەهات ساڵەهای ساڵ، لە ژووری تەنهاییدا بیهێڵنەوە. لەوانە بوو بەرەو ئۆردوگـای بێگاریی ڕەوانەی بکەن. لەوانە بوو بەو زووانە ئازادی بکەن. زۆر ڕێی تێدەچوو بەر لە تیـرباران کـردنی، هەمـوو ڕووداوی گـرتن و لێکۆڵینەوەی لەگـەڵدا دووبارە بکەنەوە. ئەوەی گـومـانی ناوێ ئەوەیە کـە مـردن لە کـاتی

دیاریکراوی خۆیدا نایەت. بە پێی نەریت – نەریتی نەگوتراو: پیاو بە شێوەیەک دەیزانی هەرچەندە نەشی بیستبوو – هەموو جارێ، لە پشتەوە خەڵکیان تیرباران دەکرد و هەموو جارێکیش بە پشتە سەریانەوە دەنا. کاتێ لە ژوورێکەوە، بە کۆریدۆرەکەدا بۆ ژوورێکی تریان دەبردی، بێ ئەوەی ئاگات لێ بێ، فیشەکێکیان دەنا بە پشتی سەرتەوە.

ڕۆژێ – ڕەنگە گوتنی "ڕۆژێ" هەڵە بێ؛ هێندەی ڕێی تێ دەچوو ڕۆژ بێ هێندەش ڕێی تێ دەچوو شەو بێ: جارێکیان – لە زیندە خەونێکی سەیر و خۆشدا بوو. بە کۆریدۆرەکەدا دەڕۆیشت و چاوەڕوانی فیشەکەکە بوو. دەیزانی لە هەر ساتێکدا بێ دەتەقێندرێ. هەموو شتێ، دوای بزاوتن، کشومات بوو. نە دوودڵی مابوو نە نارەزایی و نە ئازار و نە ترس. هەستی بە لەشساغی و بەهێزی خۆی دەکرد. بە کاوەخۆ دەڕۆیی و دەتگوت لە بەر هەتاودا ڕێ دەکا. ئیدی لە کۆریدۆرە تەنگەبەرە سپییەکانی وەزارەتی ئەوین نەبوو. بە شارێی بەر خۆردا دەڕۆیی کە یەک کیلۆمەتر بەرین بوو. دەتگوت بە دەم نەشئەی عەقڵبەری مۆرفینەوە هەنگاو دەنێ. لە سەرزەمینی زێڕین بوو، بە درێژایی چەمەنزارێکی پڕ لە کەروێشک، ملی ڕێی گرتبوو. هەستی بە نووکی گیایە کورتەکانی لە بن پێیدا و تیشکی خۆری لە ڕوخساریدا دەکرد. لە قەراغی چەمەنزارەکەدا، دارەبەن بەدەم کزەباوە دەلەرانەوە. لەودیویش، چۆمێک بوو. چالاوە سەوزەکانی قەراغی، لە بەر سێبەرەکاندا، ماسی ورد وردیان تێدا بوو.

لە پڕێکدا، بە دەم ترسەوە ڕاپەڕی. عارەقەی بە بڕبڕەپشتدا دادەچۆڕا. لە دەنگی خۆی وەئاگا هات. هاواری دەکرد:

– جولیا! جولیا! جولیای خۆشەویستم! جولیا!.

ساتەوەختێک، هەستێکی بەتینی بەوە دەکرد کە جولیای بەلاوە بێ. هەر بە لایەوە نەبوو، بەڵکو لە ناخیدابوو. دەتگوت بووە بە بەشێکی پێستیشی. لەو دەمەدا،لەو کاتانەی خۆشتر دەویست کە بە سەربەستی پێکەوە بوون.هەر ئەو ساتەش بۆی دەرکەوت کە هێشتا ماوە و لە جێیەکدایە و یارمەتی لێ دەوێ.

لە سەر قەرەوێڵەکە ڕاکشا و هەوڵی دەدا حەواسی خۆی کۆ کاتەوە. چی بە خۆی کرد؟. بە هۆی ئەو ساتە لاوازییەوە چەند ساڵی خستە سەر دیلێتی خۆی؟.

دەبێ تاوێکی دی دەنگی پێلاو لە دەرەوەڕا بژنەوێ. لێ ناگەڕێن تاوانی وا، بە بێ سزادان بگوزەرێ. دەبێ ئێستا بزانن. ئەگەر زووتر نەیانزانیبێ ئێستا دەزانن. ئەو



پەیمانەی شکاند کە لەگەڵیاندا لە سەری پێک هات. بە گوێی حیزبی نەکرد، بەڵام ڕقیشی هەر لێی بوو. ڕۆژانی زوو، باوەڕی یاخیگەرێتی خۆی لە ژێر چارشێوی هاوڕەنگیدا دەشاردەوە. ئێستا هەنگاوێ چۆتە دواوە. بە هۆش، خۆی بە دەستەوە دابو بەڵام هومێدی بەوە مابوو کە هەستی ناوەوەی نەشێوابێ. دەیزانی بە هەڵەدا چووە، بەڵام وای پێ خۆش بوو. پێی دەزانن – ئۆبراین پێی دەزانێ. بەو هاوارە کەرانەیە دانی پێدا نا.

دەبێ لە سەرەتاوە دەست پێ بکاتەوە. ڕەنگە چەندین ساڵ بخایەنێ. دەستی بە سەروچاویدا هێنا و هەوڵی دەدا ئاشنایەتی لەگەڵ شێوازە نوێیەکەی خۆیدا پەیدا بکا. چاڵ کەوتبووە سەر ڕوومەتی. ئێسکی ڕوومەتی زەق و لووتی مەیلەوتەخت بوو. لەو کاتەوە کە دواجار خۆی لە ئاوێنەدا دیبوو تاخمە ددانی بۆ کرابوو. ئەگەر نەزانی سیمات چۆنە زەحمەتە بتوانی ئاگاداریی لێ بکەیت. بە هەرحاڵ، دەسلێدانی ڕوومەتی بەس نەبوو. بۆ یەکەمین جار زانی: ئەگەر بتەوێ شتێ بە نهێنی ڕاگریت دەبێ لە خۆشت نهێنی بێ. دەبێ هەمیشە وریا بیت تا لە کاتی نا پێویستدا لە ناو هەستی ئاگایانەوە سەر دەرنەهێنێ. لەم ساتە بە دواوە، نەک تەنها دەبێ چاک بیر بکاتەوە، بەڵکو دەبێ چاک هەست بکا و چاکیش خەون ببینێ. دەبێ هەموو دەمێ ڕقی خۆی لە ناخیدا بە سەرمۆری، وەک تۆپێک کە سەر بە جەستەی بێ و پێوەی نەلکابێ، ڕاگرێ – وەک زراو.

ڕۆژێک بڕیاری تیربارانکردنی دەدەن. نەدەزاندرا کەنگێ ئەنجام دەدرێ. بەڵام لەوانەیە چەند چرکەیەک پێشتر درکی پێ بکرێ. هەمیشە لە پشتەوەڕا ئەنجام دەدرا. ئەو دەمەی بە کۆریدۆرەکەدا ڕەت دەبێ ئەنجام دەدرێ. لەوانەیە دە چرکەی بەس بێ. لەو ماوەیەدا، دنیا لە ناخیدا ژێر و ژوور دەبێ. دوای ئەوە کتوپڕ، بێ ئەوەی وشەیەکی بە زاردا بێ، بێ ئەوەی دەسەڵاتی بە سەر هەنگاویدا بشکێ، بێ ئەوەی شێوەی سیمای تێک چێ – کتوپڕ هەیکەلی پڕ لە نهێنی دەڕمێ!. کۆگاکانی ڕقی دەتەقێنەوە. ڕق، وەکو تیشکێکی مەزن گشت جەستەی دادەگرێ. لە هەمان ساتدا – فیشەکەکە دەتەقێندرێ. بێ ئەوەی مێشکی چاک بکەنەوە تەفروتونای دەکەن. هۆشی یاخیگەرێتی، بە بێ سزادان و کەفارەت، بۆ هەمیشە لە دەستیان دەرباز دەبێ. کەلێنێک دەخەنە (تەواوەتی) خۆیانەوە. مردن لەو دەمەدا کە ڕقت لێیانە، ئازادییە.

چاوی داخست. چاوداخستنی لە جڵەوکردنی هۆشی خۆی پێ گرانتر بوو. مەسەلە خۆ سەرشۆڕکردن بوو. دەبوو خۆی بخاتە پیسترین زبڵدانەوە. دەبوو بە ناو پیسی پیساییدا

ڕۆچێ. چی لە هەموو شتێ سامناکتر و قێزەونتر بوو؟ بیری لە ڕێبەری گەورە کردەوە. چارەی دێوئاسای (کە دیبووی، هەمیشە بە پانایی مەترێ بیری لێ دەکردەوە)، بەو سمێڵە ڕەشە پڕەوە و ئەو چاوانەوە کە بۆ هەرکوێ بچووبای لێت ڕادەمان، لە خۆڕا بە خەیاڵیدا هات. هەستی ڕاستەقینەی لە حاست ڕێبەری گەورەدا چۆن بوو؟.

دەنگی هەنگاوی قورس لە کۆریدۆرەکەوە پەیدا بوو. دەرگا پۆڵاینەکە، بە دەم دەنگێکی ڕەقەوە کرایەوە و دوای ئەوە، ئۆبراین و ئەفسەرە ڕوخسار مۆمەکە و گاردی بەرگ ڕەش بەژوور کەوتن.

ئۆبراین گوتی: هەستە وەرە ئێرە.

وینستۆن بەرانبەری ڕاوێستا. ئۆبراین، بە دەستە بەهێزەکانی شانی گرت و کەمێ تاوتوێی کرد و گوتی: "بیرت لە فریودانم دەکردەوە. کەرایەتی بوو. ڕاست بوەستە. تەماشای چاوم بکە". کەمێ بێدەنگ بوو. پاشان بە نەرمییەوە گوتی: "خەریکە پێش دەکەویت. کەمێ عەیبیت تێدا ماوە. تەنها لە لایەن سۆزەوە لە دواوەی. وینستۆن پێم بڵێ – لە بیرت بێ درۆ نەکەی. خۆت دەزانی لە ئاشکراکردنی درۆدا توانایەکی چاکم هەیە – پێم بڵێ هەستی ڕاستەقینەت بەرانبەر ڕێبەری گەورە چۆنە؟".

– ڕقم لێیەتی.

– ڕقت لێیەتی. زۆر باشە. کەوابێ کاتی ئەوەت هاتووە دواهەنگاو بنێی. دەبێ ڕێبەری گەورەت خۆش بوێ. هەر بەگوێکردنی بەس نییە. دەبێ خۆشت بوێ.

دەستی لە سەر شانی هەڵگرت و بەرەو گاردەکان پاڵێکی پێوە نا و گوتی:

– ژووری (١٠١).



## ٥

وینستۆن لە هەموو ساتێکی ماوەی گرتنیدا دەیزانی، یا پێی وابوو کە دەزانێ لە کوێیە بینا بێ پەنجەرەکەدایە. ڕەنگە جیاوازییەکی کەم لە پاڵەپەستۆی هەوادا بووبێ. ئەو ژوورانەی کە گاردەکان تیایاندا ئەشکەنجەیان دەدا، لە خوار ڕووی زەوییەوە بوون. ئەو ژوورەی کە ئۆبراین تیایدا لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکرد زۆر لە جێیەکی بڵند، لە نزیکی سەربانەکە بوو. ئەم جێیەی ئێستای، هێند لە بنی زەویدا بوو کە لەوە زیاتر نەدەبوو.

ئەم ژوورە لە هەموو ژوورەکانی دی گەورەتر بوو. بەڵام زۆر گوێی بە دەوروبەر نەدەدا. ئەوەی تێبینی کرد تەنها دوو مێزی گچکە بوو کە بەرانبەری دانرابوون. هەردووکیان ڕووپۆشی سەوزیان بە سەردا درابۆوە. یەکێکیان، یەک دوو مەترێ لێوەی دوور بوو و ئەوی تریان لەوسەرەوە، بە لای دەرگاکەوە بوو. خۆشی، بە کورسییەکەوە وا شەتەک درابوو کە سەریشی پێ وەرنەچەرخێ. بالیفچەیەکیان لە پشتی سەری دانابوو و فشاری دەدا، و بەرەو پێشی خۆی دەڕوانی.

ماوەیەک تەنها بوو. دەرگا کرایەوە و ئۆبراین وەژوور کەوت. گوتی: "جارێ پرسیارت لێ کردم کە دەبێ ژووری ١٠١ چی لێ بێ . منیش پێم گوتی دەیزانیت. هەموو کەس دەیزانێ. ئەوەی لە ژووری ١٠١دا هەیە خراپترین شتی دنیایە". دیسان دەرگا کرایەوە و گاردێک وەژوور کەوت. شتێکی – قەفەز یا سەبەتەی پۆڵا – ی بە دەستەوە بوو. لە سەر مێزەکەی ئەوسەرەوەی دانا، بەڵام لە وینستۆنەوە دیار نەبوو چونکە ئۆبراین جۆرێ وێستابوو لێی پەنهان بێ. ئۆبراین گوتی: "خراپترین شتی دنیا بۆ هەرکەسە و شتێکە. لەوانەیە زیندەبەچاڵکردن بێ، سووتاندن بێ، نقومکردن بێ، تیغ بێ. پەنجا شێوەی تریش. شتی تریش هەن کە زۆر ئاسایین بەڵام چارەنووسسازن".

ئۆبراین کەمێ کەوتە کەنارەوە و وینستۆن ئامێرەکەی لە سەر مێزەکە دەدی. قەفەزێکی درێژۆکە بوو و دەسکێکی پێوە بوو. لە سەرێکیشەوە شتێ چەسپ کرابوو کە بە نیقابی شەڕەشمشێر دەچوو. لایە کراوەکەی ڕووی لە دەرەوە بوو. هەرچەندە قەفەزەکە سێ – چوار مەتر لە وینستۆنەوە دوور بوو بەڵام زانی کە دوو بەشە و هەر بەشەیان گیاندارێکی تێدایە. جرج بوون. ئۆبراین گوتی: – خراپترین شتی دنیا بۆ تۆ جرجە.

وینستۆن، هەر کە یەکەم جار چاوی بە قەفەزەکە کەوتبوو، لەرزێکی بێ ئامانی بە

جەستەدا گەڕابوو و نەشیدەزانی لە ترسی چییە. بەڵام وا کتوپڕ و لەخۆڕا، مەبەست لەو نیقابە ئاشکرابوو. دەتگوت هەناوی دەتوێتەوە و دەبێ بە ئاو. بە جۆرێ قیژاندی، دەتگوت قوڕگی دەپچڕێ:

– نایکەی، شتی وا ناکەی!. مەحاڵە!.

– ئەو ساتە ترسناکانەت بیرن کە لە خەونەکانتدا تووشیان دەبووی؟. وەک دیوارێکی تاریکی وابوو کە بەرانبەرت هەڵچندرابێ و گوێت لە دەنگێکی وەک تەقینەوە دەبوو. شتێکی سامناک لەودیو دیوارەکەوە بوو. دەتزانی کە دەزانی چییە، بەڵام نەتدەوێرا ڕاستی دەربخەی. ئەوانەی ئەودیو دیوارەکە جرج بوون.

وینستۆن لە کاتێکدا هەوڵی دەدا دەسەڵاتی بە سەر دەنگی خۆیدا بشکێ، گوتی: – ئۆبراین! خۆت دەزانیت کە پێویست ناکا ئەمەم لەگەڵدا بکەی. چت دەوێ بیکەم؟.

ئۆبراین وەڵامێکی ئاشکرای نەدایەوە. قسەکانی بە قسەی بەڕێوەبەری قوتابخانە دەچوو. بە دەم بیرکردنەوەوە چاوی لە خاڵێکی دوور بڕی و دەتگوت گوێگرەکانی لەودیو وینستۆنەوە دانیشتوون.

– ئازار، بە تەنێ مەرج نییە بەس بێ. هێندێ جار مرۆ هەتا سەرەمەرگ بەرگەی ئازار دەگرێ. بەڵام بۆ هەرکەسە و شتێ هەیە کە بەرگەی ناگرێ. شتێ کە لە توانای خەیاڵیدا نییە. مەسەلەکە چ پەیوەندی بە ئازایەتی و ترسنۆکییەوە نییە. ئەگەر لە جێیەکی بڵندەوە بەربیتەوە، لەپ کوتانت بە دوای پەتێکدا تا چنگی لێ گیر کەی ترسنۆکی نییە. ئەگەر لە قووڵایی ئاوەوە دەرکەوی، کە سییەکانت پڕ با دەکەی ترسنۆکی نییە. ئیدی ئەوە غەریزەیە و لە بەین نابرێ. هەمان مەسەلە بۆ جرجیش ڕاستە. بەرگەیان ناگریت. جۆرە فشارێکن و دەخرێنە سەرت و بەریانت پێ ناگیرێ. هەرچیت لێ بویسترێ دەیکەی.

– بەڵام دەتەوێ چی بکەم؟. ئەگەر نەزانم چییە چۆنی بکەم؟.

ئۆبراین قەفەزەکەی هەڵگرت و لە سەر مێزە نزیکەکە، بە کاوە خۆ داینا. وینستۆن گوێی لە وژووژی خوێنی خۆی بوو. هەستی دەکرد، تاک و تەنها، وێڵی بیابانێکی کاکی بە کاکی بووە. بیابانێکی ڕووناک، و لەوسەرەوە، لە دوور دوورەوە دەنگی هەمەچەشنەی دەبیست. لەگەڵ ئەوەشدا، دوو مەتر پتر لە نێوان خۆی و جرجەکاندا نەبوو. دوو جرجی زل بوون. لەو تەمەنەدابوون کە لمۆزیان زل دەبێ و ڕەنگیان لە خۆڵەمێشییەوە قاوەیی دەبێ.

ئۆبراین کە هەر ڕووی لە گوێگرە نادیارەکانی بوو گوتی: "هەرچەندە جرج لە گیاندارە



قرتێنەرەکانە، بەڵام گۆشتخۆریشە. واتای ئەوە دەزانیت. ئاگاداری ڕووداوی گەڕەکە هەژارنشینەکان هەیت. لە هێندێ گەڕەکدا ژنان ناوێرن منداڵی خۆیان، بۆ ماوەی پێنج دەقیقەش بە تەنها جێ بهێڵن. بێگومان جرج هێرشیان بۆ دەبەن و پێست و گۆشتیان پێوە ناهێڵن. هێرش دەبەنە سەر نەخۆش و ئەوانەی کە لە گیانەڵڵادان. خەڵکی بێ توانا دەناسن.

زیکەیەک لە قەفەزەکەوە پەیدا بوو. دەتگوت لە جێیەکی دوورەوەڕا بەر گوێی وینستۆن دەکەوێ. جرجەکان بە شەڕ هاتبوون و لەمدیو و ئەودیوی دیوارێکی نێوانیانەوە پەلاماری یەکیان دەدا. ناڵەیەکی بێ هومێدیشی بیست. پێ دەچوو ئەو ناڵەیەش لە جێیەکی دوورەوە هاتبێ.

ئۆبراین قەفەزەکەی هەڵگرت. فشاری خستە سەر شتێکی و دەنگێکی قایم هات. وینستۆن، بۆ خۆ دەربازکردن کەوتە هەڵپلکان. بەڵام بێ هوودە بوو. هەموو ئەندامی لەشی، تەنانەت سەریشی شەتەک درابوو. ئۆبراین قەفەزەکەی لێ نزیک خستەوە. نێوانیان یەک مەتر کەمتر بو.

– پەنجەم بە یەکەم میلدا نا. دیارە دەزانیت ئەم قەفەزە چۆن چۆنی دروست کراوە. نیقابەکە بە جۆرێ لە سەرت دەنیشێ کە درزی تێ نەکەوێ. کە دەست بە میلی دووەمدا بنێم، دەرگای قەفەزەکە دەچێتە سەرێ و ئەم جانەوەرە برسییانەش وەک گزگل دەردەپەڕن. جرجت دیوە چۆن باز دەدا؟. ڕێک بۆ دەموچاوت باز دەدەن و دەست بە هەڵکۆڵینی دەکەن. هێندێ جار، یەکەم هێرش بۆ چاو دەبەن. هێندێ جار ڕوومەت کون دەکەن و دەچن زمان دەردەهێنن.

قەفەزەکە نزیک دەبووەوە. جیڕەجیڕ بەر گوێی وینستۆن دەکەوت. دەتگوت لە عاسمانەوە، لە ژوور سەریەوە جیڕەجیڕ دێ. بەڵام بێ هوودە هەر هەوڵی دەدا. بیرکردنەوە و بیرکردنەوە، تاکە هیوایەک بوو تا دوا چرکە – بیرکردنەوە تاکە هیوای دەربازبوون بوو. کتوپڕ بۆنی کەسکوون و ناخۆشی جرجەکانی بۆ هات. دڵی تێک چوو و زۆری نەما ببوورێتەوە. هەموو شتێ لەبەرچاوی تاریک بوو. ماوەیەکی کەم، بوو بە جانەوەرێکی هاری بە هاوار. لەگەڵ ئەوەشدا، لە تاریکایی هاتە دەرێ و خۆی بە خەیاڵێکەوە بەند کرد. تەنها و تەنها، یەک ڕێگەی دەربازبوونی شک دەبرد. دەبوو مرۆڤێکی دی، هەیکەلێکی دی بکاتە حایلی نێوان خۆی و جرجەکان.

نیقابەکە هێندە گەورە بوو کە هەموو شتێ لەبەرچاوی وینستۆن بزر بکا. دەرگای قەفەزەکە یەک دوو بست لێوەی دوور بوو. جرجەکان دەیانزانی کاری داهاتوویان چی دەبێ. یەکێکیان هەڵدەبەزایەوە. ئەوی تریشیان لە سەر پاشوو وێستابوو و دەستە گۆشتنەکانی بە قەفەزەکەوە گرتبوون و بۆنی بە هەواوە دەکرد. وینستۆن، ددانە زەردەکانیان و سمێڵیانی دەدی. ترسی ڕەشی لێ نیشتەوە. نابینا و بێ دەسەڵات و نەزان بوو .

ئۆبراین، وەک هەمیشە بە شێوەی ڕێنماییەوە گوتی: "لە ئیمپراتۆریای چیندا ئەمە شێوە ئەشکەنجەیەکی ئاسایی بوو".

نیقابەکە، ڕوخساری وینستۆنی داپۆشیبوو. تەل بەر گۆنای دەکەوت. دواییش – نا، ئارامیی نەبوو، هیوایەکی پەتی بوو. تیشکێکی کزی ئومێدێ بوو. زۆر درەنگ، گەلێ زۆر درەنگ گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە وا لە هەموو جیهاندا تاکە یەک کەس هەیە کە لە بری ئەو سزا بدرێ – یەک هەیکەل، دەکرا بیبێتە حایلی نێوان ئەم و جرجەکان. وەک شێت هاواری کرد:

– ئەم بەڵایە بە سەر جولیادا بێنن!. من نا! جولیا! هەرچی لێ دەکەن باکم نییە. دەموچاوی ونجڕونجڕ بکەن، هەموو جەستەی هەڵدڕن. من نا! جولیا! جولیا! من نا!.

لە جرجەکان دوور دەکەوتەوە و بە قوولاییەکی گەورەدا دەچووە خوارێ. هەر بە کورسییەکەوە بەسترابۆوە بەڵام بە ژوورەکەدا، بە ناو دیواری بیناکەدا، بە سەر زەویدا، بە سەر ئۆقیانووسەکاندا، بە هەوادا، لە ناو گێژاودا، بە نێوان کاکێشان و ئەستێرەکاندا دەڕۆیشت و بۆ هەمیشە لە جرج دوور دەکەوتەوە. بەڵام ئۆبراینیشی هەر بە لاوە بوو، هەستی بە ساردیی تەلەکەی سەر ڕوومەتی دەکرد. لە ناو ئەو تاریکاییەدا کە دەوری تەنی بوو، گوێی لە چرکەیەکی تری میلێک بوو. زانی دەرگای قەفەزەکە داخرایەوە نەک کرابێتەوە!.



## ٦

(باری داربەڕوو) مەیلەو چۆڵ بوو. تیرێژی لاری هەتاو لە پەنجەرەیەکەوە، دەیدا لە مێزە خۆڵاوییەکان. سەعات پانزە بوو و کەم کەس بە دەرەوە بوون. ئاوازێکی هێمن لە تەلەسکرینەکەوە بڵاو دەکرایەوە.

وینستۆن لە جێیە هەمیشەییەکەی خۆی دانیشتبوو و چاوی لە پەرداخە بەتاڵەکەی بەردەمی بڕیبوو. جاروبارێ، سەری هەڵدەبڕی و سەیری سیما زەلامەکەی دەکرد کە بە دیوارەکەی ئەوبەرەوە هەڵواسرابوو. لە خواریەوە نووسرابوو: ڕێبەری گەورە سەرنجت دەدا. بێ ئەوەی داوا بکا، (بۆی)ەکە هات و پەرداخەکەی بۆ پڕ کرد لە (جن)ی سەرکەوتن. لە شووشەیەکی تریشەوە کە تەپەدوورێکی بە دەمەوە بوو و قامیشێکی باریکی لێوە دەرهاتبوو، یەک دوو دڵۆپ ساکەرینی تام مێخەکیشی بۆ تێکرد کە تایبەتمەندی بارەکە بوو.

وینستۆن گوێی بۆ تەلەسکرینەکە شل کردبوو. جارێ مۆسیقا بوو بەڵام ڕێی تێ دەچوو لە هەر ساتێکدا بێ، ڕاگەیاندنی وەزارەتی ئەوین بڵاو بکرێتەوە. دەنگوباسی بەرەی شەڕ لە ئەفریقیا دڵخۆشکەر نەبوو. لە بەر ئەوە، هەموو ڕۆژەکەی بە پەژارەوە بە سەر بردبوو. سوپای ئەوروئاسیا (ئۆقیانووسیا لەگەڵ ئەوروئاسیادا تێکیان گیر کردبوو، هەمیشە پێکەوە لە جەنگدا بوون) شێتانە و بە پەلە بەرەوخوار ببوونەوە.

لە بەرنامەکانی نیوەڕۆدا ناوی چ ناوچەیەکی تایبەتی نەهێندرابوو بەڵام ڕێی تێ دەچوو شەڕ لە لووتەی کۆنگۆ دەستی پێ کردبێ. بەرازاڤیل و لیۆپۆدڤیل لە مەترسیدا بوون. پێی نەدەویست سەیری نەخشە بکەی تا بزانی چ قەوماوە. مەسەلەکە هەر ئەوەندە بوو کە ناوەڕاستی ئەفریقیا لە دەست بچێ: لە ماوەی جەنگدا، بۆ یەکەم جار ناوچەکانی ناو سنووری خودی ئۆقیانووسیا دەکەوتنە مەترسییەوە.

پەژارەیەکی گران، نا، ترس نەبوو بەڵام هەڵچوونێکی تایبەتی بوو کە لە ناخیەوە سەری هەڵدا و دوایی دامرکایەوە. وازی لە بیرکردنەوە، لە بارەی شەڕەوە هێنا. ماوەیەک نەیدەتوانی حەواسی خۆی کۆ بکاتەوە و بیر لە شتێکی دیاریکراو، بۆ ماوەیەکی کەم نەبێ، بکاتەوە. پەرداخەکەی هەڵگرت و بینی پێوە نا. وەک هەمیشە (جن)ەکە تەزووی پێدا هێنا و خستییە بارێکی مەیلەو بێهۆشییەوە. شتێکی ناخۆش بوو. ئاوی مێخەک کە

بەخۆی دڵی لێ تێک دەچوو، بە سەر بۆنی تیژی چەوریدا زاڵ دەبوو. لە هەمووی ناخۆشتر بۆنی جن بوو کە ببوو بە هاودەمی شەو و ڕۆژی و لە خەیاڵیدا تێکەڵاوی بۆنی هینەکان دەبوو.

هەرگیز، تەنانەت لە خەونیشدا ناوی نەدەبردن. هەتا پێشی بکرابا وێنەشی لە بەرچاو نەدەهێشتن. لە بوونیان نیوە بێخەبەر بوو. لە بەردەمیدا چاوچاوێنیان دەکرد، بۆنیان لە کونەلووتیدا نەدەبڕا، جن گەیشتبووە ناقرگەی، لێوە مۆرەکانی پڕمەیان دەکرد. لەو ساوە کە ئازاد ببوو، قەڵەو ببوّوە و ڕەنگی پێستای لێ نیشتبوو - ئا، بەڵام فایدەی چی. سەروچاوی باریک ببوو، پێستی سەر لووتی و ئێسکی گۆنای سوورخن ببوو. تەنانەت ڕەنگی پێستی سەریشی زیاد کاڵ بوو. بۆیەکە، ئەم جارەش بێ ئەوەی پێی بگوترێ، تەختە شەترەنجێک و ڕۆژنامەیەکی (تایمز)ی بۆ هێنا. پاشان، کە پەرداخەکەی بە بەتاڵیی دی، شووشە جنێکی هێنا و بۆی پڕ کرد. پێی نەدەویست داوا بکا، ئەو بەخۆی عادەتی دەزانی. هەمیشە تەختە شەترەنجی لە خزمەتدا بوو. مێزی قوژبنەکە، هەمیشە بۆ ئەو تەرخان کرابوو. با بارەکە قەرەباڵغیش بوایە، هەر بۆ ئەو دەبوو چونکە کەس نەیدەویست لە نزیکیەوە دانیشێ. هەرگیز گوێی بە ژماردنی پێکەکانی نەدەدا. جاروبارێ، قاقەزێکی چڵکنیان لە بەردەمیدا دادەنا کە پێی دەگوترا حسێبی خواردنەوە. بەڵام پێی وابوو کە هەمیشە کەمتری بۆ حسێب دەکەن. واش نەبوایە چ فەرقێکی نەدەکرد. ماوەیەک بوو هەمیشە پارەی زۆر بوو. کارە تازەکەی دەسکەوتی لەوەی پێشووتری زیاتر بوو.

مۆسیقای تەلەسکرینەکە بڕا و دەنگێ پەیدا بوو. وینستۆن سەری هەڵبڕی تا گوێ بگرێ. بەڵام دەنگوباسی جەنگ نەبوو. ڕاگەیاندنێکی کورتی وەزارەتی فراوانی بوو. ڕاگەیاندرا کە ڕادەی بەرهەمهێنانی قەیتانی پێڵاو، لە دەیەم پلانی سێ ساڵەدا، لە سەدا ٩٨ زیادی کردووە.

بە دیار شەترەنجەکەوە ڕاما و ئالەتەکانی دانان. گەمەیەکی ئاڵۆز بوو و دوو ئەسپ تووش ببوون. نۆرەی سپییە و دوای دوو بزواندن (مات) دەکا. وینستۆن سەری هەڵبڕی و تەماشای وێنەکەی ڕێبەری گەورەی کرد. هەمیشە سپی مات دەکا. هەموو دەمێک و هەمیشە وا بووە. لە سەرەتای دروستبوونی دنیاوە هەرگیز، لە هیچ گەمەیەکدا ڕەش براوە نەبووە. ئەدی ئەمە یاسایەکی نەمری سەرکەوتنی چاکە نییە بە سەر خراپەدا؟. دەموچاوە گەورەکە سەیری دەکرد و چاوی پڕ بوون لە هێزێکی هێمن. هەمیشە سپی (کش مات) دەکا.



دەنگی تەلەسکرینەکە بە دەنگێکی بە جۆش و خرۆشتر گۆڕا: "ئاگادارتان دەکەینەوە کە لە کاتژمێری پانزە و سی دەقیقەدا هەواڵێکی گرینگتان پێ ڕادەگەیەنین. هەواڵەکە زۆر گرینگە. لە بیرتان نەچێ. پانزە و سی دەقیقە!" و ئاوازێکی ئارامی بە دوودا هات .

وینستۆن، دڵی داخورپا. هەواڵی بەرەی شەڕ بوو؛ لەخۆڕا دەیزانی هەواڵێکی ناخۆش دەبێ. هەموو ئەو ڕۆژە خەیاڵی شکستهێنان لە بەرەی ئەفریقیادا، مێشکی تەنیبوو. دەتگوت بە بەر چاوی خۆیەوە، لەشکری ئەوروئاسیا وەک کوللە و مێروولە هەڵدەڕژێنە ئەفریقیاوە و خەتی لە شکاندن نەهاتوو دەشکێنن و سنوور دەبەزێنن. بۆ لە پشتەوە دەستیان لێ ناوەشێنن؟. نەخشەی ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیای لە خەیاڵدا بوو. سەربازێکی سپی هەڵگرت و بزواندی. دەبێ ئا ئە لەو جێیە بێ!. کە ئۆردووی ڕەشی دی بەرەو خوار دەبنەوە، چاوی لێ بوو ئۆردوویەکی تریش لە پشتیانەوە گردبوونەوە و ڕێی دەریا و زەوییان لێ گرتن . هەستی کرد بە مەیلی خودی خۆی هێزەکەی دی ڕاوێستا. بەڵام دەستوبرد پێویست بوو. ئەگەر دەست بە سەر هەموو ئەفریقیادا بگرن، ئەگەر فڕگە و بنکەی غەواسیشیان لە لووتەی ئەفریقیادا هەبێ، ئۆقیانووسیا دەکرێتە دوو بڕەوە. ئەمەش بە زۆر شێوە لێک دەدرێتەوە: شکست، لەناوچوون، دابەشکردنەوەی جیهان، تێداچوونی حیزب!. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. هەستی هەمەچەشنە تێی وروژان - بەڵام نا، هەمەچەشنە نەبوو؛ پاشماوەی هەستی کۆکراوە بوو کە نەدەکرا بزاندرێ کامە هەستی بنی بنەوەیە - تێیدا دەکولا.

هێرش برایەوە. سەربازە سپییەکانی گێڕایەوە، بەڵام بە تەواوی نەیدەتوانی بیر لە گەمە بکاتەوە. سەرلەنوێوە خەیاڵی لە شەققەی باڵی دا. بێ ئەوەی بە تەواوی ئاگای لێ بێ، بە نووکی پەنجە، لە گەردی سەر مێزەکەی نووسی:

٢ + ٢ = ٥[٢٥]

جولیا گوتبووی: "ناتوانن بچنە ناو ناختەوە". بەڵام دەتوانن. ئۆبراین گوتبووی: "ئەوەی لێرە بە سەرتدا دێ هەمیشەییە". ڕاستی کرد. داغمەی کردارت پێتەوەیە و لێت نابێتەوە. شتێک لە ناو سینگتدا مردووە، سووتێندراوە، داغ کراوە.

جولیای دیبوو. تەنانەت قسەشی لەگەڵدا کردبوو. چ جێی مەترسی نەبوو ئەوە بکا. لە خۆڕا دەیزانی کە چ کاریان بە کرداری ئەو نەداوە. ئەگەر حەزیان بکردبا دیداری تریشیان

٢٥- لە دەقە ئینگلیزییەکەدا نووسراوە: ٢+٢=٥ بەڵام لە سویدییەکە نووسراو:٢+٢=

ساز دەکرد. لە ڕاستیدا، بە ڕێکەوت یەکیان دی. لە باخچەیەک یەکیان دی. ڕۆژێکی سەرمای دواداویی مارت بوو. زەوی وەک ئاسن بەستبووی و شوێنەواری ژیان بە گیاوە دیار نەبوو. چەند بنە زەعفەرانێ نەبێ چ گوێکە دیار نەبوو. زەعفەرانەکان خۆیان لێ ڕاکێشابوو تا بای سارد لەبیریان بکا. وینستۆن بە دەستی تەزیو و چاوی فرمێسکاوییەوە دەڕۆیی. جولیای لە دووری دە مەتر کەمترەوە فەرق کرد. دیتی، گەڕایەوە و دووی کەوت. دەیزانی کە هیچ مەترسییەک لە ئارادا نییە. کەس گوێی پێ نەدەدان. جولیا قسەی نەدەکرد. ڕێی خۆی بە ناو گیایەکەدا گرتبووە بەر. دەتگوت دەیەوێ لە دەستی وینستۆن دەرباز بێ. پاشان، دەیویست بە پەنایەوە بێ. لە پڕێکدا، لە پەنای هێندێ درەختی ڕووتاوە کە نە دەیشاردنەوە نە سەرمای لێ گل دەدانەوە، لە جێی خۆیاندا وێستان. سەرماکەی بێ ڕەزا بوو. با، بە ناو چڵەکاندا گڤەی دەهات و خۆی بە زەعفەرانەکاندا دەدا. وینستۆن، باوەشی بە ناوقەدیدا کرد.

تەلەسکرینی لێ نەبوو بەڵام بێ گومان مایکرۆفۆنی شاردراوەی لێ بوو. دوور نەبوو ببیندرێن، بەڵام گرینگ نەبوو. دەیانتوانی پاڵ کەون و بیانویستبا دەشیانتوانی بیکەن. وینستۆن بەو بیرکردنەوەیە لەرزی لێ هات. جولیا کاردانەوەی پێشان نەدا و هەوڵیشی نەدا خۆی لە باسکی وینستۆن ڕەها بکا. ئیدی وینستۆن زانی کە جولیا چی تێدا گۆڕاوە. ڕەنگی زەردتر بوو. جێی برین بە ناوچەوان و لاجانییەوە بوون بەڵام قژی هەندێکی لێ داپۆشیبوون. گۆڕانی ڕاستەقینەی جولیا ئەوە نەبوو. گۆڕانی سەرەکی لەوەدا بوو کە ناوقەدی ئەستوورتر بوو و وەک بەردی ڕەق وابوو. بیری کەوتەوە کە جارێ، دوای بۆمباران، تەرمێکی لە ژێر کەلاوەی ڕووخاوەوە دەرهێنا. ئەو تەرمە، لە ڕادە بە دەر سەرسامی کردبوو. هێندەی بە بەرد دەچوو بە بنیادەم نەدەچوو. لەشی جولیاش وا بوو.

بیری لە ماچکردنی نەکردەوە. قسەشیان نەدەکرد. کە بە ناو گیایەکەدا گەڕانەوە، جولیا بۆ یەکەم جار تەماشای کرد. تەماشاکردنێکی کاتیی بوو، پڕ بوو لە ڕق و سووکایەتی. وینستۆن لە خۆی دەپرسی کە دەبێ ئەو ڕقە بۆ سەرچاوەی ڕابردوو بگەڕێتەوە یا بە هۆی سەرما و ڕوخساری ئاوساو و چاوی بە بای سارد ئاوتێزاوەوە بووبێ. لە سەر دوو کورسی ئاسنین بە لای یەکەوە، بەڵام زۆر نزیک نا، دانیشتن. وینستۆن هەستی کرد جولیا دەیەوێ شتێ بڵێ. جولیا، یەکێ لە پێڵاوە شلوشاوەکانی چەند سانتیمەترێ بردنە پێشێ و چڵێکی شکاندەوە. وینستۆن پێی وا بوو پێی لە جاران پانتر بوون.



جولیا بە توندی گوتی: "داتم بە دەمەوە".

ئەویش گوتی:"منیش تۆم دا بە دەمەوە".

جولیا بە قینەوە سەیرێکی تری کردەوە:

– هێندێ جار هەڕەشەی شتێکت لێ دەکەن کە بەرگەی ناگریت. هەر ناتوانی بیریشی لێ بکەیتەوە. ئیدی دەڵێی: "ئەم کارە لەگەڵ مندا مەکەن. لەگەڵ یەکێکی تریدا بکەن. بە فلان و فیساری بکەن". ڕەنگە دوایی ئەو کارەی خۆت بە فێڵێ دانیی. ڕەنگە پێت وابێ ئەوەت هەر بۆ ئەوە گوتووە وازت لێ بێنن، و بە ڕاستت نەبووە. بەڵام نا، لە کاتەکەی دڵەوەت گوتووە. پێت وایە چ ڕێیەکی تری دەربازبوونت نییە. لە خودات دەوێ ئەو کارەساتە بە سەر یەکێکی تردا بێ. گرینگ نییە خەڵکی تر چییان لێ دێ. ئەوەی بیری لێ دەکەیتەوە هەر خۆتی.

وینستۆن بۆی سەندەوە: "ئەوەی بیری لێ دەکەیتەوە هەر خۆتی" .

– دوای ئەوە، هەمان هەستەکەی پێشووت بەرانبەر ئەو کەسە نامێنێ .

– نا، هەمان هەستی پێشووت نامێنێ.

دەتگوت هیچی تریان نییە لێی بدوێن. بایەکە، جلە تەنکەکانی بە جەستەوە دەنووساندن. بە بێ دەنگی دانیشتن. هێندەی نەبرد بێ دەنگیی وەڕسی کردن، جگە لەوەش، هێند سەرما بوو قسەیان پێ نەدەکرا. جولیا شتێکی لە بارەی فریاکەوتنی قەتاری ژێر زەمینەوە گوت و بە نیازی ڕۆیشتن هەستا.

وینستۆن گوتی: دەبێ یەک ببینینەوە.

جولیا گوتی: بەڵێ، دەبێ یەک ببینینەوە.

وینستۆن بە دوودڵییەوە کەمێ دووی کەوت. هیچی تریان نەگوت. لە ڕاستیدا جولیا نەیدەویست لە خۆی دووری بخاتەوە، بەڵام وا دەڕۆیشت کە وینستۆنی پێڕا نەگا. وینستۆن نیازی وا بوو تا وێستگەکە لەگەڵیدا بڕوا. بەڵام بەو سەرمایە، بە بێ مەعنا و بە زەحمەتی زانی. حەزی دەکرد بەرەو باڕی دار بەڕوو بگەڕێتەوە. ئارەزووی گەڕانەوەی بۆ ئەوێ، دوای دابڕانی لە جولیا، هەرگیز وا سواری سەری نەببوو. بە پەرۆشی جێیە هەمیشەییەکەیەوە بوو بە ڕۆژنامە و تەختەی شەترەنج و پەرداخی پڕ لە (جن)ەوە. لە هەمووی گرینگتر، ئەوێ گەرم بوو. هێندەی پێ نەچوو تاکوتەرای خەڵک کەوتنە نێوان خۆی و جولیاوە. دابڕانیان ڕێکەوت نەبوو بەڵکو خۆی وای دەویست. بە نابەدڵییەوە

دووی جولیا کەوتبوو. هەنگاوەکانی خاوتر کردنەوە. بەرەو دواوە بایدایەوە. لە چاوی بزر بوو. هەر یەکە لەو تاکوتەرا خەڵکە بە پەلەیە بەو دەچوو.

جولیا پێی گوتبوو: "لە کانگەی دڵەوەت گوتووە". بەڵێ وینستۆن لە کانگەی دڵەوەی گوتبوو. نەک هەر ئەوە بەڵکو ئارەزووشی دەکرد. حەزی دەکرد ئەو بخەنە بەردەستی ئەو...

ئاوازی مۆسیقای تەلەسکرینەکە گۆڕا. ئاهەنگێکی تێکشکاوی وشک و گاڵتەجاڕی زەرد جێی گرتەوە. پاشان - ڕەنگە وا نەبووبێ، لەوانەیە خەیاڵ بووبێ - دەنگێ بوو و گۆرانی دەچڕی:

لە ژێر داربەڕووە گەورەکەدا،

من تۆم فرۆشت، ئەتوش من

ئاو بە چاوی وینستۆندا چۆڕاوگەی بەست. بۆیەکە، سەرنجی چووە سەر پەرداخە بەتاڵەکەی و بە شووشە (جن)ێکەوە، بەرەولای هات.

پەرداخەکەی هەڵگرت و بۆنێکی کرد. شتێ بوو، لەگەڵ هەر قومێکیدا تامی ناخۆشتر دەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا لێی ببوو بە شتێ کە مەلەی تێدا بکا. ژیان و مردن و زیندووبوونەوەی بوو. هەر جن بوو کە هەموو شەوێ لە دەریای مەستیدا نقومی دەکرد. هەر جن بوو کە هەموو بەیانییەک ژیانی بۆ دەگەڕاندەوە. بە دەگمەن لە کاتژمێری یازدەدا، بە پێڵۆی قورس و زاری وەک ئاگر و بەدەم ئێشی پشتەوە بە ئاگا دەهات، لە بەر خاتری قاپێک و فینجانێ نەبوایە کە شەو بە لای قەرەوێڵەکەیەوە دایدەنان، ڕاستبوونەوەی مەحاڵ بوو. بە ڕۆژەوە، بە چاوی مۆن و شووشەیەکەوە گوێی لە تەلەسکرین دەگرت. لە سەعات پانزەوەڕا جێی خۆی لە باڕی داربەڕوودا خۆش دەکرد تا دادەخرا. ئیدی کەس گوێی بە کردەوەکانی نەدەدا. فیرەی شاور لە خەونی هەڵنەدەستاند. تەلەسکرین فەرمانی بە سەردا دەرنەدەکرد. حەفتەی دوو جاران لە وەخت و ناوەختدا، سەری لە دایەرەیەکی تۆزاوی و تەفروتونابووی وەزارەتی ڕاستی دەدا و هێندێ کاری - یا شتێ کە ناوی کاری لێ نرابوو - ئەنجام دەدا. کرابوو بە ئەندامی کۆمیتەیەکی لاوەکی لەو هەموو کۆمیتە زۆر و زەبەندانەی کە خەریکی چاپی فەرهەنگی گوتەی نوێ بوون. ئەرکی کۆمیتەکەی ئەمان شتێ بوو پێی دەگوترا ڕاپۆرتی سەردەمی ناوەڕاست. بەڵام هەرگیز نەدەزاندرا کە ڕاپۆرت لە بارەی چییەوە بێ. باسی ئەوە بوو کە چوکڵە لە ناو کەوانەدا بنووسرێ یا لە دەرەوەی. کۆمیتەکە، چوار ئەندامی تری تێدا بوون. هەرچواریان، لە هەمان بابەتی وینستۆن بوون.



هێندێ ڕۆژ گرد دەبوونەوە و دوایی زوو بڵاوەیان لێ دەکرد. بە ئاشکرا دەیانگوت کە چ کارێ نییە ئەنجامی بدەن. بەڵام هێندێ ڕۆژیش، بە جۆشو خرۆشەوە باسکیان لێ هەڵدەماڵی و پرۆتۆکۆلی دوور و درێژیان دەنووسی کە قەت تەواویشیان نەدەکرد. هەر جارێ کە بەزمی دەمەتەقێیان گەرم دەبوو و دەگەییە جێی کەلەبەر، جیاوازیی بۆچوونیان زەقتر دەردەکەوت و دەگەیشتە ئەوەی هەڕەشەی دەسەڵاتدارانی باڵا لە یەک بکەن. پاشان، کتوپڕ فس دەبوونەوە و بە دەوری مێزی کۆبوونەوەکەیاندا دادەنیشتن و بە چاوی عەبڵەقەوە لێک ڕادەمان. ئیدی دەتگوت جنۆکەن و لەگەڵ دەرکەوتنی گزینگی خۆردا غەیب دەبن.

تەلەسکرینەکە تاوێ بێ دەنگ بوو. دیسان وینستۆن سەری هەڵبڕی. هەواڵ!. بەڵام نا، مۆسیقاکەیان دەگۆڕی. نەخشەی ئەفریقیا بە سەر پەردەی خەیاڵیەوە بوو. جموجووڵی لەشکر بە دایەگرام دەچوو: تیرێکی ڕەش بە شێوەی ستوونی، بەرەو خوار دەبووەوە و یەکێکی سپیش کلکی بڕیبوو و بەرەو ڕۆژهەڵات دەکشا. وەک ئەوەی بیەوێ دڵنیا بێ، سەیرێکی وێنە گەورەکەی کرد. کێ دەڵێ تیرە سپییەکە هەر لە بنەڕەتدا بوونی هەیە؟.

دیسان کەیفی لێ نەما. قومە (جن)ێکی خواردەوە. سەربازێکی سپی هەڵگرت و هەرەکەتێکی پێ کرد. کش. بەڵام دیار بوو هەرەکەتەکەی ناتەواو بوو چونکە...

لەخۆڕا خەیاڵی ڕۆیشت. ژوورێک بە مۆم ڕووناک کرابۆوە. قەرەوێڵەیەکی گەورەی تێدا بوو کە بە چەرچەفێکی سپی داپۆشرابوو. بە خۆی منداڵێکی نۆ یا دە ساڵان بوو و لە سەر زەوییەکە دانیشتبوو. قوتووی مۆرەی ڕادەوەشاند و لە خۆشییاندا قاقا پێدەکەنی.

بێگومان یەک مانگ پێش ونبوونی دایکی بوو. ساتی هێوربوونەوە بوو. ساتێ بوو کە برسێتی زگی بیر چووبوو و سۆزی بەرانبەر دایکی بزوا بوو. ئەو ڕۆژەی چاک لە بیر بوو. باران وەک کوندەی سەرەوخوار تێی کردبوو و بە پەنجەرەدا باراناو چۆڕاوگەی دەبەست. ڕووناکی ژوورەکە بایی ئەوە نەبوو لە بەری بخوێندرێ. مانەوە لەگەڵ منداڵێکی گچکەدا، لە ژوورێکی تەنگ و تاریکدا، سنووری تاقەتی بەزاند. وینستۆن کەوتە هاتوهاوار. پەڵپی خواردنی دەگرت و هەرچی لە ژوورەکەدا بو تێکوپێکی دا. بە پێلەقە، هێندەی بە دیوارەکاندا کێشا، دراوسێ لەودیوەوە بە مشت وەڵامیان دەدایەوە و داوای کڕبوونیان لێ دەکرد. ئەو ماوەیە، منداڵە بچووکەکە بەردەوام دەگریا. لە ئەنجامدا دایکی پێی گوت: "دەی عاقڵ بە تا شتی گەمەت بۆ بکڕم. شتێکت بۆ دەکڕم بە دڵی خۆت بێ". بەو بارانە، چووە دوکانێکی نزیکی ماڵەکەی خۆیان کە هێشتا کراوە بوو. موقەبایەکی هێنا (مار و

قالّدرمه)ی تیّدا بوو. وینستۆن، بۆنی موقەبا تەڕەکەی هەر لە بیر بوو. یارییەکی قۆڕ بوو. موقەباکە قەلّەشی تێ کەوتبوو و مۆرەکانی هێند نالەبار دروست کرابوون، ڕێک نەدەوێستان. وینستۆن بە نابەدلّییەوە لیّی ڕاما. بەلاّم دایکی مۆمیّکی هیّنا و بە نیازی گەمەکردن، لە سەر عەرد لیّی دانیشت. زوو دەستەمۆی کردەوە. هەر کە مۆرەکەی بە قالّدرمەکەدا سەردەکەوت یا مارەکە بەرەو خالّی سەرەتای دەگیّڕایەوە، لە قاقای پیّکەنینی دەدا. هەشت دەست یارییان کرد و هەر یەکەیان چواری بردەوە. خوشکە گچکەکەی کە سەری لە گەمەکە دەرنەدەکرد، پشتی بە پشتییەکەوە دابوو و وەک ئەوان پیّدەکەنی. ئەو دوانیوەڕۆیەیان، وەک سەردەمی پیّشوو، بە خۆشی و پیّکەنین گوزەراند .

وێنەکەی لە خەیالّی خۆی لابرد. بیرکردنەوەیەکی هەلّە بوو. گەلیّ جار بیرکردنەوەی هەلّە، ئاوها ئازاری دەدا. ئەگەر بیزانیبا چییە قەیدی نەبوو. زۆری شتەکان ڕوویان دابوو بەلاّم زۆریشیان ڕوویان نەدابوو. گەڕایەوە سەر شەترەنجەکە و سەربازە سپییەکەی هەلّگرتەوە. ڕێک ئەو کاتە دەنگێکی بلّند لە تەلەسکرینەکەوە هەلّسا. وینستۆن، وەک ئەوەی دەرزی بە جێیەکیدا چەقیبێ ڕاچەنی. دەنگی گڕی کەڕەناو دنیای کەڕ دەکرد. هەوالّی بەرەی شەڕ ئێستا گەیشتووە!. سەرکەوتن!. هەمیشە کەڕەناوی پێش دەنگوباس هەوالّی سەرکەوتنی بە دواوەیە. گشت بارەکە جموجولّی تێ کەوت. تەنانەت (بۆی)ەکانیش ڕاوێستان و گوێڕایەلّ بوون.

دەنگی کەڕەناو، هاتوهاوارێکی زۆری تێکەلاّو بوو. دەنگیکی بەرزی بە جۆش و خرۆش پەیدا بوو بەلاّم لە ناو هیتاف و قاوقیژدا بزر بووەوە. هەوالّ، وەک کاری جادوگەری بەمسەر و ئەو سەری شەقامەکاندا بلاّو بووەوە. وینستۆن توانی هەر هێندە لە تەلەسکرینەکە حالّی بێ کە هەموو شتێ لەگەلّ پێشبینیەکانی خودی خۆیدا، ڕێک هاتوونەتەوە. لەشکرێکی یەکجار مەزن، بە دزییەوە لە پشت دوژمنەوە کۆبۆتەوە و هێرشێکی کتوپڕی لە دواوە بردۆتە سەر. تیرە سپییەکە کلکی ڕەشەکەی بڕیوە. جاروبارێ، هێندێ وشەی بەر گوێ دەکەوتن کە پەیوەندییان بە سەرکەوتنەوە بوو: مناوەرەی بە پەلەی ستراتیژی - هەماهەنگی تەواو - دەستوەشاندنی گورچکبڕ - نیو ملیۆن دیل - نەهێشتنی یەکجارەکی ورە - دەست بە سەرداگرتنی گشت ئەفریقیا - نزیکبوونەوەی کۆتایی جەنگ - سەرکەوتن - مەزنترین سرکەوتن لە مێژوودا - سەرکەوتن! سەرکەوتن! سەرکەوتن!.

لاقی وینستۆن لە ژێر مێزەکەوە وەک لاقی ئیفلیج دەبزوان. لە جێی خۆی هەلّنەسابوو بەلاّم بە خەیالّ لەگەلّ حەشاماتەکەدا چووبوە دەرێ و هاواری شادمانیی دنیای کەڕ دەکرد.



سەری هەلّبڕی و سەیری ڕێبەری گەورەی کرد. دێوێ بوو و چاودێریی دنیای دەکرد! تاوێرێ بوو و لەشکری ئاسیا بێهوودە خۆی پێدا دەدا!. بیری کەوتەوە کە چۆن بەر لە دە دەقیقە- بەلّێ دە دەقیقە - دوو دلّ بوو لەوەی کە هەوالّی بەرەی شەڕ سەرکەوتن بێ یا تێکشکان، ئێستاش جۆرە گومانێکی لە دلّدا هەبوو. ئای. لە لەشکری ئەوروئاسیا خراپتر تێکشکابوو!. لەو ڕۆژەوە کە بردبوویانە وەزارەتی ئەوین، زۆر شتی گۆڕابوو. بەلاّم تا ئەو ساتە، چارەسەری یەکجارەکی و بنەبڕی نەکرابوو.

دەنگەکە لە تەلەسکرینەکەوە هەوالّی دیل و دەسکەوت و کوشتاری هەلّدەڕشت، بەلاّم هاتوهاوار هێندێکی لێ کپ دەکردن. بۆیەکان گەڕانەوە سەر کاری خۆیان . یەکێکیان، بە شووشە (جن)ێکەوە بەرەو لای وینستۆن هات. ئەویش کە لە بەهەشتی شادمانیدا دانیشتبوو، ئاگای لە پڕکردنی پەرداخەکەی نەبوو. چی دی ڕاینەدەکرد و نەیدەشیڕاند. گەڕابۆوە وەزارەتی ئەوین. هەموو شتێکی لەبیر کرد و ڕوحی وەک بەفری سپی لێ هاتبوو. لە دادگای ئاشکرادا دانیشتبوو و دانی بە هەموو شتێکدا دەنا و هەموو کەسێکی لەگەلّ خۆیدا پێوە دەگلاند. لە خەیالّیدا، بە بەر هەتاودا و بە ڕێڕەوێکی کاشیرێژکراوی سپی درەوشەداردا دەڕۆیشت و دوو گاردی چەکداری بە دواوە بوون. فیشەکێ، کە دەمێ بوو چاوەڕوانی بوو، خۆی بە ناو مۆخەسەریدا کرد. چاوی بڕیبە سیما دێوئاساکە. چل سالّی خایاند تا تێگەیشت چ بزەیەک لە ژێر ئەو سمێلّە ڕەشەدا شاردراوەتەوە. ئای لەو دلّپیسییە و ئای لەو ستەمکارییە ناپێویستە!. هەی ملهوڕی لە دەست خۆشەویستی سەرهەلّگرتوو!.

دوو دلّۆپ ئەشک کە تێکەلاّوی بۆنی جن بوون، بە گۆنایدا هاتنە خوارێ. بەلاّم هەموو شتێ لە جێی خۆیدا بوو. ململانێ کۆتایی هات. بە سەر خۆیدا سەرکەوت. ڕێبەری گەورەی خۆشویست.

تەواو

مامۆستا عەباس عەبدوللّلا یوسف، سەرنجی زمانەوانی جوانی هەبوو و زۆر هەلّەی چاپی لەم ڕۆمانەدا دەستنیشان کرد. سوپاسی دەکەم و لە وێنەی زۆر بێت.            وەرگێڕ